PDF 4 KURD

# دیوانی

# شێرکۆ بێکەس

PDF 4 KURD

# پێشەکی و لێکۆڵینەوە

د. ئیحسان فوئاد

پاش بڵاوکردنەوەی دوو کۆمەڵە هۆنراوە "تریفەی هەڵبەست"و "کەژاوەی گریان " لاوی شاعیر (شێرکۆ بێکەس)، لە ڕەوی پێگەیشتنی بەهرەی هەڵچوویا،دەستی بردووە بۆ کارێکی گەلێك گرنگ کە نوسینی ئەم داستانە هۆنراوەییە "کاوەی ئاسنگەر". ئەڵێم گرنگ، چونکە وەك ئاشکرایە نووسینی بەرهەمی شانۆیی نیشانەی چەشنە پێشکەوتنێکە لە ئەدەبی هەر نەتەوەیەکدا، کە لەلای ئێمە هێشتا وەکوو زۆر کزە، لەلایەکی کەش، ئەم بەرهەمە بەتەنها چیرۆکێکی شانۆیی نییە، بەڵکوو داستانێکی مێژوویی یە کە بەستراوە بەسەردەمێکی دێرینی نەتەوەکەمانەوە لەهەلۆیستێکی تایبەتیدا، کە تا ئەمڕۆ لە خوێن و هەستی نەتەوایەتیمانا هەر لە قولپدان و خورپە و بزووتنەوە و ژیانەوەدایە، جگە لەوەی کە ئەم بەسەرهاتە ئەفسانناوییە میللییە لەقاڵبی هۆنراوەدا داڕێژراوە، ئەمانە هەمووی چەشنە نرخێك و بەهایەکی تایبەتی ئەدەن بەم بەرهەمە.

وەکو لە گەلێ شوێنی ئەم بەرهەمەدا دەر ئەکەوێت، لاوی شاعیر ویستوێتی هەروا لەخۆیەوە دەست نەداتە ئەم کارە گرنگە، بەڵکوو چەشنە ڕەنج و ماندووبونێکی لە پێناودا بدات، کە مایەی ڕەزامەندی بێت لای ئەدەبپەروەرانی وڵاتەکەمان، جارێ هەر لەسەرەتای کارەکەوە دەرئەکەوێ لە هەڵبژاردنی ناوەکانا، رووی کردۆتە مێژووی دێرینی رۆژهەلات و لەو سەرچاوانەوە هەلی هێنجاون کە پەیوەندییان بەم مێژووە کۆنەی ڕۆژهەلاتەوە هەیە، لەوانەیە ئەم ناوانە لە سەرەتادا سەرنج ڕانەکێشن، بەلام لە دەنگ و ئاواز و کارکردنیانا "لەگوێی خوێندەوارانا" بەتایبەتی لە لای ئەوانەی لەمێژووی کۆن شارەزان، مۆرکی شارستانیەتی "2000" ساڵ لەمەوبەری پێوە دیارە، ئەدیب و نووسەرەکانی جیهان، کەدێنە سەر بەسەرهات و چیرۆکی کۆن، تێکڕا دوو ڕێگا ئەگرن: یان ئەیانەوێت کوت و مت بچنە ناو ئەو کۆنەوە و گیانیانی تیایا بتوێنەوە بۆ ئەوەی نەخشەیەکی وردی ڕابردوو لە چیرۆکا بخەنە بەر چاو. وەك یادکردنەوەیەك بیرێکی ئەوسامان بخەنەوە، لەمانە بۆ نمونە چیرۆکەکانی

PDF 4 KURD

چیرۆکنووسی سکۆتلەندی والتەر سکۆت "1771-1832"ی بە ناو بانگ، یا وەکوو هەوێنی باسەکە وەرئەگرن و لە باری سەرنجی ئەو سەردەمەی ژیانیانەوە شتێکی تایبەتی لێ دروست ئەکەن کە نە بە تەواوی کۆنە و نە تازە بەڵکوو تێکەڵاوێکی فەلسەفیە لە ناوەرۆکێکی وا نوێدا کە لەوانەیە بیری ئەمرۆشت بخاتەوە بەرچاو، وەکوو پیەسەکانی "جۆرج برناردشۆ" بۆ نموونە لەم چەشنە بەرهەمانەدا نیازی نووسەر یا هونەر زیاتر دەرخستنی فەلسەفەی تایبەتی خۆیەتی دەربارەی ژیان و ڕووداوەکانی ئەو چەرخەی تیادا ئەژی و ئەو باسە مێژووییەی باسی ئەکات تەنها ئەبێت بە هەوێنێك بۆ بەرهەمەکەی. داستانەکەی "شێرکۆ " لەم بابەتەیە.

نووسینی بەرهەمی شانۆیی یا " دراما" ئەگەر چی لە ئەدەبی نەتەوایەتیمانا تەمەنی لە "20-30"ساڵێك تێپەڕ ناکات، بەلاّم لە ئەدەبی جیهانییا لە "2500"ساڵ زیاترە، و لە سەردەمێکی دێرینەوە شوێنی بایەخ پێدان و لێکۆڵینەوەیە، " ئەرستۆ" بە لایەوە چیرۆکی شانۆیی بەتایبەتی "کارەسات "[1] لەمێژوو نووسینەوە لایەنی هونەر و فەلسەفەی تیادا زۆرترە، چونکە باسی بە سەرهاتێ ناکات وەك چۆن ڕووی داوە، بەڵکوو لە وێنەیەکی نمونەییدا "مثالی"داوە لەبەرگێکی نیگارکێشیدا ئەیخاتە بەر چاو، خۆ کە بێینە سەر جۆرەکانی هۆنراوە[2] دراما و هونەری دراما لەسەروو هەموویانەوەیە، چونکە دانەرەکەی باسی خۆی ناکات بەڵکوو لەسەر زمانی پاڵەوانە جیاوازەکانی بەرهەمەکەیەوە دێتە ناوەوە، بۆ ئەوەش پێویستە زۆر وورد و زۆر بەتوانا بێت لە تێگەیشتنی کەسانی بەرهەمەکەی و ئەو هەڵوێستانەی تیایا ئەجووڵێنەوە بچێتە ناخیانەوە و بگرە بتوێتەوە لەناویانا! ئەمە پاڵی بەهەندێك ڕەخنەگری جیهانەوە ناوە کە دراما لایان پێوانە بێت بۆ پێوانی بەهرەی نووسەران و شاعیران و بایەخ نادەن بەجۆرەکانی تری هۆنراوە، وەك هۆنراوەی "لیریك" بۆ نموونە ــ لەگەڵ ئەوەش کە"لیریك" ویژدانی سەرچاوەیەکی زۆر دەوڵەمەندە ــ بەلای ئەمانەوە دراما لووتکەی هونەرە، کە لەبەردەمیا جۆرەکانی تری هۆنراوە کز ئەنوێنێ[3].

لەدرامادا ـ شانۆ وەك ئاشکرایە ــ دەورێکی سەرەکی هەیە، چونکە ڕاستی بە توند و تۆڵی بەستراوە بە بەرهەمەکەوە و نووسەر ئەبێت حسابی خۆی بۆ بکات. هەروەها ئەبێت حسابێکی زۆر باشیش بۆ تەماشاکەران بکات، رستەکانی وا بێت کەهەستیان بەتەواوی بجوڵێنێ. چیرۆکەکەی وا دابرێژرێت کەبۆشایی و کەلەبەری تیادا نەبێت و یەکێتی ڕووداوەکانی سفت و ڕێك لەتەك یەکدا ڕیز بکات، بۆ ئەوانەی تەماشای بەرهەمەکەی ئەکەن هەمیشە لەهەڵچوون و ورووژاندنا بن و وا سەیری بەرهەمەکە بکەن کە ڕاستییەکە لەپێش چاویانا دووبارە ئەبێتەوە، نەك چیرۆکێکی

PDF 4 KURD

دروست کراوە و بۆ وەخت بردنە سەر نووسراوەتەوە. جارێ بەر لەهەموو شتێك با لەگەڵ خوێنەدەوارانا، سەرنجێ بدەینە وشەکان و چۆنیەتی بەکارهێنانی چونکە بەرهەمەکە لە چوارچێوەی هۆنراوەدا دانراوە، لە هۆنراوەشدا ئەم لایەنە لە هەموو لایەنێکی تر گرنگترە، بەلای منەوە، تێکڕا وشەکان بەهێز و بە پێزن، جم و جۆڵ و ورشە و پرشەی شیعریان تیا ئەدرەوشێتەوە، گەرمی ڕاز و گفتوگۆی ژیانیان کراوەتە بەر!، بەهێزترین ڕەوشتی دراما هەڵچوون و وروژان و وەرچەرخاندن و گۆڕینی کردەوەکانە لەلایەکی ترەوە بۆ لایەکی تر، ئەمەش نابێت ئەگەر وشەکان گیانی ئەم لایەنەیان نەکرێت بەبەرا، ئەم دێڕانەی خوارەوە کەم و زۆر بەو شێوەیەی باسمان کرد داڕێژراون:

قسەی مێشکم بۆ کەسێکە
بتی بێ گیان ورد و خاش کا!
سەری تەفرە بپەڕێنێ
چۆك بەژێر دەستیی دابدا
پشتی قەدەر بنەوێنێ
ئەگەر ئاسمان
ئەگەر زەوی
ئەگەر دەریا
بەربەستی بن، ئەو کۆڵ نەدا:

ئەم داڕشتنە بەهێزە بە تایبەتی لە گفتوگۆی کاوەدا، کە لە گەڵ شوێنی بەرهەمەکەدا زۆر بەئاشکرا دیارە، بۆ نموونە لە وەرامدانەوەی بۆ "کاروون و کاردۆخ و مادیا" کە ئەیانەوێت لەقسەهاندەرەکانی کاوە تێبگەن، بزانن مەبەستی چییە؟ــ لە هەڵوێستی گوێزانەوەدا لەبیر کردنەوە بۆ ئیش کردن، لە گوومانەوە بۆ بڕوا:

**کاردۆخ:** پشتمان کێیە؟
**مادیا:** چیمان پێیە؟
**کاردا:** قۆناغ کوێیە؟
هەموو ڕۆژێ من ئاسنی،
ڕەق و پتەو ئەشکێنمەوە
ئەیکەم بە ئاو ئەیتوێنمەوە...

PDF 4 KURD

ڕووئەکاتە کاردا و میدیا:

ئێوەش جەرگی عەرد هەڵ ئەدڕن

تاشە بەردی ئەم کێوانە...

بەشانی ڕەنج ئەگوێزنەوە...هتد

تا لە پاشانا ئەڵێت:

ئیتر ئێمە چۆن ناتوانین

تەختی زۆردار سەرنگون کەین

ئێمە وا بین

چۆن ناتوانین،

دیلیی و ژێر دەستی زەبوون کەین!

ئەم رستانە کە بەرگی گەشی درامای پێوەدیارە، لە قسەی هاوڕێکانی کاوەشدا دەرئەکەوێت، کاتێ بڕوای تەواوی پێئەهێنن. هەروەها لەگفت و گۆی ئەژدەهاکیشا کە ڕق و کینەی خۆی دەرئەبڕێ، یا کە لە تەنگانەدایە یا کەئەترسێ بۆ نموونە لە گفت و گۆیا لەگەڵ تارمایی مردنا:

ئەوە تاجم ئەوە تەختم

ئەوە خەزنەی زێڕ و بەختم

هەمووی بۆ تۆ تەنها نەمرم...

خۆ بەتایبەتی لە کاتی ڕق و کینەیا، گفت و گۆکانی ئەژدەهاك لەگەڵ بەردەستەکانیدا، ڕوون کردنەوەی ئەو بارە نەفسییەیە کە پێدا ئەڕوات:

کۆیلە دیلە.. کۆیلە بەندە..

کۆیلە تاکوو مردن عەبدە!

مادام وایە.. پێیان بڵێ..

تا لافاوی خوێن هەڵ ئەسێ

هەتا بەکۆمەڵ غەرق ئەبن

با بکوژن.. هەر بکوژن

دەست نەپارێز.. دەست هەڵ نەگرن

وەك دروێنە.. درووێنەکەن!

ئەوسا ئیتر.. ڕامەوەستن

PDF 4 KURD

بیكەنەوە دەرگای ئاسن

با شێری برسی دەرپەڕن

شالاّو بەرن.. لەش ئەنجن كەن

ئێسك و پروسك.. تێك بشكێنن

دوایی بەم ژاوەیە بێنن!

ئەم ڕقە هێندە بێ سنوورە، كە ئەژدەهاكی وا لێ كردووە لەگەڵ شێرە برسییەكانیشدا بكەوێتە قسەكردن و بە گەرمی هانیان بدا بۆ تێكشكاندنی شۆڕشگێڕەكان:

ئادەی! ئادەی با شالاّوی

چنگی ڕقتان پڕ ئازار بێ

ئادەی! ئادەی با خوێناوی

كۆیلە و عەبد.. بە ڕووبار بێ

ئادەی.. ئادەی با كەڵبەتان

كەڵبەی ناو دەمی برسیتان

كەڵبەی لە ئەڵماس تیژترتان

ئێسك و پروسك وەك خۆڵ وردكا!

لە كاتی تووڕە بوونیدا هێندەی ڕستەی ئەژدەهاك گەلێ درامی و شاعیرانەیە، وەك ئەم نموونەیە:

وەك ژن خزاونەتە پاڵ من

شایستەن بۆ ئەتك كردن

ئەتانەوێ.. بەقسەی زل

ترسنۆكیی ئارایشت كەن!

ئەم بەهێزی دراما پۆشییە لەو كاتانەشدا دەرئەكەوێت كە ئەژدەهاك هەست بەوە ئەكات كە لە مەترسییەكی گەورەدایە و هەموو دەسەلاّتی لە ئاوابوونایە و بەتەنها ڕووبەڕووی چارەنووسی ترسناكی مەرگ وەستاوە:

كوا دڵۆپێ.. فرمێسك ڕشتن

كوا ئاخێكی گەرم.. ناشتن

كوا بەزەیی سەر ڕوخسارێ

كوا تكایە؟.. كوا هاوارێ؟

PDF 4 KURD

کوانێ ئەو دەستانەی.. ئەڵێن

بۆ تەنگانە درێژ ئەکرێن..!

لە دووا تابلۆی داستانەکەدا، کاتێ کاوە پاش شکاندنی سوپای زۆرداریی بە ناو گۆمی خوێناودا ئەکا بەژوورا و هەڵمەت ئەباتە سەری، فەرمایشتەکەی ئەژدەهاکی بەتەنها ماوەی شڵەژاوی دڵ پڕ لە ترس و قیین. بۆ کوشتنی کاوە بەراستی وەستایانە داڕێژراوە، ئەوەندەی هەموو قیین و ترس و پەژارەی ئەژدەهاك بەهێزە.

**کاوە:** زاڵم وا شەو باری نەویی

وا ڕووناکی دنیای پڕ کرد

وا کاروانی ئازادی کورد

بە بەهاری هیوا گەیی..

زاڵم تۆ بۆ کوێ دەر ئەچی؟

**ئەژدەهاك:** " ڕوو ئەکاتە هەردوو پاسەوانەکە "

ئەنجن! ئەنجن! لەتلەتی کەن

وەك سەگی خوێڕی پەتی کەن!

لە چیرۆکی شانۆییدا، جگە لەو هێز و وردی و سۆزە گەرمەی کە بەتایبەتی لە کاتی گۆڕین و وەرچەرخانی کردارەکانا لە بارێکەوە بۆ بارێکی تر پێویستە ـــ وەك لە بەشێ لەو نموونانەی لەمەوبەر خستمانە ڕوو دەرکەوت ـ جگە لەمە یەکیەتی ڕووداو ڕەوشتێکی گرنگی ترە، یەکێتی ڕووداو چییە؟ دانانی مەبەستێکی ئاشکرا و ڕوونە کە ئەبێت هەموو تابلۆ و پەردەکانی داستانەکە بە دەوریا بسوورێتەوە، واتە نابێت لادانێکی وای تێدا بێت بەرەو باسێکی وا کە تەماشاکەران دوور بخاتەوە لەم مەبەستە گشتییە و سۆزی گەرم و گوڕی و هەڵچوونی کردارەکانیان بڕەوێنێتەوە، ئەبێت هەر هەڵوێست و هەر تابلۆ و هەر بەشێکی تابلۆ و سفت و ڕێك و پێك و گونجاو بن، وە هەموویان بەشێکی تەواوکەر بن بۆ ڕونکردنەوەی زیاتر بۆ کرداری سەرەکی یا مەبەستە سەرەکییەکەی نووسەر لەو بەرهەمەدا، ئەم لایەنە بێ پێگەیشتنێکی تەواوی باسەکە لە مێشکی نووسەرەکەدا، بێ عارەق ڕشتن و ڕەنج دان و ئازار چێشتن "معاناە" لە گەڵیا ـ بەتەواوی نایەتە دی، لە هونەری ئەدەبدا، بەم ڕەوشتە ئەتوانین بڵێین چڕیوپڕی هەڵوێستەکان ـــ کورتی و وردی لە شیکردنەوە و ڕونکردنەوەیانا. بەرهەمەکەی " شێرکۆ بێکەس" لەم داڕشتنەدا گەلێ مەرجی یەکێتی کرداری تیادایە، تابلۆی یەکەم پێشکەش کردنێکی سەرنج ڕاکێشی سەرتاپای داستانەکەیە کە ناشتنی قوربانیەکانی

ئەژدەهاکە، تابلۆی دووهەم دەرخستنی قووڵی... تابلۆی سێهەم پێچەوانە یان ناکۆکە ــ بۆ دەرخستنی بێ هەستی و دڕندەیی و بێ فڕی زۆرداری ـ شایی و هەڵپەڕکێ لەسەر مێشکی پژاو و خوێنی ڕژاوی لاوانی وڵات، ئەم سێ تابلۆیە ئەتوانین دابنێین بە پێشەکییەك ــ واتە دەست پێشخەرییە بۆ دەرکەوتنی کاوە، تابلۆی چوارەم: سەرەتای هەڵچوون و پێگەیشتنی کردارەکانە: دەرکەوتنی کاوەیە، پاڵەوانی سەرەکی داستانەکە ــ هاتنە پێشەوەی کاوە لە کۆتایی ئەم تابلۆیەدا، قسەکانی بەرگی تەواوی بەسۆز و چڕی و هەڵچوونی درامای تیادا ڕەنگ ئەداتەوە، برووسکەی ئیمانی تیا شەوق ئەداتەوە:

**کاوە:** بەڵێن بێ... بتی ئەفسانەی
دیلی و ریسوایی بشکێنم
تەخت و تاراجی ژێر دەستی
لە بنەوە هەڵ تەکێنم
قەڵا و زیندانی ئەژدەهاك
بڕوخێنم...
بەڵێن بێ... کۆشکی تاوانی
لەگەڵ خۆیدا بسووتێنم
سەری ئەم تاریکە شەوە بنەوێنم... هتد

بێ ئەم بڕوا و بێ ئەم هێز و گەرمییە، بەم ڕستانە نە ئەوترا ڕستەی هاتنە پێشەوەی کاوە. تابلۆی پێنجەم: دەرخستنی دەروونی ئەژدەهاکە و خۆ بایی بوونی و مەترسیەتی لە ئەنجام: مردن... ئەم تابلۆیە: کە ئەکەوێتە ناوەڕاستی چیرۆکەکەوە ئاسۆیەکی زۆر فراوانی هەیە ـ بەتەنها سەیرکەر لە ئەژدەهاك و گفت و گۆی لەگەڵ تارمایی مردنا دەرناخات، بەڵکوو بەشێوەیەکی ناڕاستەوخۆ سەرنج و بیرکردنەوەی سەیرکەر گەلێ دوورتر لەگەڵ خۆیدا ئەبات، لە تابلۆی شەشەمەوە وەرچەرخانە بەرەو سەر ئەنجام و گۆڕینی کردارەکان، ئیتر بەخێرایی ئەڕۆن بەرەو هەڵچوون و تەواو بوون ــ یەکێتی ڕووداوــ لە ناوەڕاستی هەموو هەڵچوون و وروژاندنی بەسەرهاتەکانایە، کە ئامادە کردنی شۆڕشە و هەڵمەت بردنە بۆ سەر ئەژدەهاك، لە تابلۆی حەوتەما: کە ئەژدەهاك باسی خەوە سامناکەکەی خۆی ئەگێڕێتەوە بۆ جادووگەرەکەی... ئەتوانین بڵێین لە چوارچێوەیەکی درامی و نەفسی بەهێزدا سەرەتای کۆتایی دەستنیشان کراوە، دروستکردنی "چەکووشی هێز و بڕوا" لە تابلۆی هەشتەمە کە

PDF 4 KURD

چەکی ڕزگاری و دروشمی شۆڕشە، هەڵوێستێکە کە شایانی بایەخ پێدان و سەرنج ڕاکێشانە؛ بۆیە وشەکانی کاوە کە گەرمی و سۆزی لێ ئەڕژێ لە جێگای خۆیدایە:

ئەی چەکووشی هێز و بڕوا
نیشانەی ڕەنج و توانا
دۆستت زۆرە
جێگەت سەر گلێنەی چاوە
بەڵام هێشتا
تینوێتی زاخاوی دوایی...
ئەبێ هەر بەخوێن بشکێنی
خوێنی ناپاك...
خوێنی تاوانی ئەژدەهاك... (ت. حەوتەم)

کۆتایی تابلۆی هەشتەم، واتە پێش ئەوەی دوا تابلۆی داستانەکە دەس پێ بکات، پێش هەڵسان و شۆڕش و خوێن ڕشتن: بڕوا بەهێزی هەق و سوور بوون لە سەری، لەلایەن کاوە و هاوبیرەکانیەوە لە بەرزترین سۆز و گەرمترین سروودا بەرز ئەبێتەوە:

سوێندە، سوێندی کوردپەرستی
سوێندی سەر شۆڕی نەویستی
سوێندی بڕوا و خۆشەویستی
سوێندی لە خۆ داماڵیینی،
بەرگی نۆکەری و ژێر دەستی
سوێندە... سوێندی کورد پەرستی
سوێندە... بۆ خۆری سەربەستی
سوێندە... ئەیلێینەوە
سوێندە... کە ناگەڕێینەوە...
سوێندە بەو خوێنانەی ڕژان...
بوون بەچراوگی ڕێی ژیان
سوێندە بەو سکانەی سووتان
سوێندە بە فرمێسکی دایکان...
سوێندە بەو زەردەخەنانەی،

لەسەر لێوی کۆرپە کوژران

سوێندە هەموو ئەیلێینەوە

سوێندە کە نا گەڕێینەوە... هتد

ئـەتوانرێ لـەو دێڕانـەی کـاوە بـۆ چەکوشـەکەی ئـەیڵێ لـەم سـرووده گەرمـە، دوو پارچـە گۆرانیی پڕ لە سۆز و گەرمییان لێ دروووست بکـرێ، بەرهەمەکـەی پـێ ڕەنگـاوڕەنگ بکـرێ، بـۆ ئەوەی سەرنـج ڕاکێشێت و بخرێتە بەر چاو. " شێرکۆ " ئەوەشی بیر نەچووە کە لـە کارەکەیا وەك بەرهەمێکی شانۆیی " دراما" شانۆ دەورێکی مـەزن ئـەگێڕێ، چونکە تاکـە شوێنی جـێ بەجێ کردنی کردارەکانە، نووسەری ئەم جۆرە بەرهەمانـە پێویـستە بـزانن چـۆن ئـەم شـوێنە بچکۆلانەیە واتە شانۆ، کە لـە چـەند مـەترێك تێپـەڕ ناکـات بـەکار بهێنێـت بـۆ بـەهێز کردنـی بەسەرهاتەکانی بەرهەمەکەی ـ و بۆ ئەوەی مـاوە بـدات کـە خـەیاڵی تەماشـاکەران بجوڵێنن و بیانخاتـە جیهـانی تایبـەتی چیرۆکەکەیەوە، ئەمـەش لام وایـە بەهرەیـەکی نوانـدنی "تمثیلـی" ئەوێت چونکە ماوە کورتە، دیمەنـەکان بـە پەنجـەی دەسـت ئـەژمێررێن، هـەتا ڕسـتەکان پـڕ و کورت و کاریگەر بن و ئەوەندەی بەناڕاستەوخۆ بە سەلماندن شت بخرێتـە بـەر چـاو، ئەوەنـدە نووسەرەکە سەرکەوتووتر ئەبێت، لەو هونەرە شانۆییانەی لەم داسـتانەدا " شـێرکۆ " بـەکاری هێنـاوە، تـابلۆی بـێ دەنگـە، ئەمـەیان جگـە لـەوەی کـە هەمـەڕەنگی و چەشـنە گـۆڕین و سەرنجڕاکێشانێك ئەدات بە کارەکە، وەختیش کورتر ئەکاتـەوە، بـۆ نموونـە لـە کۆتـایی تـابلۆی هەشتەما لەباتی ئەوەی بێت گفت و گۆ کردن و چۆنیتی پلانی ڕاپەڕین دابنێت، بە بزوتنـەوە و نزیـك بوونـەوە لـە یـەك و ئیـشارەت کردنـی بـێ دەنـگ، وێنـەی دوا خـۆ ئامادەکردنیـان بـۆ ڕاپەڕین ئەخاتە بەر چاو. لەم تابلۆ بێ دەنگانەدا بەتایبەتی تابلۆی درووست کردنی چەکوشی ئـازادی و ڕاپــەڕین، بایــەخێکی شــانۆگەری تایبــەتی هەیــە چەشــنە هێــز و گوڕێــك ئــەدا بەداسـتانەکە. ئەمـە ئاوڕدانەوەیـەکی هونـەری جوانـە و توانـای نوسـەرەکەیمان بـۆ دەرئـەخات لەهونەری شانۆدا، کە زیاتر بەسەلماندن و جووڵانەوە و بزووتنـەوەی ئیحائی کردارەکان ڕوون ئەکاتـەوە، بـێ گومـان ئـەم گۆڕینـە لەنیـشاندانی هەنـدێ دیمەنـدا بەشـێوەیەکی بـێ دەنـگ داستانەکە لای تەماشاکەران زیاتر سەرنج ڕاکێش ئەکات.

ئاوڕدانەوەیـەکی هونـەریی تـر، هـەوڵ و کنـەی بەشـدار بـوونی جـەمهووری تەماشـاکەرانە لەهێندێ دیمەنی بەرهەمەکەدا، بۆنموونە لەکۆتایی تابلۆی شەشەمدا، کاوەی جەرگ هەڵقرچاو بە کوشتنی حەوت ڕۆڵەی جگەر گۆشەی خۆی، بەم جۆرە دێتە پێشەوە:

**کاوە:** ئەمە حەوت کوڕ

PDF 4 KURD

حەوت کارەساتی جەرگ بڕ
ئەمە حەوت کوڕ
ئارام ئیتر
چۆن ئەتوانێ..لەمە زیاتر
خۆی ڕابگرێ
تۆڵە..دان بەخۆیدا بگرێ
لەمەزیاتر چۆن ئەتوانێ..
ـ پشوبەك ـ

لەپاش..دوا کوڕ
لە پاش گوردۆ
چیم ما ئیتر، "روو ئەکاتە دانیشتوان "
ئێوە بڵێن..چیم ما.. ئیتر!

ئەم ڕووکردنە لە جمهووری تەماشاکەران، چەشنە هانگاوێکی تازە کردنەوەیە لە شانۆی کوردیدا و ئەبێتە هۆی ئەوەی کە سەیر کەر زیاتر چێژ لە بەرهەمەکە وەرگرێ و زیاتر خەیاڵی ڕائەکێشێ بۆ لای خۆی. کاك شێرکۆ چیرۆکە شانۆییەکەی لە هەمان کاتیشا بە داستان ناو ئەبات، داستان ــ لە ئەدەبی جیهانیا چیرۆکێکی هۆنراوەی دوور و درێژە کە باسی شەڕوشۆڕێکی گەورە و قارەمانییەتەکەی لە ئەندازە بەدەر ئەکات و تێکەڵە بە ئەفسانە، بە زۆریی باسی ڕووداوێك ئەکات کە بەستراوە بە خەبات لە پێناوی پاراستنی سەربەستی و شەرەفی نەتەوایەتی میللەتێکەوە و ئامانجە پیرۆزەکانی لە سەدەیەکا و ئەو قەبارە و ڕەوشت و خووەی بوویەتی و خەباتی خوێناوی لە پێناوی مانەوە و پاراستنیا. داستان بەتایبەتی لە وەختێکی دێرین ئەدوێ و هەوێنی باسەکانی ئەگەڕێتەوە بۆ بەربەیانی مێژووی میللەتان " وەك ئەلیازە و ئۆدیسای هۆمیرۆس و شانامەی فیردۆسی ". بەهۆی ئەوەی بەستراوە بەم مێژوە دێرینە ئادەمیزادەوە، ئەو قارەمانێتییەی لە داستانا هەیە تا ڕادەیەکی زۆر بەستراوە بە ئەفسانە و خوا و فریشتانەوە کە دەستیان لە دەستی ئادەمیزادایە لەم قارەمانێتییە ڕادە بەدەرەی کە ئەینوێنێ. لە بەرهەمەکەی "شێرکۆ " دا ئەم لایەنە فەراموش نەکراوە، لە سێ

PDF 4 KURD

پەردەی یەکەمدا، هێزی فریشتەکان ئەو قیبلەیەیە کە ئـازار دراوەکـانی ئـەژدەهاکی خوێنرێـژ پەنای بۆ ئەبەن و لێیان ئەپاڕێنەوە و داوای یارمەتیان لێ ئەکات:

**زێمری:** ئارامی گشت فریشتەکان...
تووڵ ئەکێشی... خوا هەر وایە
تۆڵەی درەنگ ئەکاتەوە... یا:
ئەی " ئەنانای " ئەستێرە و مانگ
ئەی خواوەندی هەموو ئاسمان
کوا مژدە و بانگ
وەرە خوارێ...
لە نزیکەوە...ببینە..
لەم خاکە...چۆن خوێن ئەبارێ
خۆت ببینە کە ئەهرەمەن
چۆن لە دۆڵی کینە و ڕقا
دڵ ئەهاڕێ...گوڵ ئەهاڕێ

تا لە کاتی نائومێدی و ڕەش بینیشدا خوا و فریشتەکان هەر ناو ئەبرێن و سکالآیان بۆ ئەکرێ:

**زاماوە:** بڕوام... بە ئاسمان نەماوە
بڕوام... بە " سمکان " نەماوە
لە کوێن؟ لە کوێن؟

ئەمانە تا تابلۆی چوارەم، کە وەك دەست پێشەکییەکە بۆ چیرۆکەکە لە قسەکانی زێمـری و زاماوا، لە گفت و گۆی کاسە سەرەکانا، لە قسەی مادیای جوتیار و کاروونا " شوانی ئاژەڵەکان " لـە قـسەکانی کـاردای جوتیـارا، هـەمووی دووبـارە ئەبنـەوە، ئەوەنـدە هەیـە کـە هێـزی خـوا و فریشتەکان و تێکڕا بەرگی ئەفسانـاوی خراوەتە پلانی پـشتەوە لـەم بەرهەمـەدا و بەشـدارییان تەنها لە دەرخستنی هەندێ بیر و بـڕوا دایـە ئـەویش لـە دوورەوە، بـێ ئـەوەی بـەرگی ڕاسـتی جووڵانەوە بگرنە خۆ، وەك لە داسـتانا بـاوە، ئەمـە لـە لایـەك، لـە لایـەکی کـە، لـە دەرکـەوتنی کاوەوە ئەم لایەنە ـ واتا بەشداریی خوا و فریشتەکان ـ بەرەو کزی ئەڕوات و دراما پۆشـی زاڵ ئەبێت و بەرگی داستانی ئەکرێت بە قوربانی چونکە لێرەوە بەولاوە، ئیتر هێز و بڕوا و کـاری کاوە جێگای فریشتەکان ئەگرێتەوە، بۆ؟ چونکە بڕوای نییە بەم فریشتانە:

PDF 4 KURD

**کاوە:** چاك بزانن.. قەت یەك نابێ
قەت یەك ناگرێ
خوای من و تۆ...
هینی زۆردار
فریشتەیەك کە ئەژدەهاك بیپەرستێ
ئەینێمە خاك... ت. سێهەم

کەواتە هێزی کاوە لە نـاو دڵی خۆیدایـە، لـە بـڕوای خۆیدایـە، بۆیـە وا بـە تونـدی هێـرش ئەبات و ئەیەوێت لە هاوڕێکانی بگەیێنێ.. کـە دادیـان نـادەن! ئەمـە خـۆی یەکێکـە لـە لایەنـە داهێنەرەکانی ئەم هونەرەی شێرکۆ، داستان + دراما.

**کاردۆخ:** .... لە زەنگ ئەدەین
ئەبین بە با و تۆف و باران
بە بروسکە، بەچەخماخەی
تیژی ئاسمان
بۆ داگیرکەر ئەبین بە ژان
ژانی مردن
ژانی تەفر و توونا کردن ت. شەشەم

**کاوە:** ئەم تۆفانەی کە هەستاوە
چی خۆی لەبەر دەما ئەگرێ
ئەم لێشاوە
کام تاریکی... ڕاناماڵێ
ئەم تۆفانە... مردن لووشە
چ زۆرداری هەڵ نالوشێ
ئەم.. لافاوە..ترسناکە
چۆن قەڵای ڕەش داناپۆشێ ت. هەشتەم

لەم قسانە بەکارهێنانی هێزی سرووشت لەم زمانە خواستەمەنیەدا "استعارة" تا ڕادەیـەك کەوتۆتـە بـەر شـەپۆلی داسـتانەوە، ئەگـەر چـی خـوا و فریـشتەکانیش فـەرامۆش کـراون و

PDF 4 KURD

خنکێنراون. له دوا تابلۆشدا دیسانەوە له قسەی پاسەوانەکانی ئەژدەهاکا بەرگی داستان بەدی ئەکرێت، که باسی هێز و هێرشی نەبەزانەی شۆڕشگێڕەکان ئەکەن:

گەورەکانم.. شتێك هەیە

تێی نەگەیشتووم ناوی چیە؟

جادووی گیانی نەهێنیە

یاخود چاوی تەلیسماوی

فریشتەکانی ئاسمانە

یان هێزی دەستی خواکانە

له ناو دەروونی ئەوانا...

دێت و ئەچێ

تینی ئاگریان ئەداتێ

ترسی مردنیان دەر ئەکا

شەڕیان له گەڵیا پێ ئەکا... ت. نۆهەم

له بەرهەمی شانۆییدا " دراما" جگە له مۆرکی هۆنراوەی ویژدانی " واتە لیریك یان گۆرانی " هونەری دارشتنی چیرۆکیش گەڵێ گرنگە واتە چۆن پێویستە ڕستەکان پڕ بن لە هەست و خەست دارێژرابن لە سۆزدا، لە هەمان کاتیشا پێویستە لایەنی هونەری لە چۆنیەتی خستنە بەرچاوی ڕووداوەکانا، یا لایەنی چیرۆکنووسی فەرامۆش نەکرێت، پێویستە زنجیرەی ڕووداوەکان بە "منطق"و شێوەیەك ئەقڵ بیگرێت و پەسەند بێ بەستراوێ بەیەکەوە و لە ناو گێژاوی ئەو ناکۆکییەدا کە هەوێنی بەرهەمەکەیە، ڕووداوەکان یەك بە دوای یەکا هووشیارانە ڕیز کرابن و لاوازی تێدا نەبینرێ وەك هەموو چیرۆکێکی سەرکەوتوو، لەم بەرهەمەدا دەست پێشەکییەکی وەستایانە دارێژراوە، کە وردە وردە تەماشاکەر ڕائەکێشێت بۆ ناو گەرمەی باسەکە و چەمکێکی بەسەرهاتەکەی ئەرژێنێتە ناو دەروونەوە، بۆ ئەوەی لە پاشاندا وەڵامی بداتەوە، پێشکەش کردنی کارەساتەکان کە دوانیان هی کوڕی کاوەیە،بە شێوەیەکی کاریگەر و زوڵم و زەبر و زەنگی ئەژدەهاکمان بۆ ڕوون ئەکاتەوە، وە لایەنی بەزەیی و هاوبەشی خەم و پەژارەمان تیا ئەجوڵێنێ:

حەوت برا بووین

پێکەوە زنجیر کرابووین

شەشمان بۆ مار بووین بە خۆراك

تا چاك بێتەوە ئەژدەهاك... تابلۆی یەکەم

PDF 4 KURD

هەروەها پێش دەرکەوتنی کاوەش، دەست پێشەکییەکی بەرە بەرەیی"تدریجی" کراوە بۆ دەرخستنی بێ کەڵکی فریشتە و خوایەکان لە گفت و گۆی زێمری و زاماوای گۆڕ هەڵکەندا، لە گفت و گۆی کاسە سەرەکانا هەست بە جۆرە بێزاری و گومانێك ئەکرێ کە لە پاشانا لە دەرکەوتنی کاوەوە پێ ئەگات:

**زاماوا:** بڕوام بە ئاسمان نەماوە

بڕوام بە " سمکان " نەماوە

لە کوێن؟... لە کوێن؟...هتد

وەرامی ئەم گومان و پرسیارە، لە دواییدا لە دەرکەوتنی کاوەوە پێ ئەگات، کاتێ کە دەسەڵاتی فریشتە و خوایەکان پووچ ئەکاتەوە:

فریشتەیەك کە ئەژدەهاك بیپەرستێ

ئەینێمە خاك... ت. سێهەم

وەختێکی باش هەڵبژێراوە بۆ دەرکەوتنی کاوە، کە بەتەواوەتی ڕەنگی درامای گرتۆتە خۆی، لە کاتێکا ئەم دەر ئەکەوێت کە وڵات برسی و خەڵك چەوساوە و بێزارە، دەشت و دەر وشکە و زەردە لەبەر بێ بارانی، بۆیە قسەکانی کاوە زوو جێ بۆ خۆی ئەکاتەوە لە دڵ و دەروونی میللەتا، لە مەنگی و بێ دەنگی کاوەدا، پێش ئەوەی بکەوێتە قسە کردن وردی و شارەزاییەك ئەبینرێ، چونکە خەم و پەژارەی ئەم دیمەنی بێ دەنگی کاوەیە دیمەنێکی پەسەند و واقیعیەچونکە وەك شکسپیر ئەڵێت: "خەمی گەورە... بێ دەنگە ". لە گوێزانەوەی گیانی یاخی بوون و ڕاپەڕین لە کاوەوە بۆ هاوڕێکانی ماوەیەکی باش دانراوە و ئەم لایەنگیریە هەروا وەکوو شتێکی ساکاری کوت و پڕ نەدراوە بەدەستەوە، چونکە ئەژدەهاکێ کە دەسەڵاتی تێکەڵ بە دەسەڵاتی ئەهرەمەن و فریشتە و خوای سەردەمەکەی بێت سام و شکۆی وا بە ئاسانی لە دڵی میللەتا لانابرێت، لە بەر ئەوە لە لایەن هونەری چیرۆکەوە ئەم تابلۆیانە زۆر پێویستن تا دێنە سەر بڕواکردن بە ڕێی کاوەوە یەکێکی وەك کاردۆخی ساکاری ئاشەوان ئەڵێت:

لە سەر لووتکەی بەرز... بانگ ئەدەین

گەل لە زۆردار ئەوروژێنین

لە زەنگ ئەدەین... تا

ئەبین بە با و تۆف و باران... ت. شەشەم

PDF 4 KURD

له بەرهەمەکەدا، گەلێ شوێنی کە هەیە مایەی شارەزا بوون و وردییە لە هونـەری چیرۆکا، لەمانە ئامادە بـوونی دوور و درێـژی کـاوە بـۆ ئـەو ڕۆژە سـەختەی بەرامبـەر ئـەژدەهاك ئـەبێ بجـەنگێ وەك دروسـت کردنـی تـیر و ڕم و شـاردنەوەی لـە گەنجینـەی تایبەتیـدا، یـا بەشـداری هێندێ پاسەوانی کۆشکی ئەژدەهاك بەدزییەوە، یان کوشتنی کارون هاوڕێی بە وەفای کـاوە کـە گوێزانەوەیەکی پێویستە بە سەیرکەر، چونکە سەرکەوتن ئەگەر هیچ زیـانێکی نەخرێتـە بـەر چاو، بەتایبەتی لە هەڵوێستێکی وا سەختا نە بـە ڕاسـت ئـەژمێرێت و نـە چـێژ و لـەزەت ئـەدا بەسەیر کەران. دیسان لە هێرشی گەورەی شۆڕشگێڕانا ـ کە بە سـەر لاکـا، لاکـی یـەکا، هـەنگاو ئەنێن دێنە پێشێ ـ لە نیگار کێشانی کوشتار و خوێن ڕژانا،لەمانەدا هـەمووی، شـێرکۆ وردی و "منطقی"چیرۆك نوسێك بـەکار ئـەهێنێ، کوشـتنی " گۆتـۆ" سـەرکردەی لەشـکری ئـەژدەهاك، کـراوە بـە نیـشانەی چارەنووسـی مـەرگی نزیکـی ئـەژدەهاك کـە بـە دوایـا تەنانـەت بـە قـسەی پاسەواناکانیشا بۆ ئەژدەهاك هێزی میللەت بە تەواوی خۆی ئەنوێنێ:

شوورە لە دوای شورە ڕما
قوللەی قەلاّ داگیر کرا.. تا
.. وەکوو ئاوی کانی
لە هەموو بستە ئەرزێکا
هەڵ ئەقوڵێن..
بڕوایان وەکوو هەورازی
پلەی سەختی کێوی بەرزی
ولاّت وایە داگیر ناکرێ
تیشکی چاویان، وەکوو تیشکی
خۆر وایە بەدەس ناگیرێ!

مانەوەی ئەژدەهاك بـە تـەنیاو بـێ پـشتیوان لـە کـاتی تەنگانـەدا، شـڵەژانی پاسـەوانەکان و تێکـەڵ و پێکـەڵی قـسەکانیان نیگـار کێـشانێکی واقعیـە کـە لـە "منطقـی "چیرۆکنووسـێکەوە نەخشەی کێشراوە..

گەورەم ئەنجام نووتەك تارە
سەر دەرکەین ماڵ بێ پرسیارە

ئەو ئەژدەهاکەی لە کاتی زەبـر و زۆریـا وەك خوایـەك تەماشـا کـراوە، ئەمرۆکـە لـە مەترسـیدایە تەنانەت نۆکەرە هەرە نزیکەکانیشی ڕووی لێ وەر ئەگێڕن، چونکە لە دووریانی هات و نەهاتایە:

**ئەژدەهاک:** بەڵام کاتێ کە دەسەڵات

کەوتە سەر ڕێی هات و نەهات

هەموو شت پشتم تێ ئەکات

هەتا ئێوەش، هەتا ئێوەش

ڕووی نۆکەری وەر ئەگێڕن..هتد

پەلاماری ئەژدەهاکی دڵ پڕ لە داخ و ترس و شڵەژاوی بۆ سەر خەزنـەدار و لۆلـۆی دۆسـتی نزیکی، کوشتنی هـەردووکیان و گـەلێ شـوێنی تـری دوا پـەردە، بـە وردەکارییـەکی شـارەزاییانە ئەتوانین دانێین لە دوا تابلۆی بەرهەمەکەدا. لە دوا بەشی ئەم تابلۆیەدا: واتا هاتنە ژوورەوەی کاوە لەگەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی خرووشاوی میللەتا، شەڕە سـەختەکەی لەگـەڵ ئـەژدەهاکا ــ کـە ئەگـەر سـەخت نەبوایـە نـە ئـەبوو بەلایـەنی باشـی ــ هاتنـە ژوورەوەی گـوردۆی کـوڕی و هاوڕێکانی، دوا قسەکانی کاوە کە بەدەنگێکی زوڵاڵەوە لە ناوەڕاسـتیانا باسـی ئـەم ڕۆژە ئـەکات، تێکەڵاوییەکی گونجاوە لە هونەری چیرۆك و شانۆگەریدا، کە دوا پەردە ئەڕازێنێتـەوە. شـێرکۆ هەوڵێکی بەجێشی داوە بۆ ئەوەی بەرهەمەکانی ژیانی ساکاری سرووشت و کۆمەڵی کوردەواری تیا ڕەنگ بداتەوە.. کە بێتە سەر باسی "تـاڵی" باسـی ژاڵـە ئـەکات، کـە باسـی ژووانـی دڵـدار و دڵخـوازان بکـات ئـەوەی بـیری ناچـێ کـە لـە ژێـر سـایەی لـق و پـۆپی دار بەڕوویـەکا یـەکتریان دیدەنی کردبێ، لە باسی هات و چۆی هاوپەیمانەکانی کاوەدا بـۆ مـاڵی کـاوە، ڕایـەخیان لبـادە و خواردنەوەیان ماسـتاوە و خواردنیـان دەسـتەوارەیە نانـە. لەمـە گـرنگتر.. سـوود وەرگرتنـە لـە سامانی قسەی نەستەق و فەلسەفی و فۆلکلۆری کوردیەوە.. ئاسۆی هونەری ئـەم بەرهەمـە زۆر بە بایەخ تر بووە، بەو موتووربە کردنەی بە هێندێ لێکدانەوە و بیری کوردایەتی، کورد ئـەڵێ "دار پـوازی لـە خـۆی نـەبێ نـا قڵێـشێ " ئەمـە لـە زۆر کۆشـشی میللـەتی کـوردا، هـۆی سەرنەکەوتنی بووە، بۆیە هەموو کوردێ بە باشی تێی ئەگات، کاوەش لەم بەرهەمەدا کـە قـسە ئەکات ئەڵێ:

دوژمن ستەمە بتوانێ

ڕیشەی برِوا دەر بکێشێ

تەنیا پواز!پواز نەبێ

داری ئەم جارە ناقڵێشێ

لە شوێنێکی کەشدا ئەڵێ:

کورد قوربانی مەردانە بێ

PDF 4 KURD

بۆچی ئەنجام بۆ پارسێکی

بێگانە بێ..

تەنانەت لۆلۆی وەزیری ئەژدەهاکیش، بۆ دڵخۆش دانەوەی ئەژدەهاك هەر پەنا ئەباتە بەر ئەم ڕێگایە بۆ لە ناو بردنی شۆڕشەکەی کاوە ئەوە دەر ئەخات کە لە ناو کۆمەڵی ڕەش و ڕووت و قووتا:

گەلێ ویژدانمان کڕیوە

بە نەهێنی زۆر پوازی

ناکۆکیمان داتاشیوە

بەرهەمەکە لە گەلێ شوێنی کەدا فەلسەفەی پەندی پێشینیانی لە شوێنی خۆیدا بە کار هێناوە " کاسە پڕ بوو لێی ئەڕژێ، هەزاران جار مار گەستە بووین ".. هتد...هێندێ لەم قسە وردانەی ناو کوردەواری بۆتە مایەی ئیلهامێ بۆ شێرکۆ، کە لە بەرگێکی فەلسەفی جوانا لە شوێنی خۆیدا بەکاری هێناوە و ئاسۆی بەرهەمەکەی فراوانتر کردووە پێی:

کاری پێچەوانەی ژیان

دەستووری ئاوەژووی دنیا

وا ئەسووڕێ.. ژان لە دوای ژان

لە نا وەختا.. هەمووی یەك خا

ڕێکەوت، بەخت، چی پێ ئەڵێن،

ناو لێ ئەنێن

کاتێ هاتن.. بۆ ناخۆشی،

یاخود خۆشی بە کۆمەڵ دێن (4)

وەنەبێت، شێرکۆ مێشکی هەر کراوە بێت بۆ فەلسەفەی کوردەواری، بە تایبەتی کە بەرهەمەکەی بەرگێکی عەسری پۆشیوە و خۆی ئەڵێ " زمان و لێکدانەوەی ئەم سەدەیەن " بۆیە سوودیشی لە بیر و باوەڕ و فەلسەفەی دەرەوەش وەرگرتووە، لە شوێنێکی ئەم بەرهەمەدا، مەنگی پێش گەردەلوول " هدوء قبل العاصفة"بەم شێوە جوانە خستۆتە بەر چاو لە سەر زمانی کاوە:

لە پێش گەردا و هەڵکردنا

لە پێش شەپۆلی مردنا

دەریا ماتە.. ئاسمان شینە

ئەوەی بێ خەم بێ زەمینە

لە بێ دەنگی وا بترسە!

لە پێش گەرداو هەڵکردنا..

یا لە قسەکانی مارکس و مانیفستۆی 1848وە ئەم بیرەی وەرگرتوە لە سەر زمانی کاوەو کاردا ئەیلێتەوە:

**کاوە:** ڕاستە.. ڕاستە

ڕێگای ئەم هەڵمەتە سەختە

بەلاَم ئەوەی ئەیدۆڕێنین

هەر پێوەندە.. هەر زنجیرە

هەر کۆتی قاچ و گەردنە

بە تەنیا تەوقی مردنە..

ئەمانە هەمووی، نرخی ئەدەبی و شانۆیی بەرز تر ئەکەنەوە و بەسەرهاتی کاوە بەشێوەیەکی قووڵتر و دڵگیر تر ئەخاتە بەر چاو و لە ڕاستەوخۆیی سادە و ساکار ئەیپارێزێ[5].ئەوەی لایەنی چیرۆکنووسی و درامیی بەرهەمەکەی تا ڕادەیەك باش بەهێز کردوە، شیکردنەوەی " نەفسی " پاڵەوانەکانە لە کاتی گفت و گۆ کردنیانا، لە پەردەی یەکەما، لە کاتی نائومێدی و ناشتنی قوربانیەکانی ئەژدەهاکا، بۆ نموونە ئەم ئاوازەی زاماوا ئەیلێ، نەخشەکێشانێکی نەفسی وردە بۆ باری ناخۆشی وڵات:

پەپوو ئەڵێ.. ئەم وڵاتە

لە ژێر باڵما.. کش و ماتە

ئەژدەهاك.. ئاوازی منە

مێشك بۆ ماری سەر شانی

هیواو خۆزگە و نیازی منە

شوێنم " ماشۆی " لای مردنە

ئەم وڵاتە.. تاپۆی منە

تاپۆی منە.. تاپۆی منە..!

نووسەر ئەوەندەی لە قسەکانی کاوەدا، گەرم و گوڕی شۆڕشگێڕیمان ئەخاتە بەر چاو، ئەوەندەش لە قسەکانی ئەژدەهاکا، وێنەیەکی نەفسی واقیعی دڵ و دەروونی و لە خۆ بایی

بـوونی لێکدانــەوە و تــرس و مــەراقیمان ئەخاتــە بــەر چـاو، لای ئــەژدەهاك وەك هــەموو زۆردارێك.. مردن بەشی هەژار، برسی و خەڵکی لاوازە و بۆ ئەو نییە:

نەخۆش ئەمرێ.. هەژار ئەمرێ

لاواز و دەردەدار ئەمرێ

برسی ئەمرێ

من چۆن ئەمرم.. هتد

لـە قـسەکانی ئـەژدەهاکا، مـردن وەك دوژمنێکـی گـەورەی ئـادەمیزاد و ژیـان تێکـڕا، لـە پـەرچ دانەوەیەك و ڕوو بەڕوو وەستانێکی فەلسەفییدا خراوەتـە بەرچاو و گـەلێ لـەوە قـووڵ تـرە کـە تـەنها پەیوەنـدی بـە ئەژدەهاکـەوە هـەبێت، بـە تایبـەتی ئـەم ڕوو بـەڕوو وەسـتانە و مـەراق و شـڵەژانە لـە قسەکانی تارمایی مردنا خۆی ئەنوێنێ و ئەم پرسیار و گوومانە ئەخاتە سـەر بـێ کـەڵکی ژیـان.. بـەم هەموو ڕەنج و ئەزێتەوە کە کۆتاییەکەی بۆ هەموو بێ جیاوازی چاڵی ڕەشی مردن بێ، ناتوانین بەمە بڵێین یاخی بوون و "رفض"، بەڵام ئەتوانین پێی بڵێین هەنگاوی بەرەو ئەم لایانە:

ئادەمیزاد لە دایك ئەبێ

وردە وردە بۆ گەورە بوون..

هەنگاو ئەنێ...

ئارەقی ڕەنج و تەقەللای

زۆر ئەڕێژێ..

چاو ئەبڕێتە بەرزی هیوا

دەست ئەکوتێ

قاچ ئەکوتێ

شان ئەکوتێ

دێت و ئەچێ

بە بێ سرەوتن ئەڕەتێ

بۆ نان، بۆ منداڵ، بۆ ژیان

ئەکەوێتە گەرمە و کێشە

بۆ تەمەنێ

کەمی خۆشە،

زۆری ئێشە

PDF 4 KURD

لە ئەنجاما دێ بۆلای من

منی مردن!

خەوە ترسناکەکەی ئەژدەهاك، دیسان شیکردنەوەیەکی نەفسی گەلێ جوانە وەك پێش بینیەك بەر لە کارەسات و لەو پارچە سەرکەوتووانەیە کە بەرهەمەکەی پێ ئەڕازێنێتەوە:

لە خەوما بوو..

لە جێگەی گوڵ.. دڕکم ئەچنی

دەست و پەنجەم خوێناوی بوو

بەری دنیا تەماوی بوو

دارم ئەدی هەر بە سەوزی وشکی ئەکرد

قەلاَم، کۆشکم، چۆڵ و هۆڵ بوو

گڕی ئەگرت

ئەم ویست هاوار بکەم بڵێم

ساڵ لەمەو بەرەوە لەم خەباتەدا فاڵ بووە و سەر لە نوێ ژیاوەتەوە، بۆیە نایەوێ جارێکی کە کورد مارانگەستە بێ.بۆ ئەوەی:

دنیای خەم و نا ئومێدی

پڕ لە هیوای چەپکە گوڵ کەین

ئالأی سپی خۆشەویستی

لە ناو گیانا بۆ یەك هەڵ کەین..

تەنانەت کاتێك"کارون"ی شوان، لە لایەن ژێر دەستەکانی ئەژدەهاکەوە ئەکوژرێت، کاوە وەك شۆڕشگێڕێکی خاوەن تاقی کردنەوە و بیر و باوەڕ دێتە پێشەوە و نایەڵێ هاوپەیمانەکانی ورە بەر بدەن:

با دەستی خەم..

نەخەینە ژێر چەنەی دامان

نە زۆر نە کەم

هەڵێ نەدەین، بە دوژمنان

پێمان شاد بن

با ئەم کۆستە ڕەشەی مردن

بۆ ڕووناکیی سبەی هاتن

PDF 4 KURD

تینمان باتێ بۆ پێشەوە

بۆ سەرکەوتن..هتد

لەلای کاوە "کۆستی وەها سەربەستی خۆشەویست ئەکا" ئەم گیانی شۆڕشگێڕییە،ئەمەندە بە هێزە، لە قسەکانی پشتکۆی هاوڕێی کوڕەکەی کاوە "گوردۆ" شا خۆی ئەنوێنێ:

**پشتکۆ:** لە چاوی برسی و هەژارا

خۆمم بینی

لە گەردەلوولی ئازارا

لە گەڵیانا شەوم بڕی

لە خۆشەویستی ئەوانا

بەهەشتم دی

کاوەم ناسی

گوردۆم ناسی

بیری ئازادیم دۆزیەوە

خۆم پێناسی..

ئەم کاوە تایبەتییەی کاک شێرکۆ، تەنانەت نایەوێ ئەگەر شۆڕشیش سەرکەوت، " فەرمیدون " بکرێت بە پاشا، چونکە نایەوێت لە ئەنجامی قوربانییەکی زۆری کورددا، پێی ببێت بە پاشا، واتە ئەگەر چی لە ڕووخسارا کاوەکەی دوێنێیە، لەم لادانەی شێرکۆدا لە سەرچاوەکانی داستانی کاوە، بەتایبەتی لە شانامەی فیردەوسی، لایەنی داهێنەرانەی توانایمان بۆ دەرئەکەوێت، ئەمەش هۆیەکە بۆ سەرکەوتنی لەم بەرهەمەدا، چونکە لەوانەیە خۆ بەستنەوە بە تێکستێکی دیاریکراو، ڕێی هەناسەدانی ئازادی شاعیرێك بگرێ ئەگەر لە گەڵیا بەتەواوی نەجووڵێ و نەبزوێ، لەکاتێکا لێرەدا لە بەرگێکی خۆماڵی و بەهێزدا جڵەوی بۆ ئیلهامی تایبەتی خۆی شل کردووە، بێ ئەوەی زنجیرەی خەیاڵ و بەهرەی خۆی بەم جۆرە بەستنەوەیە بێ پێز بکات. لە گەڵ ئەم هەموو لایەنە باشانەشدا، لە بەرهەمەکەی شێرکۆدا هەندێ کەم و کوڕی هەیە کەخستنە پێش چاوی بە پێویست ئەزانم ئەگەر چی من مەبەستم لەم پێشەکییەدا دەرخستنی ڕووی چاکەی کارەکە بووە، لە خوێندنەوەی کارەکەدا تووشی هێندێ ڕستەی لاواز بووم لە نموونەی:

**زاماوا:** کاوەی باوکیشتان هەرماوە؟

**زێمری:** ڕاستە جارێ، ئەویش ماوە.

PDF 4 KURD

که بێ پێز و بێ بەشن لە گیانی دراما و شانۆ.. یان:

**یەکەم:** تۆ ڕاوەستە!

لە قسەم هەڵ مەدەرێ.. لە سەر خۆبە!

کە ڕستەی ساکاری وتارێکی سادەیە، نەك هی بەرهەمی شانۆیی، بێ گومان لە بەرهەمێکی وا دوور و درێژدا، پلەی هەڵچوونی "انفعال"ی شاعیر وەك یەك نابێ.. کە دێتە ئەو شوێنانەی تاقی کردنەوەی خۆی، ئەو دیمەنانەی ئەو شوێنانە بینویێتی و تیا ژیاوە وەك باسی " زۆرداری و کردەوەکانی " سۆزی هۆنراوەکانی بەرز ئەبێتەوە و بەهێز تر ئەبێت، بەلاَم لەو شوێنانەی کە تەنها بە چاوی خەیاڵ دیمەنەکانی دروست ئەکات " وەك باسی فریشتە و خوا و ڕووی ئەفساناوی " جار و بار هەندێ دێڕی لاواز و کەم و کورییەکی لە ڕووی هونەرییەوە تیادا ئەبینین، ئەمە شتێکی ئاساییە بۆ ئەم چەشنە بەرهەمانە. لە گفت و گۆیەکدا، کاوە وەك لە خۆ بردوویەکی ڕاست و ئازا قسە ئەکات و ئەڵێت:

ئەم ولاَتە پڕ لە دەنگ کەم
بەدەستی خۆم کفنی مردن
لەبەر خۆم کەم

ئەم کفن لەبەر کردنە ئەو مانایەی شاعیر ئەیەوێت بەتەواوی نایدات بە دەستەوە، باشتر وابوو بە شێوەیەکی کە دەربڕێ، کە ئەم گیانە ئامادە بووە بۆ لە خۆ بووردن و خەبات و قوربانیی گشتی بخستایە بەر چاو. لە لایەکی تریشدا کاتێ ئەژدەهاك باسی مردن ئەکات بەترس و مەراقەوە ئەڵێت:

.. ئەڵێم.. ئەگەر.. هات و مردم
ڕووتەیەك..،
هەژارێکی پیس و چلکن
هەڵم ئەگرن..
وەك پەڕۆیەك فڕێم ئەدەن. . .

ئەم خەیاڵ و لێکدانەوەیە لە گەڵ زلی و گەورەیی و زەبر و زۆری پادشایەکی وەك ئەژدەهاکا ڕێك ناکەوێ، " شا " یا تەنانەت سەرکردەیەکیش بەم جۆرە نانێژرێ، لە لایەکی تردا کە باسی هوزار ئەکات ئەڵێت:

لە شەقەی باڵی بەرز ئەدەن
بۆ سەرەتای دیاری بەهار

PDF 4 KURD

بەستە ئەڵێن..

هوزار وەك باڵندەیەك بە کۆمەڵ بەم چەشنە ناخوێنێ، ڕاستره بەتاك ناوی بهێنرێ، هەروەها ئەژدەهاك، کە خەوەکەی خۆی بۆ " مۆدۆن " ی جادوو گەر ئەگێڕێتەوە ئەڵێ:

لە خەوما بوو.. نەك بە ڕاستی

لە جێگەی گوڵ... هتد

بەکار هێنانی وشەی " بەڕاستی " هیچ پێویست نیە، چونکە کە لە سەرەتاوە وتی"لە خەوما بوو" دیارە و ڕوونە کە لە ڕاستیدا نییەئەمە لەوە ئەکات بڵێیت:

بە پێوە بووم، نەك دانیشتووا

وەختێ ئەم نەفی کردنە ڕاستە، کە دەمەتەقێیەك لە سەر شتێ بێ و کە دوو ڕای لە سەر بێ، یا بۆ چەسپاندنی ڕاستییەك کە بە پێچەوانەوە خەڵکی تێی گەیشتبێ واتە بۆ " تأکید". دیسان لە پاش درووست کردنی چەکووشەکەی، کاوە ئەڵێت:

ئەم چەکووشە!

یان چەکووشێك ئەبێت ناوی

ئەچێتە ناو ناوی زیندوو

باسی ئەکەن نەوەی هاتوو... هتد.

ئەم پێش بینییەی "کاوە " تۆزێ، سەر ئەکات، ئەڵێی پێشەکی ئەزانێ چۆن ئەچێتە مێژووەوە و ئەمڕۆ چۆن ناوی چەکووشەکەی ئەهێنرێت. ئەژدەهاك لە دیاری کردنی چۆنیەتی سزای "یاخی بووەکانا "ئەڵێت:

من وام ئەوێ

کەم بکوژرێ

بەلاّم پاشماوە دەست بەستە

گشت بگیرێ

لە دوایی دا کۆمەڵ.. کۆمەڵ

بۆ ناو دەریا فڕێیان دەن

بە خۆراکی ماسییان کەن!

ناو هێنانی " دەریا" بەلای منەوە لە جێی خۆیدا نییە، چونکە کوردستان ولاّتێکی بێ دەریایە و ئەم دیمەنە لای جەمهوری سەیر کەران، کە زۆربەیان دەریایان نەدیوە، خەیاڵێکی جوڵێنەر نییە،

ئەمە بەتایبەتی لەگەڵ دەربڕینی داستانەکەدا لە چوارچێوەیەکی نوێ و "عەصری" دا ڕێك ناکەوێ. لە بارەی تابلۆکانەوە، ئەو کاتەی ئەی خاییێنێ، تەنها پاش ئەوەی لە سەر شانۆ ئەم بەرهەمە پێشکەش ئەکرێت، ئەتوانرێت بە تەواوی بزانین کە ئایا بەرهەمەکە لەم بارەیەوە پەسەندە یان نا؟..

بەلاّم ئەتوانم بلّێم کەنەختێ ئەو وەختەی ئەی خاییێنێ، درێژ تـرە لـە پێویـست، کـات بایـەخێکی گەورەی هەیە لە سەرکەوتنی هەموو بەرهەمێکی شانۆییدا، تێکڕا باشـترە کـە لـە دوو سـەعات و نیـو زیاتر نـەخاییێنێ، بەلاّم ئەم لایەنە پێویستی سەرشانی یەکەمی دەرهێنەر "مخرج"ە چونکە ئـەتوانرێ بەپێی پێویستی کورتتر یان درێژ تر بکرێتەوە، لەو بڕوایەدام کە ئەگەر تابلۆکان لـە نـۆوە بکـەین بـە حەوت، بۆ سەر شانۆ و ئەم کورت کردنەوەیە لە چوار تابلۆی یەکەمدا بێ، کە "دەست پێشەکییە" بـە لێـك دانیـان، بـە باشـی ئـەتوانرێت، ئـەم بەرهەمـە لـە شـێوەیەکی زۆر سـەرکەوتوودا، لـە سـەر شـانۆ دەربهێنرێت، لە بەر ئەوەی وەکوو وتم ئەمە پێویستی سەر شانی دەرهێنەرە، بە پێویستی نازانم لەمە زیـاتر لـە سـەری بڕۆم،ئەوەنـدە هەیـە کـە بـەلای منـەوە، ئـەو تابلۆیانـەی کـە بـە هـۆی کـزی توانـای شانۆگەریمانەوە، ناتوانرێت وەك چۆن نووسراوە، دەربهێنرێت باشتر وایە لابىرێـت، نـەك بەشـێوەیەکی نیوە و نیوە چڵ بخرێتە سەر شانۆ. ئەتوانم بەو پەڕی دڵنیاییەوە بلّێم، کە شێرکۆ لەم کارەدا هونەری کردووە، شایانی ئەوەیـە کـەپڕ بـە دڵ پیرۆزبـایی لێ بکـەم، بـێ ئـەوەی کـە ئەوەشـم لـە بیر بـچێ کـە ماچێکی گەرم و گوڕی "هەڵبەست"ی کچۆڵەشی بکەم، لە بریتی باوکی!

**بەغدا**

( 21 )ی **تشرینی دووەم** 1970

**پەراوێزەکان:**

(1): کارەسات مەبەست تراجیدیایە **"Tragedy"**

(2): تا سەرەتای سەدەی بیستەم بەشی زۆر نووسەرانی دراما لـە چـوار چـێوەی هـۆنراوەدا بەرهەمـەکانیان دەربڕیوە.

(3): بـۆ نموونـە مۆنتـسیکۆی فەرەنـسی "1689 –1755" بـە لایـەوە ئەوانـەی دراما ئەنووسـنەوە سەرکردەی شاعیرەکانن و جەڵەوگیری هەستن، لە کاتێکا بـە چـاوی بـێ بایەخییـەوە سـەیری هـۆنراوەی " لیریك" ئەکات." نامە فارسییەکان –پاریس – 1729 ".

(4): نەگبەتی خۆشە، قۆرتی ناخۆشە، یا بەڕە لای تەنکییەوە ئەدڕێ.

(5): لێرە بەولاوە ناچار بووم لێکۆڵینەوەکەم کورتر بکەمـەوە، چـونکە بـاس کردنـی هـەموو ئـەو شـوێنانەی سەرنجی ڕاکێشام بۆ پێشەکییەك ناشێ و زیاتر کەرەستەی لێکۆڵینەوەیەکی ترە کە بە جیا بلاّو بکرێتەوە.

PDF 4 KURD

## کەسانی ناو ئەم داستانە

| | |
|---|---|
| ئەژدەهاک: | شا |
| گۆتۆ: | سەرکردەی لەشکری ئەژدەهاک |
| لۆلۆ: | وەزیری ئەژدەهاک |
| لاسیراب: | جارچی کۆشکی ئەژدەهاک |
| مۆدۆن: | جادووگەر |
| کاوە: | ئاسنگەر |
| گوردۆ: | کوڕی کاوە |
| سارا: | ژنی کاوە |
| پشتکۆ: | هاوڕێی گوردۆ |
| زێمری: | گۆڕهەڵکەن |
| زاماوە: | گۆڕهەڵکەن |
| کاردا: | جوتیار |
| مادیا: | جوتیار |
| کارون: | شوانی ئاژەڵەکان |
| کاردوخ: | ئاشەوان |

لەگەڵ: خەزنەداری ئەژدەهاک، کۆمەڵانی خەڵك، تارمایی مردن، دەنگی سێ کاسە سەر، سێ تارمایی مردوو، سێ ڕێبوار، پاسەوانەکانی ژووری ئەژدەهاک، سەربازێك، میللەت.

جێگا: کوردستان

کات: (600)ساڵ پێش میلاد.

PDF 4 KURD

## تێ بینی:

1–ناوی زۆربەی پاڵەوانەکانی ئەم داستانە، لە ناو ئەو ناوانەدا هەڵبژێرراون کە لـە کۆنـدا... لـە نەتـەوەی کورد و ناوچەکانی نراون.

2– کێشی هەموو هۆنراوەکانی ئەم داستانە تێکڕا (کێشی پەنجە)ی "4+4"ن و بڕگەکانی بەم جۆرە ئەژمێررێن:

---- ----

یان نیوەی

----

3– چۆنیەتی پەیوەندی بـە سـەرهاتەکانی نـاو ئـەم داسـتانە لـە ڕووی مێژوییـەوە، تـەنها پـەیوەنـدی خـۆ بەستنەوەیە بە ئەفسانەکەیەوە بەو شێوەیەی لە ناو کوردەواریدا بڵاوە، ئەگینا وەکی تر هەمووی لە زادەی بیری هونەر خۆیەتی و جۆری لێکدانەوە و زمانی قسەکردن تێکڕا لە سەرەتاوە تا کۆتایی ئەتوانین بڵـێین " لێکدانەوە و زمانی " ئەم سەدەیەیە.

4–ئـەم بەرهەمـە لـە بـەر دەسـتی خوێنـەری خۆشەویـستایە، سـەرەتای دەسـپێکردنی ئەگەڕێتـەوە بـۆ ناوەڕاستی سـاڵی 1969 و تـەواوکردنی لـەکۆتایی هـەمان سـاڵا، نـەك 1971، ئەمـە جگـە لـەوەی شـوێنی هەندێ تابلۆکانی ئەم داستانە و لە نێوان گفتوگۆی پاڵەوانەکانا... دەربڕینـی سـاکار و سـادە هـەن... کـە زیاتر خۆم ویستومن بەم جۆرە بمێننەوە، بـە تایبـەتی کـە بەرهەمەکـە بـۆ سـەر شـانۆ ئامـادە کـراوە، لـە لایەکی تریشەوە هەر بەو جۆرەی لە کاتی خۆیدا نووسیبووم، هێشتمەوە و هیچ دەستکاریەکم تیا نەکرد... ویستم ئەم بەرهەمە بخەمە بەرچاو.

5– ئەم بەرهەمە، نیاز وایە،لە پاشـەڕۆژێکی نزیکـدا لـە لایـەن تیپـی تەمـسیلی کۆمەڵـەی هونـەر و وێـژەی کوردییەوە، لە شانۆ بخرێتە سەر شانۆ، دوای ئەوەی کە دەرهێنەر " مخرج"، چاو بـە سـەرتاپای تابلۆکـان هەموویدا ئەگێڕێتەوە.

6– ئەبێ لێرەشدا، لەدڵەوە سوپاسی گەرم و گوڕی، هاوڕێیـانی خۆشەویـست وئـەدیب کـاك "جـلال مـیرزا کـریم " فەرمانبەر لە وەزارەتی ڕاگەیاندن و کاك "کمال رؤوف محەمەد " بکەم کەلە جێ بەجێ کردنی یاریـدەدان و یارمەتیـدا بۆ چاپ کردنی ئەم داستانە لەلایەن وەزارەتی ناوبراوەوە، دڵسۆزانە کۆششیان بۆ کردم.

**ش. بێکەس**

ئەو خـوا و فریـشتانەی لـەم داسـتانەدا ناویـان هـاتووە، سەرچـاوەکانیان داسـتانەکانی کـۆنی ڕۆژهەلاَت و بە تایبەتی ئەفسانەکانی دەوری سۆمەرییەکانە[1].

| | |
|---|---|
| **ئەهرەمەن:** | **خوای شەڕ.** |
| **ئانانا:** | **فریشتەی ئاسمان.** |
| **نانا:** | **خوای مانگ لە ئوور.** |
| **نیتی:** | **پاسەوانی جیهانی تاریکی ژێر زەمین.** |
| **ئینکی:** | **خوای جادووگەریو حیکمەتو دروستکەری دنیا.** |
| **ئۆتۆ:** | **خوای ڕۆژ.** |
| **نامۆ:** | **خوای دەریا.** |
| **ئانلیل:** | **لە هەموو فریشتەکان گەورەترو خوای خۆشی و فەڕوپیت.** |
| **ئاشنان:** | **خوای کشت و کاڵ و دەغڵ و دان.** |
| **لەهار:** | **خوای ئاژەڵ.** |
| **سمکان:** | **خوای شاخ و کێو و خاوەن دەسەلاَت.** |
| **ماشۆ:** | **ئەو ڕیزە شاخانەن کە ئاوی مردنیان لێیە.** |
| **زوو:** | **کوشندەترین باڵندە،بەپێی ئەفسانەکانی ئەو سەردەمە.** |

(1): داستانەکانی ڕۆژهەلاَتی ناوەڕاست و ولاَتـی ڕافـدەین نووسـینی زانـای بـەناوبانگی ئینگلیـزی "صـموئیل هنـری هـووك" **Samuel Henry Hooke** مامۆسـتای خوێنـدنی داسـتانە کۆنـەکان لـە زانکـۆی " لنـدن " دا گـۆڕینی بـۆ عـەرەبی یوسـف داود عبـدالقادر چـاپخانەی دار الجمهوریە 1968.

PDF 4 KURD

# تابلۆی یەکەم

"جێگا گۆڕستانێکە و مانگە شەوێکی خۆش، زێمری و زاماوا خەریکی گۆڕ هەڵکەندنن".

**زێمری:** "دوای ئەوەی پشویەك ئەداتو ماوەیەك لەمانگ ورد ئەبێتەوە ".

تریفەی مانگ، زەردەخەنەی،
لێوی وشکی پڕ لە تەوسە
پێڵوی قورسی پڕ وەنەوزە
تەماشای کەی...
هەر بەڕەنگی زەردیا دیارە
ئەڵێی مردووی سەد ساڵەیە!

**زاماوا:**

سەیر نییە، ئەویش پارچەی
دەروونی ئەم وڵاتەیە...
بە دوای خەما ئاوارەیە...
چرای کزی، شەوە زەنگی،
ئەم خاکەیە.

**ـ پشوویەك ـ**

**زێمری:**

باشە تاکەی ئەم بەلایە
مۆتەکەی ڕەشی سەر سنگ بێ؟

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

**لە مانگ پرسە!**

**بۆ بێ دەنگ بێ**

**لە بەرچی نایەتە قسە؟...**

**زێمری:**

**ئەویش وەك ئێمە وەڕسە!**

**زاماوا:**

**ئەی قوربانیمان نەدایە...**

**ورد و درشت**

**نەمان پەرست**

**تا ڕزگار بین لەم بەلأیە!**

**زێمری:**

**ئارامی گشت فریشتەکان**

**توول ئەکێشی.. خوا هەر وایە!**

**تۆڵەی درەنگ ئەکاتەوە...**

**زاماوا:** "بەتەوسەوە "

**جارێ هەر پیش ئەخواتەوە**

**" بە ڕقەوە ":**

**بڕوام بە ئاسمان نەماوە**

**بڕوام بە "سمکان" نەماوە**

**لە کوێن؟... لە کوێن؟...**

**زێمری:**

قاو بڵاوە خەڵکی ئەڵێن

کوێر بووە چاوی ئەهرەمەن

**زاماوا:**

درۆ ئەکەن، درۆ ئەکەن

چاو... زیندووە

نەمردوە...

ئەی نابینی هەموو ڕۆژێ

چەند ئەکوژێ، چەند ئەنێژێ!

**زێمری:**

وام بیست، دوێنێ شەو لە خەوا

" زوو" فرسەتی لێ هێناوە

لە ناکاوا...

بە دەنووك چاوی کۆڵیوە

بە چنگ جەرگی هەڵ دڕیوە

لە پاشانا هەڵ فڕیوە

تا لای " سمکان " نەوەستاوە

**زاماوا:**

تۆ بێ ئاگای "زوو" کوژراوە

من پێم وتی

بڕوام بە سمکان نەماوە

هیچی نەکرد



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئێمە خۆمان تەفرە داوە!

ـ پشوویەکی کورت ـ

بۆ وا خاوی، دەی هەڵکەنە

دەس بزوێنە

بەس بێ چەنە

**زێمری:**

تۆش نۆرەت دێ

ئەهرەمەن قورتومت بگرێ

**زاماوا:**

ئەمترسێنی

دەبا بیگرێ

ـ پشوویەك ـ

" لەدوای لێدانی مۆسیقایەکی ترسناك، سێ کاسە سەر لە ژێرەوە بەرز ئەبنەوە، زێمری و زاماوا ڕا ئەچڵەکن و ئەشڵەژێن"

**کاسە سەری یەکەم:**

بەس چەنە بەن، دەی هەڵکەنن.

**کاسە سەری دووهەم:**

ئێوە دۆستن یان دوژمنن؟

**کاسە سەری سێهەم:**

گۆڕ هەڵکەنی ئەهرەمەنن.

"هەردوو گۆڕ هەڵکەنەکە هەڵ ئەسنە سەر پێ و نزیکی کاسە سەرەکان ئەکەونەوە"

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

مەڕۆن، مەڕۆن، چەند پرسیارێ

ئەم پێم ئەڵێ...

سمکان تۆڵە ئەکاتەوە

لە دەروونی پیس و ناپاك

لەماری شانی ئەژدەهاك

**زێمری:**

من وا ئەڵێم، بەڵێ وایە

هەر ئەو تۆڵە ئەکاتەوە

هەر ئەو لە سەرمان لا ئەبا،

ئەم بەڵایە...

**کاسە سەری یەکەم :**

پرسیارتان کرد لە ڕەشەبا؟

لە مانگ، لە ئەستێرە، دەریا؟

**زاماوا:**

نەما پرسیاری لێ نەکەین

داڵدەی خۆمانی بۆ نەبەین!

**کاسە سەری دووهەم:**

ئەی لە پاشدا، لە ئەنجاما؟

**کاسە سەری سێهەم:**

چارەنووسی ئێوە چی بوو؟

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

وەرام نەبوو!

**زێمری:**

وەرام نەبوو!

**ـ پشوویەك ـ**

**كاسە سەری یەكەم:**

خۆتان زیندوون

پرسیار لە مردوو بۆ ئەكەن!

**كاسە سەری دووهەم:**

پشت لە یەكتری هەڵ مەكەن

خەرمانی یەك مەسووتێنن!

**كاسە سەری سێهەم:**

بە وەرامی ئەنجام ئەگەن!

"هەردوو گۆڕ هەڵكەنەكە بە گوێی یەكدا ئەچرپێنن، زاماوا ڕوو ئەكاتە كاسەسەری یەكەم ":

**زاماوا:**

شێوەت ئەكەم..

بەڵام تەواو ناتناسمەوە..

تۆ...

**كاسە سەری یەكەم:**

من ئەتناسم

هەموو جارێ یادت ئەكەم!

ئێستا بیرت ئەخەمەوە..

PDF 4 KURD

**من دراوسێیەکی خۆتانم**

**کوڕە گەورەکەی "ئانانم"..**

**مێشکم دەرخواردی مارەکەی**

**نەوسنی ئەژدەهاك درا**

**وام لێ کرا!**

**چەند تاوان بوو!**

**وام لێ کرا!**

**زاماوا:**

**ئا..ڕاست ئەکەی**

**پار زستان بوو..**

**زێمری:**

**ئەمیش وەکو هەزارەها،**

**بێ تاوان بوو**

**ـ پشوویەك ـ**

"زێمری ڕوو ئەکاتە کاسەسەری دووهەم وسێهەم ولێیان ئەچێتە پێشەوە "ئەی ئێوە کێن؟

"کاسە سەری یەکەم و دووهەم بە یەك دەنگ ":

**کوڕی کاوەین**

**حەوت برا بووین**

**پێکەوە زنجیر کرا بووین**

**شەشمان بۆ مار بووین بە خۆراك**

**تا چاك بێتەوە ئەژدەهاك**

**بەڵام بێ سوود، مار تا ئەهات**

PDF 4 KURD

نەوسن و برسی تر ئەبوو

بۆ مێشکی تر هارتر ئەبوو

ئێستاش ئێمە:

تەنها یەك برامان ماوە

**زاماوا:**

کاوەی باوکیشتان هەر ماوە؟!

**زێمری:**

ڕاستە جارێ ئەویش ماوە!

**ـ پشوویەك ـ**

"زاماوا ڕوو ئەکاتە کاسە سەرەکان"

**زاماوا:**

خەڵکی مێشکی سەریان بردووم

هێندە پرسیاریان لێ کردووم

ئەبێ وەرام لای ئێوە بێ

بەڵام ڕوو شکێنم مەکەن

لە پرسیارەکەم ڕامەکەن

"هەر سێ کاسەسەرەکە بە یەك دەنگ":

فەرموو بڵێ..

ئەگەر وەرام لای ئێمە بێ

ڕاست پێت ئەڵێین

چونکە دوژمنی خوێنەخوێی

ڕیا و درۆین..

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

**لەدوای مردن..**

**زیندوو بونەوەمان هەیە؟**

**جارێکی تر..**

**هاتنەوەمان ئیتر هەیە؟**

**یان قسەیە!!**

**"هەرسێکیان بە یەك دەنگ"**

**بە خەڵك بڵێن ژیانەوە..**

**هەستانەوە..**

**جارێکی تر..راستە هەیە..**

**بەڵام تەنها ئەو کاتەیە..**

**کە ئەژدەهاك**

**ئەنێنە خاك!**

**"هەر سێ کاسە سەرەکە ون ئەبن"**

**ـ پشوویەك و سەرسام بوونێك ـ**

**زاماوا:**

**نیوە شەوە..چەندمان هەڵ کەن؟**

**زێمری:**

**هەر تەنها دەن!**

**زاماوا:**

**هێزم بڕا... هێزم بڕا..**

PDF 4 KURD

**زێمری:**

بەس چەنە بە، هەر هەڵکەنە!

ئەمە خواستی ئەهرەمەنە...

**ـ پشوویەك لەگەڵ هەڵکەندندا ـ**

"سێ ڕێبوار دێنە ژوورەوە و، دیارە لە ڕێگایەکی دورەوە هاتوون، بە لای گۆڕ هەڵکەنەکاندا تێ ئەپەڕن، پێش تێپەڕ بوون، کاتێ ئەگەنە لایان":

**ڕێبواری یەکەم:**

سمکان هێز و تینتان باتێ..

**ڕێبواری دووهەم:**

ئینکی چاوی دڵتان باتێ

**ڕێبواری سێهەم:**

ئانلیل فەڕ و پیتتان باتێ.

" زاماوا و زێمری بە یەك دەنگ "

ماری نەوسن نەتان گاتێ!

**زێمری:**

لە کوێ هاتوون بۆ کوێ ئەچن؟!

**ڕێبوارێکیان:**

لە لای پیرە مەگروونەوە..

بۆ لای پیری ڕاو تەدبیری

گەورەی ئێرە کەوتووینە ڕێ

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

" ماشۆ" ڕێگەتان پێنەگرێ!

"تێ ئەپەڕن، یەکێکیان ئەگەڕێتەوە، بە دەنگێکی نزم ڕوو ئەکاتە هەردوو گۆڕ هەڵکەنەکە":

**ڕێبوار:**

ماری سەر شان هەر زیندووە؟

ئەژدەهاک ئەڵێن هیلاکە؟

ئەهرەمەن لە پێ کەوتووە؟

**زێمری:** "بە گاڵتە پێکردنەوە"

درۆی گەورەیان کردووە..

ئەژدەهاک زرپ و زیندوە!

مار چوار سەری زیاد کردووە..!

" ڕێبوارەکە بە پەلە ئەچێتە دەرەوە "

**ـ پشوویەك ـ**

" هەردوو گۆڕ هەڵکەنەکە دەست لە ئیش هەڵ ئەگرن، چاو ئەبڕنە ئاسمان".

**زاماوا:**

تۆ بڕوانە چۆن.. ئەستێرە

چاویان بڕیوەتە ئێرە!

**زێمری:**

نەهێنی ئێرە ئەزانن..

PDF 4 KURD

**زاماوا:**

" نانا " ماته..
هەر بێ دەنگە
بەڵام ئێجگار شۆخ و شەنگە..
چاوی پڕ تیشکی ئاواتە...

**زێمری:**

ئەی "ئەنانی" ئەستێرە و مانگ
ئەی خواوەندی هەموو ئاسمان
کوا مژدە و بانگ؟
وەرە خوارێ،
لەم نزیکەوە ببینە...
لەم خاکەدا خوێن ئەبارێ
خۆت ببینە کە ئەهرەمەن
چۆن لە دۆڵی کینە و ڕقا..
دڵ ئەهاڕێ، گوڵ ئەهاڕێ
وەرە خوارێ،خۆت ببینە...

**زاماوا:**

من پێم وتی:
هەتا ئەناناش کەڕ بووە..

**زێمری:**

تۆ تێ ناگەی..

PDF 4 KURD

ئەویش دڵی پڕ برینە..

شین ئەگێڕێ..

بۆ ئەفسانەی ئەم زەمینە!

ـ پشوویەك ـ

" زاماوا بە گۆرانیەوە بە ئاوازێکی ماتەمین "

پەپوو ئەڵێ.! ئەم وڵاتە

لە ژێر باڵما، کش و ماتە..

ئەم وڵاتە سەر تا خواری

چیاو پێ دەشت و ڕووباری

کەلاوەی وەیشومەی منە..

هەمووی تاپۆی خەمی منە..

ئەهرەمەن دۆستی دێرینمە

ـ پشوویەك ـ

ئەژدەهاك ئاوازی منە

مێشك بۆ ماری سەرشانی

هیوا و خۆزگە و نیازی منە

شوێنم، ماشۆی لای مردنە

ئەم وڵاتە تاپۆی منە

تاپۆی منە، تاپۆی منە

PDF 4 KURD

# تابلۆی دووهەم

"هەر هەمان گۆڕستانە، گۆڕهەڵكەنەكان ڕۆیشتوون، شانۆ تاریكتر ئەبێت، لە گەڵ مۆسیقایەكی ترسناكا، سێ مردوو هەڵ ئەسن ماوەیەك بە بێ دەنگی هات و چۆ ئەكەن، بە سێ كوچكەیی دائەنیشن یەكێكیان ڕوو ئەكاتە دووانەكەی تر":

**یەكەم:**

ئەمشەو نۆرەی گێڕانەوەی

بەسەرهات و ژیانەوەی

چیرۆكی ڕابووردوی منە!

**دووهەم:**

سەر گروشتەی پێش مردنە!

**سێهەم:**

ناخۆش نییە باس كردنی،

ئەو ڕۆژانەی لەكیس چووە،

**دووهەم:**

بەلاَم هەتاكو خۆر..

نەكەوتووە!

**سێهەم:**

تا گۆڕ هەڵكەن، نەهاتووە

PDF 4 KURD

ئادەی بڵێ

بڵێ.. بڵێ

" لێی ئەچنە پێشەوە و دەست ئەکا بە گێڕانەوە"

**یەکەم:**

پێش کوشتنم من جوتیار بووم

زەوی ڕەقم، ئەکرد بە ئاو

بازووم ئەستوور، هەرزەکار بووم

تا ئێوارە زەردە هەتاو..

تا تاریکیی....

جووتم ئەکرد، هەتا ژیان

بە پیتتر کەم

تا برسێتی قات و قڕ کەم!

نەمرێ ئینسان

تاکوو "ئاشنان"

دڵ خۆشتر کەم

ئارەقی رەنج، توانای شان

تێکەڵ بە زەویی وشك بوو

بێ پشوودان

هەتا زەمینم سەوز کرد...

تۆو بوو بە نان

گوێتان لێیە

PDF 4 KURD

**دووهەم:**

بڵێ.. بڵێ.. گوێمان لێیە..

" لەم کاتەدا مردوویەکی تر لەولاوە ئەڕوات، بێ ئەوەی تەماشای ئەمان بکات "

**سێهەم:**

ئەوە کێیە؟

**مردووی ڕێبوار:**

خۆمانین پێرێ شەو هاتووم

تازە مردووم!

**یەکەم:**

بەخێر هاتی.. دنیا چۆنە؟

**مردووی ڕێبوار:**

دنیا چۆن بێ قڕووقاتی... "ئەڕواتە دەرەوە "

**ـ پشوویەك ـ**

**دووهەم:**

ئێ دەی بڵێ گوێمان لێیە!

**سێهەم:** "لە گەڵ هەناسە یەکا"

دنیا چییە؟

**یەکەم:**

کچێك بوو، دراوسێمان بوو

حەزم لێ کرد...

**دووهەم:**

ئێ.. ئێ.. جوان بوو؟

PDF 4 KURD

**یەکەم:**

**وەکوو فریشتەی ئاسمان بوو...ئانانا بوو...**

**سێهەم:**

**داوات نەکرد؟**

**لە دوای ئەوەی حەزت لێکرد؟**

**یەکەم:**

**تۆ... ڕاوەستە:**

**لە قسەما هەڵ مەدەرێ...**

**لە سەر خۆبە...**

"دەست ڕادەکێشێ"

**ئەو بەڕووەی لەوبەر دیارە**

**شوێن بینینی من و یار بوو**

**لە ژێر سایەی لق و پۆپیا**

**دائەنیشتین..**

**زستان لە لامان بەهار بوو...**

**دوور... لە چاوی**

**کەسانی بەدوو... بەدکاربووین**

**ئا لەوێدا... خەممان ئەکوشت**

**جار بەجاریش...**

**سکاڵا و ڕازمان هەڵ ئەڕشت..**

**لە ئەنجام دا...**

**گەنمم دانێ.. کچیان دامێ**

دووهەم:

ئێ... ئێ...

پیرۆزیش بێ!

پیرۆزیش بێ!

یەکەم:

قسە مەکەن گوێتان لێبێ!

بەڵام ئەهرەمەن پێم شاد بوو

نەگەیشتم.. بە یارەکەم!

دووهەم:

ئای داخەکەم!

سێیەم:

ئای داخەکەم!

یەکەم:

لە پڕ شەوێ قۆڵیان بەستم

چاویان بەستم

لە زیندانێکی... تاریکا...

تونگیان کردم

لە پاش دوو ڕۆژ، بە خۆراکی

ئەژدەهاکی...

شەڕیان کردم

سەریان بڕیم

هەرچەند هاواری ئاشنانوو،

PDF 4 KURD

ئانانم.. کرد.. بێ هودە بوو

دڵی خوای شەڕ نەرم نەبوو..

**دووهەم:**

ڕۆی لە دەست چوو..

**سێهەم:**

ئەو ژیانە... ڕۆی لە دەست چوو..

"یەکەمیان هەڵئەسێتە سەر پێ و تۆزێ بە بێدەنگی ڕائەوەستێ و ئەڵێت":

**یەکەم:**

بەڵام ئەوساش کە زیندوو بووین!

وەکوو ئێستا هەر مردوو بووین!

**دووهەم:**

چۆن... چۆن.. ئادەی بیڵێرەوە.

**یەکەم:**

لە دەس دەرچوو...

من شاخی بەردم کون ئەکرد..

لە زەوی ڕەق..

کانی ڕوونم هەڵ ئەقوڵان

بە پشت تاشە بەردی گەورەم

ئەگواستەوە..

بنی دار بەڕووم ئەجووڵان

چنگم ئەنایە بینی گورگ

تا ئەمخنکان...

PDF 4 KURD

تا بەم دەستە..

پۆشتەم ئەکردەوە.. ژیان

**سێهەم:**

ئینجا باشە چیت مەبەست؟!

**یەکەم:**

خواکان هیچیان دەنگیان نەکرد..

ئەژدەهاك وەك خۆی مایەوە

تاکوو ئەشهات

ماری زۆردار ئەژیایەوە!

"هەردووکیان بە یەکەوە"

پێمان بڵێ چیت مەبەستە!

**یەکەم:**

نەمتوانی ئەژدەهاك بگرم

لە باتی ئەو سەرم ببڕێ

سەری ببڕم..

**دووهەم:**

قسەی بێ جێ و بێ ڕێ مەکە!

ئەمە هەر کاری خواکانە...

ئەژدەهاك لای ئەهرەمەنە

کوا ئەمە ئیشی ئینسانە؟

**سێهەم:** "تەماشایەکی ئەملا و ئەولا ئەکات، بە ترسێکەوە ئەڵێت":

کات درەنگ بوو..

وەختی هەڵهاتنی خۆرە

هاوڕێمان شەوە زەنگ بوو..

کات درەنگ بوو...

هاکا دنیا ڕۆشن بووەوە

دۆست و دوژمن لێك جوێ بووەوە...

چاکتر وایە... بلاٌوەکەین

جارێکی تر بەیەك ئەگەین

تا لە شەوی داهاتوودا...

"هەرسێکیان ون ئەبن، شانۆکە ڕووناك ئەکرێتەوە"

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# تابلۆی سێهەم

"جێگا سەرەڕێگایەکی قەڵەباڵغە، خەڵك لە هات و چۆکردندا، جارچیی کۆشکی ئەژدەهاك دێتە ژوورەوە و لە سەر شوێنێکی بەرز ڕائەوەستێ چەند کەسێکی لە دەور کۆ ئەبێتەوە"

**جارچی:**

مژدە و بانگە...

بانگی ئەمڕۆ بۆ ئاهەنگە

بۆ هەڵپەڕکێ و زەماوەنگە

کۆڕ گەرم کەن بۆ گۆرانی

بەفووی شمشاڵ، بەسەمای خۆش

دەروونی کێو بهێننە جۆش

مەست بن، شەراب بخۆنەوە

بخۆنەوە بە خۆڕایی..

ڕازاوەیە خوانی شاهی

خۆ پۆشتە کەن..

ئەمڕۆ جلی جوان لە بەر کەن

**گوێ گرێك:** "بە تەوسەوە ڕوو ئەکاتە کۆمەڵەکە"..

بە قسەی بکەن...

خۆتان مەست کەن...

PDF 4 KURD

**جارڕچی:** ـ بەتورەییەوە ـ

**لە قسەما... قسە مەکەن!**

**کەس نابێ گرژ، ڕوو ناخۆش بێ**

**گوێ گرێك:** "بە تەوس و گاڵتەوە"

**قەلیش ئەبێ دەنگی خۆش بێ!...**

**جارڕچی:** "بە تورەییەوە "

**هەڵ مەدەنێ، گوێ ڕاگرن!**

**ـ پشوویەك ـ**

**هەر ئاهەنگ بێ**

**دەنگی زورنا یان دەهۆڵ بێ**

**بخۆنەوە بە خۆڕایی**

**ڕازاوەیە خوانی شایی**

**مژدە و بانگە**

**بۆ سەمایە، بۆ گۆرانی**

**هەموو بڵێن...**

**پایەدار بێ تەختی شاهی**

"کەس وەرام ناداتەوە" ئەمجارە بەتووڕەییەوە:

**هەموو بڵێن**

**پایەدار بێ تەختی شاهی**

"کۆمەڵەکە بە کزییەوە"

**پایەدار بێ تەختی شاهی**

PDF 4 KURD

**جارچی:**

**ئەوەی وتم**

**ئەمره.. ئەمری پادشایی**

**پاشای گەورەمان ئەژدەهاك**

**بۆ سێهەم جار ژنی هانی**

**مژده و بانگە...**

**خواستی گەورەی ئەژدەهاکە**

**ئەمڕۆ سەری کەسی ناوێ**

**ئەمڕۆ قوربانی بەخشیوه**

**بەرگی بووردنی پۆشیوه**

**کۆڕی سەیران، ڕازاوەکەن**

**نزای درێژ بوونی تەمەن**

**بۆ پاشا کەن!**

**بخۆنەوە...**

**گوێ گرێك:**

**تا ئەتوانن**

**جارچی:**

**بەستە بلێن**

**گوێ گرێك:**

**تا بزانن!**

**جارچی:**

**سەما بکەن، سەما بکەن**

PDF 4 KURD

ڕوو گرژ مەکەن

ئەژدەهاك سێبەری خوایە

**گوێ گرێك:**

پێتان ئەڵێ بیپەرستن!!

**جاڕچی:**

هەتا مردن لە سوجدەدا

**گوێ گرێك:**

بۆی بۆستن!

**جاڕچی:**

بلیتی بەهەشت لای ئەوە!

**گوێ گرێك:**

فریشتەکان، کەنیزەکی

کۆشکی ئەون!

**گوێ گرێکی تر:**

لەبەر پێی ئەودا ئەخەون!

**جاڕچی:**

ئەوەی وتی، ئەوەی ویستی

نا گەڕێتەوە دێتە دی

باران...

**بەکۆمەڵ:**

باران

**جارچی:**

ساماڵ

**بە کۆمەڵ:**

ساماڵ

**جارچی:**

ژیان

**بە کۆمەڵ:**

ژیان

**گوێ گرێك:**

مردن

**جارچی:**

مردن!!

**ـ پشوویەك ـ**

چەنە بازی بەس بێ دەنگ بن...

**ـ پشوویەك ـ**

مژدە و بانگە، مژدە و بانگە

هەموو شتێ پێ ئەکەنێ

بروسکە هەور ڕاو ئەنێ

ساماڵ پشتی هەور ئەشکێنێ

خوڕەی ڕووبار...

خوڕە و هاڕەی پێکەنینە



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**گوێ گرێك:**

ئەمڕۆ هەتا تامی ژاڵە

شیرینە وەکوو هەنگوینە!

**جاڕچی:**

چونکە پاشا، پاشای گەورەی

ئەم زەمینە!

ژن ئەهێنێ...

**گوێ گرێك:**

هەتا مردووش پێ ئەکەنێ

بخۆنەوە...

**جاڕچی:**

بخۆنەوە بە خۆڕایی

شەرابی خەست، بخۆنەوە

سەرخۆش مەست بن

**گوێ گرێك:**

پێتان ئەڵێ بێ دەربەست بن!

بخۆنەوە!

"دێتە خوارەوە بە دەم چوونە دەرەوەوە"

با هەر درێژ بێ تەمەنی

شا...ئەژدەهاك

پایەدار بێ، پایەدار بێ

تەختی بزورگی ئەژدەهاك

"کۆمەڵەکە بلاّوەی لێ ئەکەن، شانۆ چۆڵ ئەبێ".

PDF 4 KURD

# تابلۆی چوارهەم

"جێگا لە هەمان شوێنی ڕابردوو ئەچێ وچەپەکترە، کاردا و میدیا و کارون هەریەکەیان بەشێوەیەکی جیاواز جیاوازلە یەکتر پاڵکەوتوون و دانیشتوون "ــ کارون هەڵئەسێتە سەر پێو بەکزییەکەوە ئەپاڕێتەوە ئەڵێت: ـ

**کارون:**

ئەی "لە هاری"بە چنگ و دەس
فریای ئاژەڵی خەڵك کەوە...
خەڵکی بێکەس
خۆت نیشان بە، دەربکەوە!
ئاهەنگی چی!
لە ناو شاخا، لە پێدەشتا
لە پارەوە هەتا ئێستا
ئاژەڵی لەڕی سك برسی
بۆ لەوەڕی سەوز ئەگەڕێ
نەك تامی کرد
تا نەشی دی!

ـ پشوویەك ـ

**مادیا:**

ئاهەنگی چی!

**کاردا:**

ئاهەنگی چی!

**کارون:**

کۆڕی ناو زەماوەنگی چی

دەمی قڵیشی سەر زەوی

وەکوو دەمی...ئێمە وشکە...

گیانی تینوو...

درەخت مردوو...

لە جێگەی بەر، لق و پۆپی،

وشکەوە بوو...

تینوێتی و برسێتی ئەگرێ

ئاهەنگی چی...

**مادیا:**

کۆڕی ناو زەماوەنگی چی...

**کارون:**

ئەی لە هاری...خێر و بێری

پڕ لە شادی

ئەمساڵ بارانمان هەر نەدی

باران... باران



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**کاردا:**

چاوەڕوانین هەر نەباری!

باران... باران...

**مادیا:**

با داکاتە سەرمان...بە تاو

با دڵ... با گیان...

بیخواتەوە...

**کارون:**

با ژیان تازە کاتەوە!

" کاوە دێتە ژوورەوە، چەند هەنگاوێك دوور لێیان ئەوەستێ، گوێ ئەگرێ"

ـ پشوویەك ـ

**کارون:**

باران بۆ کێڵگە و دەغڵ و دان!

بۆ لەوەڕگەی سەوزی کوێستان

باران... بۆ نان

**کاردا:**

چاوەڕوانین هەر ناباری!

بۆ ناباریێ؟...

**کارون:**

ئەی لە هاری بە دەسەڵات

دەنگت نەبو، دەنگت نەهات

فریای ئاژەڵ

PDF 4 KURD

**فریای مێگەل**

**فریای شوان و جوتیار کەوە**

**فریای سکی هەژار کەوە!**

**مادیا :** "ڕوو ئەکاتە کارون "

**پەنا بەرن بۆ لای " ئانلیل "**

**دروست کەری دنیا ئەوە**

**مایەی فەڕو و پیتی ژیان**

**تەنیا ئەوە!**

**چرای رووناکی ژین ئەوە!**

**باران... بارین**

**بەدەس ئەوە...**

**کاردا :**

**قڕە و بڕە و چەنەی ناوێ**

**ژیان خەوە...**

**ئەنجام تاریکایی شەوە**

**باران بباریێ و نەباریێ**

**مردن ڕێگەمان پێ ئەگرێ**

**" نیتی " بۆ خوانی ئەژدەهاك**

**سەرمان ئەبڕێ....**

**ـ پشوویەك ـ**

**پێتان ئەڵێم... سەرتان سووك كەن**

PDF 4 KURD

**کۆڵ بە دنیاوە هەڵ مەگرن**

**ئەمڕۆ و سبەی، زوو بێ و درەنگ**

**ئەبێ بمرن**

**کارون:**

**نامرین ئەگەر ماری سەرشان**

**ماری دەم خوێناوی تاوان**

**بەلای ژیان**

**تێر بخوا داوای دڵ نەکا...**

**لە خواردنەوەی خوێن بێزار بێ**

**ـ پشوویەك ـ**

**دوژمنی گەورەمان مارە**

**کە مار نەما... یان تێری خوارد...**

**هەموو کەسێ بەختیارە!**

**مادیا:**

**دیارە.. شێتی**

**ئەگینا کەی ماری برسی**

**ماری زۆردار...**

**تێر لەمێشك و لە دڵ ئەخوا؟!**

**ـ پشوویەك ـ**

**قرچەی گەرما، ڕۆژانی سارد**

**هاتن و چون...**

**هەزار بەهار**

PDF 4 KURD

خلْتانی خوێنی خۆیان بوون...

بەلاّم ماری نەوسن و هار...

تێری نەخوارد!

**کاردا:**

قرەی ناویّ

چەنەی خۆتان بۆ شل ئەکەن؟

تووشمان مەکەن!

خواستی فریشتەکان وایە

قرەی ناویّ

" تەماشای کاوە ئەکات "

کاوە بەردە دەنگی نایە.

**کارون:**

وای تیّ مەگەن،

لە دلاّ زیت و وریایە!

**کاردا:**

ئاسنگەرە...

ئەم لە دەروونا ئەسووتیّ

وەکوو ئێوە ئاسنی سارد

بە قسەی بیّ جیّ ناکوتیّ!

**کارون:**

بە قسەی تۆ...

گوێی دلّی خۆیمان.. ناداتیّ

PDF 4 KURD

**ماديا:**

بێ دەربەستە:

ماتە.. پەستە

**كارون:**

لە پارەوە هەتا ئێستە

شەش قوربانی ڕێکی داوە

ناهەقی نییە کە پەستە!

**ماديا:**

ناهەقی نییە کە پەستە!

**كاردا:**

قڕەی ناوێ، وا باشترە

هەر بێدەنگ بێ

ئەم ئاگرە...

بە من و ئەو دانامركێ!

ئەو چاك ئەكا...

قسە... ناكا...

**ماديا:**

وتم بەردە دەنگی نایە!

**كارون:** "لە دوور دەنگی دەهۆڵ و زوڕنایە، كارون گوێی بۆ شل ئەكات"...

دەنگی دەهۆڵ و زوڕنایە

**كاوە:** "پاش ئەوەی لێیان دێتە پێشەوە "

دەنگی ڕسوایی ئێوەیە..

PDF 4 KURD

زوڕنای مەرایی ئێوەیە

**کارون:**

هی ئێمەیە؟!!

**کاردا:**

ئەو رسواییە.. کامەیە؟

**مادیا:** "بەتەوسەوە"

دەنگ و باسی لای کاوەیە!

**کاوە:**

ئەوەی ئەیڵێم بۆ کەسێکە

بۆ یەکێکە...

مێشکی دیلی زۆردار نەبێ

دڵی لە ناو داوی شەوا

وەك مردوو گرفتار نەبێ

ئەوەی ئەیڵێم بۆ کەسێکە

کوێلەی خەم و ئازار نەبێ

پێ شێلی ڕۆژگار نەبێ!

"پشوویەك، هەموویان لێی دێنە پێشەوە"

قسەی دڵم بۆ یەکێکە

کلپەی ئاگری هەردوو چاوی

تاریکی رووناك ناکاتەوە

ترسنۆکی بسووتێنێ

نەنگی ناوچەوانی پێشووی

PDF 4 KURD

به خوێنی خۆی بشواتەوە
نرکەی گەرووی ڕاپەرینی
شێرو پڵنگ بتۆقێنێ

**ـ پشوویەك ـ**

قسەی مێشکم بۆ کەسێکە
بتی بێ گیان
ورد و خاش کا
سەری تەفرە بپەڕێنێ
چۆك بە ژێر دەستی دابدا
پشتی قەدەر بنەوێنێ
ئەگەر ئاسمان
ئەگەر زەوی
گەر ڕەشەبا
ئەگەر دەریا
بەربەستی بن، ئەو کۆڵ نەدا
دامێنی سکاڵا نەگرێ
هەرگیز بەدەستی زەبوونیی
فرمێسکی تەنگانە نەسڕێ!

**ـ پشوویەك ـ**

**کارون:**

ئەم قسانە دەستی مژدەن
باوەش بەژیانما ئەکەن

PDF 4 KURD

**کاردا:**

تاریکیی بڕوام ڕائەدەن

**مادیا:**

دڵ و دەروونم تێی ئەگەن

**ـ پشوویەك ـ**

**کاوە:** "لەسەر قسە کردن ئەڕوات"

قسەی گیانم بۆ کەسێکە
بەهار لە ناو دەروونیا بێ
خۆر لە دڵیا هەڵ هاتبێ
لە جێی گریان، هیوای تیابێ
ئەوەی وتی: وەك بروسکە
وەك تیشکی رۆژ...
هەوری ڕەشی دیلی کون کا
شەبەقی سوورو دڵ یەك خا
هەر هەنگاوێ هەڵی دێنێ،
بۆ دنیایەك تازە تر بێ
بۆ ئامانجێك،
لەوەی پێشوی زۆر گەشتر بێ
هەر هەڵمەتێ بۆ سەر مردن!
لە هەڵمەتی ڕابردووی تر،
گەرم تر بێ،
ئەوەی مەبەستمە، گوێ بگرێ

PDF 4 KURD

ئەو کەسەیە...
ئەچێ بە گژی مردنا...
ئەم لە پێشا یەخەی ئەگرێ
ـ پشوویەك ـ

ڕێگای ئازار ئەگرێ و ئەبڕێ
ئەو کەسەیە، خڵتەی درۆی
ئەفسانەکان ڕائەماڵێ
بیری تاریکی دەسخەڕۆی
فریشتەکان.. ڕائەماڵێ

**کارون:**

ئەمە مەڵێ!!

**مادیا:**

پەلە... مەکە!

**کاردا:**

تەواوی کە!

**کارون:**

مەبەست زیاتر، ڕۆشنترکە!

**کاوە:**

هەر زوو وتم
قسەی دڵم، بۆ کەسێکە

PDF 4 KURD

بیر... ڕوناك بێ

نەك بیر دیلی

ئەژدەهاك بێ

نانا، ئانلیل، لەهار، سمكان

فریشتەكان...

نیشانم بەن.. ڕێگەو شوێنیان

دڵیان، چاویان، گیانیان، دەستیان

نیشانم بەن!

ئەژدەهاكیش.. هاوار ئەكا

ئەڵێ سمكان

ئەڵێ لەهار

ئەڵێ ئاشنان

ئەڵێ.. ئۆتۆ

چاك بزانن، قەت یەك نابێ

قەت یەك ناگرێ..

خوای من و تۆ و

هینی زۆردار.

فریشتەیەك كە ئەژدەهاك

بیپەرستێ...

ئەینێمە خاك!!

**كارون:**

تۆ وا بڵێ

PDF 4 KURD

**کاردا:**

تۆ بێ دەنگ بە، با ئەو بڵێ

**مادیا:**

با ئەو بڵێ

**کاوە:**

داوا ئەکەن، باران داکات

داوائەکەن، ئاوەدانیی

ژیان خۆش کات

زۆر دەمێکە، ئەم داوایە

بەری خۆزگەی بەرەڵایە

نەتان پرسی، کوانێ ئەنجام؟

چی بۆ کردن فریشتەکان؟

چی کرد ئانلیل چی کرد سمکان؟

تەنها باران...

تینویەتی ئێمە ناشکێنێ

بەتەنیا نان...

برسێتی ئێمە ناشکێنێ

**کارون:**

گوایە... چیە؟!

**کاردا:**

چیتر.. نییە!

**مادیا:**

ئاو تینوێتیمان ئەشکێنێ

نان برسێتیمان ئەشکێنێ

چیتر هەیە..!

" کاردوخ دێتە ژوورەوە "

"کاوە لە سەر قسەکردن ئەڕوات"

دەمتان قفڵی لێ دراوە

دەمێ کە ژەنگ ڕزانوێتی!

مێشکتان زنجیر کراوە...

مێشکی دوژمن خەسانوێتی

دڵتان هەستی تیا نەماوە

وشەی قسەتان سواوە

لە کاری ڕۆشتن کەوتووە

دەروونتان کرم تێی داوە

پیاوەتیتان تیا مردوە!

بە دەستی یەك، خۆشەویستیی...و

برایەتیتان ناشتووە!

**ـ پشوویەك ـ**

خۆ سەردەمێ باران هەبوو

نانی زۆری هەرزان هەبوو

بەڵام ئەوەی کە من ئەیڵێم...

ئەوساش نەبوو!



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**کاردوخ:**

بەرداش نەبوو؟!!

**کارون:** "روو ئەکاتە کاردوخ "

تۆ بێ دەنگ بە، ئێستە هاتی...

**کاردا:**

پێمان بڵێ چی تر نەبوو!

**مادیا:**

تەواوی کە،... چی تر نەبوو!

**کاوە:**

ئەوەتەی هەین...

هەر ژێر دەست بووین

ئەوەی ئەیڵێم سەربەستی یە

ڕێگای ڕۆیشتنی ڕاستی یە

خۆری بەتینی بڕوایە

بەهاری سەوزی هیوایە...

سەرفرازی دڵ و چاوە...

خەرمانی ڕۆژی شادی یە

گەردن بەرزیی، ئازادیە

ـ پشوویەك ـ

ژیان تەنیا سەربەستی یە

**کارون:**

وەك تۆ ئەڵێی

PDF 4 KURD

بڕوا بەفریشتە نەکەین
بایەخ بە هیچ خوایەك نەدەین
ئەی ئەو بەهەشتەی، تۆ ئەیڵێی
چۆن پێی بگەین؟!

**کاردوخ:**

پشتمان کێیە؟

**مادیا:**

چیمان پێیە؟

**کاردا:**

قۆناخ کوێیە؟

**کاوە:**

هەموو ڕۆژێ من ئاسنی،
ڕەق و پتەو ئەشکێنمەوە
ئەیکەم بە ئاو ئەیتوێنمەوە
"ڕوو ئەکاتە کارداو مادیا "
ئێوەش جەرگی عەرد هەڵ ئەدڕن
تاشە بەردی ئەم کێوانە
بەشانی ڕەنج ئەگوێزنەوە
هەڵی ئەگرن.
"ڕوئەکاتە کارون"
تۆش شەڕ لەگەڵ گورگا ئەکەی
بەشوێن مردنا ڕائەکەی
"ڕوو ئەکاتە کاردوخ"

PDF 4 KURD

**تۆش بەرداشی ئاش ئەگێڕی**

**ئارەق تێکەڵ بە جۆ ئەکەی**

**بە ماندوێتی ژین ئەوێری**

**ـ پشوویەك ـ**

**ئیتر ئێمە چۆن ناتوانین**

**تەختی زۆردار سەر نگون کەین:**

**ئێمە وا بین**

**چۆن ناتوانین**

**دیلی و ژێر دەستیی زەبوون کەین**

**ـ پشوویەك ـ**

"ڕوو ئەکاتە کاردوخ":

**تۆ پێم ئەڵێی... پشتمان کێیە؟!**

**فریشتەکان؟ خوا زۆرەکان!**

**نەء...خۆمانین**

**خۆمان پشتین**

**خۆمان خاوەن بازو و مشتین**

**هەر خۆشمانین...**

**چارەنووسین!**

**ئەم بازووانە... بازووی هێزە**

**کەللە پژێنی..دوژمنە**

**بەزێنەری،..**

**دێوو درنجی مردنە!**

PDF 4 KURD

ئەم بازوانە..

هاوڕێی کۆنی سەرکەوتنە!

" روو ئەکاتە مادیا"

تۆش پێم ئەڵێی...چیمان پێیە...

ئەوەی لەلای من و تۆیە!

لای ئەژدەهاك دەس ناکەوێ

چیمان پێیە؟...

بڕوای گیان و بیرمان...پێیە

خۆرمان..پێیە...

هێزی شاخ و کێومان پێیە

هەقمان..پێیە

"ڕوو ئەکاتە کاردا"

تۆش پێم ئەڵێی قۆناغ کوێیە؟

قۆناغ قەلآی ئەژدەهاکە

هاڕینی سەری ناپاکە

"بەسەر سوڕمانەوە هەمویان بەیەك جار"

مەبەست سەری ئەژدەهاکە؟!

ـ پشوویەك ـ

**کاوە:**

بەڵێ ئەژدەهاکە

سەری... زۆردار

سەری بەلآ، سەری خوێنخوار!

PDF 4 KURD

تا ئەو سەرە لە ناوا بێ
پرسەی ژیان تەواو نابێ
قەت نای بینن
سەر فرازیی وەرزی بەهار
"هەموویان پێکەوە: "
ئەی سەری مار؟!

**کاوە:**

ئەفسانەیە وەکوو لە هار
وەکوو ئۆتۆ وەکوو سمکان
بیانووی...زۆردار،
بۆ چاو بەستە، ماری سەر شان!
کامتان شانی ئەژدەهاکتان
بینیوە هەتا بزانن!
ڕاستە ماری چوار سەری شان؟
**ـ پشوویەک ـ**

ئەژدەهاک...مار
مار...خۆیەتی
سەری بەلاّ
سەری ئازار هەر خۆیەتی...
ژەهری مردن هەر خۆیەتی
کفنی مردن هەر خۆیەتی

هەتا ئەهرەمەن خۆیەتی!

**ـ پشوویەك ـ**

**كارون:**

بەڵام ڕێی سەركەوتن سەختە!

**مادیا:**

قسەی كاوە نەخشی بەردە!

قسەی دەروونێكی ڕاستە.

**كاردا:**

ئەوەی ئێمە ئەی دوڕێنین

تەنها هەر كۆت و پێوەندە

**كاردوخ:**

با تۆوی ئەم گفت و پەندە

لەناخی دلأبچێنین

**كارون:**

منیش هاتوم...

لەگەڵتانا ڕێگە گرتووم

"گوردۆ بە هەنسكە برِكێ دێتە ژوورەوە":ـ

بابە...هاتوم...پێتان بڵێم

خوێنمژەكانی ئەژدەهاك

پاشای زۆردار...

ورووژاون...

PDF 4 KURD

هەر چاوێکیان کردووە بە چوار!

ڕق هەستان!

ئەپشکنن...بۆ ئەوانە،

چاو هەڵ ئەخەن

نەچوون بۆ کۆڕی زەماوەنگ

دوورن لە هەڵپەڕکێ و ئاهەنگ

**کاوە:** "ڕوو ئەکاتە کاردا و مادیا و کاردۆخ و کارون"

ئێوە بڕۆن خۆتان دەرکەن

بەڵام بەڵێنی سبەینێ

لە یاد نەکەن..

"کاوە و گوردۆ، دێنە پێش شانۆوە"

**گوردۆ:**

بابە زوو کە تا نەهاتوون

تا گورگەکان...پەیدا نەبوون.

بابە...زووکە

**کاوە:** "بە توڕەیی و توندو تیژییەوە"

بەڵێن بێ بتی ئەفسانەی

دیلی و ڕسوایی بشکێنم

تەخت و تاراجی ژێر دەستیی

لەبنەوە هەڵ تەکێنم

قەڵاو زیندانی ئەژدەهاك

بڕوخێنم...

بەڵێن بێ کۆشکی تاوانی..
لەگەڵ خۆیدا بسووتێنم!
سەری ئەم تاریکە شەوە
بنەوێنم...
خۆری سەربەستی و ئازادیی
بە دەستی خەبات هەڵ بێنم!

**گوردۆ:**

بابە...زووکە!

**کاوە:**

ڕزگاریی بە خوێن گوڵ ڕەنگ کەم
سەر شۆڕی تا سەر بە پەنگ کەم
لە زەنگ بدەم
من زراوی مردن بەرم
من ڕاوی نێم
ئەم وڵاتە پڕ لە دەنگ کەم...
بە دەستی خۆم کفنی مردن!
لەبەر خۆم کەم.
هەتا ئاڵای سەرفرازیی
ئەم میللەتە،...
لەسەر لووتکەی بەرز هەڵ ئەکەم
"لەگەڵ چوونە دەرەوەدا"
لەسەر لووتکەی بەرز هەڵ ئەکەم

PDF 4 KURD

# تابلۆی پێنجەم

"جێگا ژووری ڕازاوەی شاهانەی ئەژدەهاکە، لەسەر تەختەکەی دانیشتووە، گەڵێ جۆر میوە و بابەتی خواردەمەنی جیاوازی لەبەردەما دانراوە "

ئەژدەهاك بەتەنیا لەبەر خۆیەوە...

ئەم دنیایە، وەك کەنیزەك

لەبەر پێما... ڕاکشاوە!

ئەم زەمینە... پان و پۆڕەی!!

لەبەردەمما ڕاخراوە!

ئەم هەموو مەردوومە زۆرەی،

وەك مێروولە،

لەبەر چاوم دێن و ئەچن

هەتا ئەمرن...

دەست لەسەرسنگی کڕنووشی

بۆم ئەوەستن!

ئەڵێم ئەم ژیانە هەمووی...

وائەزانم...

هەر بۆ خۆم دروست کراوە!

بۆ من... تەنیا بۆ من دانراوە

ـ پشوویەك ـ

PDF 4 KURD

ئەڵێین بەهەشتی ئەستێرە
قەشەنگترە لە هی ئێرە
بڕوا ناکەم!
ئەڵێن چیت ویست لەوێ هەیە!
چیت داوا کرد!
لە بەر دەمتا ئامادەیە!
وەکوو ئەڵێن:
ئەوە بەهەشتی ئەوێیە!
ئەگەر واش بێ ئینجا چییە!
سەیر نییە!
لێرەش هەیە، لای من هەیە
ئەڵێی خواردن لە بەر کردن!
ئەوە هەزار جۆرە چەشن...
ئەڵێی ئافرەت، بۆ ڕابواردن
هەڵبژێرە!
نەشمیلە بێت، یان کەڵەگەت
جرپن بێ، یان هێمن بێ دەنگ
سوور و سپی، یان گەنم رەنگ
هەڵ بژێرە!
بڕوا ناکەم بە هەشتی...
دووری ئەستێرە
بگاتە بە هەشتی ئێرە!!

PDF 4 KURD

بڕوا ناکەم!

ـ پشوویەك ـ

شەراب، سەما، کانی ئاڵتوون

هەر لێرە هەن، هەر لێرەش بوون

ـ پشوویەك ـ

"لە دوای قەیرێ بیرکردنەوە و دەست بە دەستا دان"

بەڵام... بەڵام... ئەم مردنە

تێکی داوە...

ئەم مردنە ئێسك قورسە

تارمایی هەر لە بەر چاوە...

بە تەنیا ئەو... لەبەر دەمما

ڕەپ وەستاوە...

هەر تەنیا ئەو: داوای بووردن

لە من ناکا...

هەر تەنیا ئەو، کڕنووش نابا...

ـ پشوویەك ـ

" زۆرتر بیر ئەکاتەوە و زیاتر ئەشڵەژێت "

مردن... مردن... واتە چاوم

ئەنووقێ و ئیتر نابینێ...

ڕووناکی ئیتر... نابینێ

کەس نابینێ، ڕەنگ نابینێ

ژنی شۆخ و شەنگ نابینێ

هیچ نابینیٚ!
هەموو شتیٚ تاریك ئەبیٚ
تاریك وەك شەوە زەنگ ئەبیٚ!
هیچ نابینیٚ، هیچ نابینیٚ
ـ پشوویەك ـ
دڵم لە لێدان ئەکەویٚ...
گوێم کپ ئەبیٚ... هیچ نابیسم
نە قسەی خۆش، نە سۆز و ساز..
نە گۆرانیی کچی دەنگ خۆش
نە دەنگ و باس!
نە خوڕەی ئاو، نە خوێندنی
باڵندەی چیا و دارستان..
نە پێکەنینی.. شۆخی جوان
هیچ نابیسم... هیچ نابیسم...
کاتیٚ... مردم..
ئەڵێم ئەگەر هات و مردم!!
ڕووتەیەك.. یان
هەژارێکی.. پیس و چڵکن
هەڵم ئەگریٚ
وەك پەڕۆیەك...
فڕێم... ئەدەن..
ئینجا... ئینجا..



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

خۆڵ بەسەر لاشەما ئەکەن!

پاش چەند ڕۆژێ...

مار لە گەردنم ئەئاڵێ

ورد... ورد ئەمخۆن!

ـ پشوویەك ـ

ستەمە... چۆن... ئەم ئەنجامە؟

هەزار ساڵیش تەمەنم بێ...

هێشتا کەمە...

ئەم ئەنجامە؟... زۆر ستەمە..

زۆر ستەمە!!

ـ پشوویەك ـ

"لە گەڵ قاقای پێکەنیندا"

بەڵام بۆچی ئەبێ بمرم

بە هێز.. بە زۆر،

مردن ئەگرم!

لە زیندانا تونگی ئەکەم

من چۆن ئەمرم!

نەخۆش... ئەمرێ

هەژار... ئەمرێ

لاواز و دەردەدار ئەمرێ

برسیی ئەمرێ

بێ دەرەتان، بێکەس ئەمرێ

PDF 4 KURD

من چۆن ئەمرم

ـ پشوویەك ـ

"مۆسیقایەكی ترسێنەر لێ ئەدرێ و تارمایی مردن دێتە ژوورەوە، لەپاش ئەوەی ئەژدەهاك چاوی پێی ئەكەوێ ئەشڵەژێ و لە بەر خۆیەوە":

ڕاستی نییە... خەو ئەبینم

با ڕۆژیش بێ...

لە تارمایی شەو ئەبینم...

با ڕاستیش بێ...

ئەژدەهاك لە چی ترساوە!

كێ لە بەریا نە لەرزاوە!

ئەم جانەوەرە " نیتی " یە

پاسەوانی مەینەتیە...

با ئەویش بێ!

ئەژدەهاك لە كێ ترساوە!

"دەنگ هەڵئەبڕێ.. دەست بۆ تارماییەكە درێژ ئەكات"

كێیە؟ كێیە؟

بۆ ئەژدەهاك كڕنووش نابا

وا بێ دەربەست ڕاوەستاوە؟!

كێیە؟ كێیە؟

**تارمایی مردن:**

دۆستم... دۆستم

هانێ... دەستم

" دەست بۆ ئەژدەهاك درێژ ئەكات"

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

دەست بۆ یەکێ درێژ ناکەم

تا نەی ناسم

تا تێی نەگەم!

**تارمایی مردن:**

چاك ئەمناسی

من نەناسی!

کێ ئەناسی؟

**ئەژدەهاك:**

تۆم نەدیوە!

**تارمایی مردن:**

لە ژیانا، لە دنیادا

کێ بەتەنیا

کڕنووش بۆ ئەژدەهاك نابا

لە بەردەمیا نە لەرزیوە

من ئەو کەسەم!

من ئەنجام و چارە نووسم!

هەر ئەم بینی...

**ئەژدەهاك:**

وتت دۆستم!

**تارمایی مردن:**

دۆستیشم و خۆشەویستم!

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

" ئانلیل " لە خەوا پێی وتووم

ئەوەی بۆ تۆ کڕنووش نابا...

تێی گەیشتووم!

هەر مردنە...

تۆ مردنی؟!

بەلاّم... بزانە... ئەژدەهاك

ناترسێنی...

**تارمایی مردن:**

من میوانی دۆستی خۆمم

دلگیر نابم!

هەر سەرێ تۆ سەری ئەبڕی

بە دیاری بۆمی ئەنێری

هەر ئاواتێ تۆ ئەی کوژی

هەر بەهارێ تۆ ئەی نێژی

هەر خوێنێ تازە بیرێژی

خواستی منە

ڕاگرتنی دڵی منە!

**ئەژدەهاك:**

تێ گەیشتم بۆچی دۆستی

لە کڕنوشا بۆم ناوەستی!

بەلاّم ناتوانی زمانی...

PDF 4 KURD

من ببەستی!

لە گویّ بخەی!

تۆ مردنی! ناوت هەیە!

بەڵام دەنگ و ڕەنگت نییە!

وەك من ژیانت تیا نییە!

**تـارمایی مردن:**

لە گەڵ تۆدا...

شەڕ کردن لای من نەنگییە!!

من میوانی دۆستی خۆمم

**ئەژدەهاك:**

وتت ئەنجام چارە نووسم

بۆ منیشە...

گەر... دۆستتم؟!

**تـارمایی مردن:**

ئادەمیزاد لە دایك ئەبیّ

وردە... وردە بۆ گەورە بوون

هەنگاو ئەنیّ!

دیّتە کۆڕی ژیانەوە...

ئەرك ئەکیّشیّ!

ئارەق و ڕەنج و تەقەلای

زۆر ئەڕیّژیّ...

PDF 4 KURD

چاو ئەبڕێتە... بەرزی هیوا

دەست... ئەکوتێ

قاچ... ئەکوتێ

شان... ئەکوتێ

دێت و ئەچێ

بە بێ سرەوتن، ئەڕەتێ!

بۆ نان، بۆ منداڵ، بۆ ژیان..

ئەکەوێتە گەرمەو کێشە...

بۆ تەمەنێ...

کەمی خۆشە، زۆری ئێشە!

لە ئەنجاما... دێ بۆ لای من...

منی مردن!

**ئەژدەهاك:**

چارەنووسی منیش وایە!

یاخود جیایە...؟

**تارمایی مردن:**

من پێم وتی...

تۆ تارمایی گیانی منی...

دۆستی گەورەی....

ئەهرەمەنی

خۆت مردنی

بەڵام ئەمری!

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:** "بە شپرزەییەوە"

نابێ بمرم... ئەژدەهاکم

نابێ بمرم... نابێ بمرم!

وەك ئەم خەڵکە، تێی گەیشتووە

زەننەقیان بۆ لە من چوە؟

چیم کردوە!

**تارمایی مردن:** ئەوەی ئەیکەم... سووك کردنی

باری ئازاری سەر شانە!

لە بێخەوە هەڵکەندنی...

داری کرمۆڵی ژیانە!

ڕزگار کردنی ئینسانە...

ئەوەی ئەیکەم...

لە سەر.. داوای...

سکاڵای دەمی خۆیانە!!

**ئەژدەهاك:** "بە مەراییەوە"

هەر چۆنێك بێ، ئێمە دۆستین

پشت بە یەکتری ئەبەستین

چاکتر وایە ڕێك بکەوین!

با ناحەز پێمان خۆش نەبێ!

لێك نەکەوین...

تۆ بۆ من و من بۆ تۆ بم

چیت ویست ئەیکەم...

بەلاّم نەمرم!

**تـارمايی مردن:**

بەڵێن نادەم

خواستی وا لە ئەستۆ ناگرم!

**ئەژدەهاك:**

هەر چیم هەیە بۆ تۆو نەمرم!

**تـارمايی مردن:**

خواستی وا لە ئەستۆ ناگرم!

**ئەژدەهاك:**

ئەوە قەلاّم، ئەوە كۆشكم

تەنها نەمرم!

**تـارمايی مردن:**

خواستی وا لە ئەستۆ ناگرم!

**ئەژدەهاك:** "تاجەكەی لە سەری دائەگرێ"

ئەوە تاجم، ئەوە تەختم

ئەوە خەزنەی زێڕ و بەختم

هەموی بۆ تۆو... تەنها نەمرم

**تـارمايی مردن:**

تۆش هەر ئەمريت!

**ئەژدەهاك:**

ئەوە ژنی تازە و جوانم

بەخشی بە تۆ و تەنها نەمرم



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

## تارمایی مردن:

**تۆش هەر ئەمریت!**

**" ئەژدەهاك دەست ئەكات بە هاوار كردن و تارمایی مردن ون ئەبێت".**

PDF 4 KURD

# تابلۆی شەشەم

"جێگا ژوورێکی ماڵی کاوەیە، کاوە لەچاوەڕوانیکردندایە، بە ژوورەکەدا هاتو چۆ ئەکات"

گوردۆ دێتە ژوورەوە:

**گوردۆ:**

زۆر ڕاوەستام کەسیان دیارنین

کەسیان نەهات...

**کاوە:**

ئاخۆ بزانە گیری چین

کورِم... هەردێن

نای شکێنن... گفت و بەڵێن

پاسەوانی بەر دەرگابە

بە ئاگابە...

ئەبێ هەر بێن

" گوردۆ ئەچێتە دەرەوە"

**کاوە:**

کاسە پڕ بوو لێی ئەڕژێ

کاسەی ڕق و داخمان پڕە

بائەم ڕقە، بائەم ئاگرە

PDF 4 KURD

له داگیرکەر هەڵبپرژێ
بە گڕ زۆردارانا بچێ
دەستی خوێناویان بگرێ
لەشیان بگرێ
کۆشکی پڕ تاوانیان بگرێ
**ـ پشوویەك ـ**
زۆر دەمێکە ئێسکی ڕەنجمان
مێشکی ڕۆڵە و جوان و گەنجمان
خۆراکی خوانی دوژمنە
زۆر دەمێکە ئەم وڵاتە
وەك گۆڕستان...
دایکی نەگبەتی و مردنە...
زۆر دەمێکە ئەم وڵاتە
چیا و کەژی
وەك خەڵکەکەی، پەست و ماتە
زۆر دەمێکە چاوەڕوانی
بەهارێکی فەڕو و هاتە
**ـ پشوویەك ـ**
پاڕانەوەی ڕوو لە ئاسمان
پاڕانەوەی دەستە و ئەژنۆ
سکاڵا بۆ فریشتەکان
تەفرەی ژیانی دەسخەڕۆ

PDF 4 KURD

**فرمێسکی چاو، هەناسەی سارد**

**هەموو بەشێ بوون لەدرۆ**

**بێسوود، بێداد**

**هەرماینەوە ژێر دەستە بووین**

**نەك جار و دوو...**

**هەزار جار ماران گەستە بووین**

**ـ پشوویەك ـ**

**بۆ گەیشتن...**

**بەئازادی، بەسەرکەوتن!**

**ئەبێ باجی خوێنی دڵ بەین**

**دەست بکەینە ملی مردن!**

**دنیای خەم و نائومێدی**

**پڕ لە هیوای چەپکە گوڵ کەین!**

**ئالأی سپی خۆشەویستی**

**لە ناو گیانا، بۆ یەك هەڵکەین**

**بۆ سەر کۆشکی ئەژدەهاکیش...**

**ڕەشەبا بین**

**گەردەلوول بین، هەموو هەڵ کەین**

**ـ پشوویەك ـ**

" گوردۆ دێتە ژوورەوە "...

**گوردۆ:**

**بابە... ئەوا یەکە یەکە**

PDF 4 KURD

دیارن... هاتن

**کاوە:**

بەخێر هاتن.

"ڕوو ئەکاتە گوردۆ "

ئادەی ئەو لبادەش داخە...

"لبادێك دائەخات "

**گوردۆ:**

چاوەڕوانی... فەرمایشتم!

لە گەڵتانا من دانیشم

یاخود بڕۆم؟

**کاوە:**

چاوی بەدی پەناو پاسار

نەهێن گرن...

بۆ ئەژدەهاك

ئێشکی پارێزی پێوەدان

لە ناکاوا لە پیاو... ئەگرن!

واچاکترە!

بەر دەرگای پاراستن بگرە

پاسەوانی سەربەستی بە!

**گوردۆ:**

سەر لە پێناوا، ئامادەم

چیت وت بیکەم

"بەرەو دەرەوە ئەڕوات کاوە بانگی ئەکاتەوە "

PDF 4 KURD

**کاوە:**

**بیرم نەبوو...**

**دایکت کوانێ لە ماڵ نییە؟**

**گوردۆ:**

**بەیانی زوو..**

**هێشتا هەتاو نەکەوتبوو**

**ئاگام لێ بوو**

**ئامادە بوو، بچێ بۆ سەر**

**گڵکۆ و گۆڕی براکانم**

**" گوردۆ ئەچێتە دەرەوە "**

**ـ پشوویەك ـ**

**" کاردا و مادیا و کاردوخ یەك لە دوای یەك یەنە ژوورەوە "**

ـ سڵاو

ـ سڵاو

ـ سڵاو

**کاوە:**

**بەخێرهاتن سەر هەردوو چاو...**

**دڵتان روو کرد..**

**گیانتان خۆش کرد...**

**ماڵی منتان**

**ئاوەدان کرد!**

**"دائەنیشن"**

**ـ پشوویەك ـ**

PDF 4 KURD

**کاوە:**

سەگەکانی کۆشکی زۆردار

وەك شێت و هار...

دوێنێ کەوتوونەتە بازاڕ

دەست نە پارێز...

دروێنەی لەشیان کردووە!

بە ڕم کاسەی سەری زۆریان،

هەڵ گرتووە!

**مادیا:**

چ هەواڵێکتان بیستووە؟

**کاردۆخ:**

هەر پاشایەك، وەك ئەژدەهاك

وڵات وڵاتی خۆی نەبێ

تاجی دزراو بکاتە سەر

**کاردا:**

تەخت... فڕێنەر

ئەبێ وابێ

**کاوە:**

لەوەش زیاتر،

بۆیە کینەو ڕقی زۆرە،

شمڵی شوومی هەرا و شەڕە!

خوێناو خۆرە،

PDF 4 KURD

چونکە زڕە

وەجاخ کوێرە!

**مادیا:**

کاوە پێکای، سەرنج وردە

**کاردۆخ:**

فەرمایشتەکەی پەسەندە

**کاردا:**

داری زڕ و بێبەر ناژی

ئەبێ بمرێ

بە لادابێ

زوو بێ و درەنگ

" گوردۆ دێتە ژوورەوە"

**گوردۆ:**

بابە.. دایکم گەڕایەوە...

لە سەر قەبران

لە دوای گریان

لە پاش شیوەن و لە خۆدان

**مادیا:**

بە تەنیا دایکی تۆ نییە

سك سووتاو بێ

کوڕ کوژراو بێ

جەرگی لە سەر، پشکۆی خەفەت

هەڵ قرچاو بێ

بە تەنیا دایکی تۆ نییە

**کاوە:** "ڕوو ئەکاتە گوردۆ"

کوڕم بڕۆ پاسەوانی

بەر دەرگابە

بە ئاگا بە

**گوردۆ:**

بەڵێ... بابە

" ئەچێتە دەرەوە "

" سارا، دایکی گوردۆ، دێتە ژورەوە، میوانەکان لە بەری هەڵئەستن "

**سارا:**

هەموو لایەك بەخێرهاتن

سەر ڕۆح، سەر دڵ، سەر چاو هاتن

هەموو لایەك بە خێرهاتن

**مادیا:**

گوردۆت نەمرێ

سەر فراز بی

ئیتر ناسۆر یێخەت نەگرێ

شیوەن بەس بێ!

ئاسمان سەبووریت باتەوە!

**کاردا:**

چاکان... ئەجرت بداتەوە



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

نەترس، تۆڵەت بکاتەوە

**کاردۆخ:**

هەموو ئەمرین

ئەم ڕێگایە ئەبێ ببڕین

ئاسمان، سەبووریت باتەوە!

**سارا:**

فەرموون... فەرموون

دابنیشن

"دا ئەنیشنەوە"

" لە سەر قسە کردن ئەڕوات"

کوڕتان نەمرێ

لە ماری سەر شان بە دوور بن!

فریشتەکان...

دەست بە باڵتانەوە بگرێ

هی هەمووان!

**کاوە:**

برسیمانە، نیوەڕۆیە

هیچمان هەیە...

**سارا:**

ئەوەی هەیە، نانو دۆیە!

**کاوە:**

بۆمان بێنە!

PDF 4 KURD

" دایکی گوردۆ ڕووئەکاتە میوانەکان "

بەخێرهاتن، سەر چاو هاتن

" ئەچێتە دەرەوە "

**کاوە:** "بە تەوسەوە، مەبەستی لە قسەکانی سارایە"

فریشتەکان... ڕزگارمان کەن

ڕزگار نابین

ئەفسانەکان، ڕابەرمان بن

خراپتر بین

چاکتر نابین

ـ پشوویەك ـ

**مادیا:**

دووانمان ماون، ئامادە بن

بۆ نەهاتن

**کاردۆخ:**

نایەن وتیان:

گەشتێ بۆ ناو چیا ئەکەن

گەر سەریش بەن

ئەبن بە سییان

**کاوە:**

مانای چی سییان؟

**کاردا:**

گاڵتەیە... یان...

PDF 4 KURD

**کاردۆخ:**

گاڵتە نییە، پێتان ئەڵێم

چۆن بوون بە سییان!

**کاوە:**

ئەوە... دووانیان

گۆڕ هەڵکەنی ئەژدەهاکن!

دڵنیاین لێیان کە پاکن

بەڵام سێهەم!

ئەبێ کێ بێ من نایناسم؟

**کاردۆخ:**

من ئەیناسم!

پاسەوانی کۆشك و قەڵای

پڕ لە بەڵای

ئەژدەهاکە!

**کاوە:**

ئەژدەهاکە؟!

**مادیا:**

ئەژدەهاکە؟!

**کاردا:**

پاسەوانی

کۆشکی زۆردار و ناپاکە؟!

PDF 4 KURD

**کاردوخ:**

پەلە مەکەن، پەلە مەکەن

لە سەر خۆ بن

لە خۆتانەوە هەڵ مەچن

بەڵێ... بەڵێ

قەڵا و کۆشکی

ئەژدەهاکە!

بەڵام... مەردە

دروست... ڕاستە

کوڕی چاکە

**کاوە:**

کوڕی چاکە؟ ئامادەیە.

بێت بۆ مردن

**کاردوخ:**

چاوەڕوانی ئەو هەلەیە!

**کاوە:**

مادام وایە...

ئەو ئەگەر بێت

سەر چاومان بێت

ماڵ بە هاتنی ئاوایە!

**مادیا:**

ئەمە وایە!

PDF 4 KURD

**کاردا:**

**خۆشەویستی هەمووانی**

**پێ ڕەوایە!**

**مادام وایە...**

**ـ پشوویەك ـ**

"سارا دێتە ژوورەوە، کاسە دۆیەکی گەورەی بە دەستەوەیە لەگەڵ دەستەوارەیەك ناندا، کاوە لێی وەرئەگرێو لەبەر دەمی میوانەکاندا دای ئەنێت"

**سارا:**

**ئێوە میوانی ناوەخت بوون**

**گلەیی لە سەر خۆتانە،**

**کە بێ بەخت بوون**

**کاوە:**

**فەرموون... فەرموون**

"دەست ئەکەن بە خواردن، پشوویەك ئەخایەنێت"

"گوردۆ بە پەلە دێتە ژوورەوە ڕوو ئەکاتە هەمووان"

**گوردۆ:**

**ڕێبوارێکی ناسیاوم دی**

**بەرەو گردی سەروو ئەچوو،**

**شپرزە بوو، شڵەژا بوو،**

**کە لێم پرسی**

**چرپانی بە گوێما وتی:**

**لە بەندەکانی ناو زیندان**

**بەیانی زوو...**

PDF 4 KURD

شەش حەوتێکیان، هەڵواسیوە...

یەکێکیان کوڕی ئەو بووە!

لە گەڵ قسەدا فرمێسکی،

بۆم هەڵ ئەڕشت

بەدەم گریانەوە و ڕۆیشت

**کاوە:**

کوڕو ئەم شەوە هەر ئەبێ

بەسەر بچێ...

درەنگ بێ و زوو...

تۆ ئێشکی بەر دەرگا بگرە!

پاسەوان بە...

بە ئاگابە...

**گوردۆ:**

بەڵێ... بابە

نەك پاسەوان

بلێ... بمرە

"ئەیەوێ بچێتە دەرەوە کاوە بانگی ئەکاتەوە "

**کاوە:**

کوڕم... گوردۆ

ئەم بەردەستانەش... هەڵگرە

"گوردۆ بەردەستەکان هەڵ ئەگرێ و لە گەڵ خۆیدا ئەیانباتە دەرەوە"

**ـ پشوویەك ـ**

" تابلۆی بێ دەنگ هەموویان لە یەکتر نزیك ئەبنەوە، بە بێ دەنگی لە ناو خۆیانا دەست ئەکەن بە گفتو گۆ، لە ڕێی بزوتنەوەوە جوولآنەوەی دەست و دەم و چاویانەوە ئەوە دەر ئەکەوێ کە خەریکی دانانی پیلانی ڕاپەڕینن. ئەم هەڵوێستی بێ دەنگییە، تابلۆیەکی تایبەتییە و نیشانەی ئیش کردنی نهێنی و وریا بوونەوەیە، ماوەیەك ئەخایێنێت"

کاوە قۆناغی بێ دەنگی ئەشکێنێ و هەڵ ئەسێتە سەر پێ و ئەڵێت:

**کاوە:** "بە دڵنیایی و بڕوایەکی بە هێزەوە"

ئینجا، ئیتر قسەی زمان
لەگەڵ قسەی دڵا یەك کەوت
ئینجا ئیتر، دڵنیایی
خۆری بڕوای تەواو بەرکەوت
لە ئێستاوە، ڕۆژی هەستان
بەسەر دیلێتیا سەر کەوت
لە ئێستاوە، پاشە ڕۆژی
ڕووناکیمان هات و دەرکەوت

**ـ پشوویەك ـ**

خلّتەی درۆی ئەفسانەکان
تا دوێنێ مێشکی گرتبووین
نیزای ڕوو لە فریشتەکان
دەستی کردەوەی بەستبووین!
تا دوێنێ بوو لە کەژاوەی
جادووی دوژمنا نووستبوین!

**ـ پشوویەك ـ**

PDF 4 KURD

**کاردوخ:**

وا هەستاوین
گیانمان لەسەر لەپی دەستا
سەریش تا سەر لە پێناوین!

**مادیا:**

بڕیارمان تێکەڵ بە خوێنە
خوێنمان ئاوێتەی بڕوایە
بڕوامان وەك خۆر ڕووناکە
بەهاری ئاواتی تیایە،
ئەنجام سەری ئەژدەهاکە

**کاردا:**

ئەنجام... پاکە
ئەمرین بۆ ئەوەی دەغڵ و دان!
بە پیت تر بێ
شیری ناو دنکی پڕ تر بێ
ئەمرین بۆ ئەوەی کە ژیان
بۆ نەوەی هاتوو خۆشتر بێ
ئەمرین... بۆ ئەوەی کە مناڵ
بزەی لێوی بژی و نەمرێ
لە کۆشی گەرمی دایکێتی
ئیتر نەکرێ!

PDF 4 KURD

**کاوە:**

**ئەگەر مردین بەلەش ئەمرین**

**بۆیە ماڵ ئاوایی ناکەین**

**بۆیە ناگرین...**

**بۆیە فرمێسکی زەبوونی**

**هەرگیز ناسڕین...**

**ئەگەر مردین**

**ئەگەر لەم ڕێیەدا کوژراین...**

**لە پاش خۆمان...ئەمان بینن**

**بە گیان دەست لە ملتان ئەکەین**

**ئەژین لە ناو دەروونتانا**

**لە ناو بیلبیلەی چاوتانا**

**لە دەنگتانا...**

**لە هەڵبەست و وتارتانا...**

**لە پایزو بەهارتانا**

**ئێمە ئەژین لە گەڵتانا!**

**کاردوخ:**

**لە زەنگ ئەدەین**

**دەماری سڕ ئەبزوێنین**

**لە سەر لووتکەی بەرز، بانگ ئەدەین**

**گەل لە زۆردار ئەوروژێنین!**

**کوورەی ژیان ئەجۆشێنین**

PDF 4 KURD

ئەم دنیایە ئەخرۆشێنین

لە زەنگ ئەدەین

ئەبین بە با و تۆف و باران!

بە برووسکە، بە چەخماخەی

تیژی ئاسمان!

بۆ داگیرکەر، ئەبین بە ژان

ژانی مردن!

ژانی تەفر و تونا کردن!

**مادیا:**

پێشمان وتن، پشتمان کێیە؟

پشتمان کێوی ئاگرینە

بڕوای زیندووی ڕاپەڕینە

مەچەکی گشت هەژارێکی،

ترسناکە!

**کاردا:**

پشتمان هەموودوژمنێکی

ئەژدەهاکە!

**گوردۆ:** "گوردۆ دێتە ژوورەوە"

بابە شوانی ئاژەڵەکان

بەڕێوەیە هات بۆ لاتان!

**کاوە:**

هەر خۆیەتی؟

**گوردۆ:**

به تاقی تەنیا، خۆیەتی

" گوردۆ ئەچێتە دەرێ "

" کارون دێتە ژوورەوە "

**کارون:**

درەنگ... هاتووم

خۆم ئەزانم کە دوا کەوتووم

بەڵام، بێ دەنگ

دەستەوەستان،

دانەنیشتووم!

**کاوە:**

چیت کردووە؟

**مەردۆخ:**

چیت بیستووە؟

**کارون:**

ئەو دیوی شاخ هەموو پڕن

لە سەر تێزی ڕاپەڕینن

داخ لە دڵن

چاوەڕوانی دەرفەتێکن

چاوەڕوانی فەرمایشتی،

ڕابەرێکن!

PDF 4 KURD

**مادیا:**

**ئارام بگرن!**

**کاردا:**

**ئارام بگرن!**

**کارون:**

**ئارام ناگرن!**

**لەمە زیاتر خۆڕاناگرن!**

**ئێجگار پڕن...**

**کاوە:**

**بڕیارمان دا!**

**کارون:**

**چی بوو... بڕیار؟!**

**کاوە:**

**هەڵمەت بۆسەر قەڵای زۆردار**

**مادیا:**

**هاتنەدیی بڕیار نزیکە؟!**

**کارون:**

**چ ڕۆژێکە، چ کاتێکە!**

**کاردا:**

**زۆر نزیکە!**

PDF 4 KURD

**کاروخ:**

زۆر نزیکە!

**کارون:**

مژدەم بەنێ چ کاتێکە؟

**کاوە:**

لەگەڵ مردنی زستانا

کاتێ پشتی سەرما ئەشکێ

لە کوێستانا...

کاتێ گۆپکەی درەختەکان!

سەر دەرئەکەن!

کاتێ هەردو دەشت و نزار

بەرگی مژدەی، سەوزی ژیان

لەبەر ئەکەن!

کاتێ هوزار...

لە ئاسۆیەکی بەرینا،

لە شەقەی باڵی بەرز ئەدەن...

بۆ سەرەتای دیاری بەهار!

بەستە ئەڵێن...

**کاوە:**

چەندی ماوە بەری ئازار؟

چەند ڕۆژی تر...

پێ ئەنێینە وەرزی بەهار؟

PDF 4 KURD

**کاردوخ:**

هەر تەنها چوار

چوار رۆژی تر!

**مادیا:**

یا ئەوەتا ئەمساڵ بەهار

بەهاری سەرکەوتن ئەبێ

**کاردا:**

یان ئەوەتا مردن ئەبێ!

**کارون:**

مەبەست ژیانە یان مردن!

**ـ پشوویەك ـ**

کاری ڕاپەڕینتان بەش کرد!
ئەی من چیبکەم؟!

**کاوە:**

چمکی ئازایی و پیاوەتی
بە لادا کە!
بچۆرەوە بۆ شاخ و کێو
خەڵك هۆشیار کە
نووستو هەمووی، خەبەردار کە!

**کارون:**

جێگای یەکگرتنەوە کوێیە؟

**کاوە:**

کاردۆخ پێت ئەڵێ کە کوێیە

PDF 4 KURD

**کاردوخ:**

پێش ڕۆشتنت، خۆم ئەتبینم!

**کارون:**

وا من ئەڕۆم لە زەنگ ئەدەم

لە سەر لووتکەکان بانگ ئەدەم

بانگی ئازادی و جەنگ ئەدەم

**کاوە:**

بە سەرکەوتن!

**کاردوخ:**

بەسەرکەوتن!

**مادیا:**

بە سەرکەوتن!

**کاردا:**

تا کاتی بە یەك گەیشتن!

"کارون ئەچێتە دەرەوە"

**ـ پشوویەك ـ**

**مادیا:**

ڕۆژ درەنگ بوو ئێمەش بڕۆین

**کاردا:**

وا... چاکترە

**کاوە:**

پەلە مەکەن!

PDF 4 KURD

هێشتا زوو بوو...

**کاردا:**

کات درەنگ بوو...

**مەردوخ:**

هەستن بڕۆین... یەك لە دوای یەك

" هەڵ ئەسن و یەك لە دوای یەك ئەچنە دەرەوە "

" کاوە ماوەیەك بە بێ دەنگ هات و چۆ ئەکات "

لە دواییدا لە بەر خۆیەوە:

**کاوە:**

ڕاستە... ڕاستە

ڕێگەی ئەم هەڵمەتە سەختە

بەڵام ئەوەی ئەیدۆڕێنین...

هەر پێوەندە، هەر زنجیرە!

هەر کۆتی قاچ و گەردنە!

بە تەنیا تەوقی مردنە!

**ـ پشوویەك ـ**

" پشتکۆی هاوڕێی گوردۆ بە پرتاو خۆی ئەکات بە ژوورا "

**پشتکۆ:**

ئاگام لێ بوو

سێ چوار سەربازی ئەژدەهاك

گوردۆیان گرت

پێوەندیان کرد

PDF 4 KURD

بۆ زیندانی تاریکیان برد!

**کاوە:** "ئەشڵەژێ و لە پشتکۆ ئەچێتە پێشەوە و ئەڵێت"

کەی... کەی چۆن بوو...

گوردۆ تا ئیستە لێرە بوو

**پشتکۆ:**

وەکو وتم چاوم لێ بوو

لە پاش ئەوەی دەست بەستیان کرد

لە پاش ئەوەی تێریان لێدا

پێوەندیان کرد!

**کاوە:**

خۆ نەیان کوشت...؟!!

خوێنت نەدی؟!

**پشتکۆ:**

ئەوەی کە دیم هەر ئەوە بوو

کە پێم وتی!

"کاوە لە تاوا ئەکەوێتە لێو کرۆشتن، تەواو شپرزە ئەبێت، پشتکۆ قەیرێك ئەوەستێ و ئەچێتە دەرەوە"

"کاوە دێتە پێشی شانۆوە".

**کاوە:**

ئەمە حەوت کوڕ

حەوت کارەساتی جەرگ بڕ

ئەمە حەوت کوڕ!

PDF 4 KURD

ئارام ئیتر
چۆن ئەتوانێ... لەمە زیاتر
خۆی ڕابگرێ
تۆڵە، دان بەخۆیدا بگرێ
لەمە زیاتر، چۆن ئەتوانێ...
ـ پشوویەك ـ
لە پاش دوا كوڕ
لە پاش گوردۆ
چیم ما ئیتر
" روو ئەكاتە دانیشتوان "
ئێوە بڵێن... چیم ما ئیتر؟!
ـ پشوویەك ـ
بۆ سارێژی حەوت برینم
بۆ سارێژی هەزار زامی
دەم بە هاواری دێرینم
هێرش ئەبەم... لە گەڵ " گەل " ا
ڕائەچڵەكم...
ئەچمە گەرووی نەهەنگەوە...
تەنها... چەكم
چەكی بڕوای نەبەزینە
تەنها... ڕێگە... ڕاپەڕینە
ئامانج... سەری ئەژدەهاكە

**بەم مستانە ئەیپژێنم**

**ئامانج... کۆتی دیلێتییە**

**دای ئەماڵم.. ئەیپچڕێنم!**



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# تابلۆی حەوتەم

"جێگـا ژووری ئەژدەهاکـەو لـە سـەر تەختەکـەی دانیـشتووەو دوو پاسـەوان لـە پشتیەوە ڕاوەستاون وجادووگەریش لە بەردەمیا نووشتاوەتەوە"

**" مۆدۆن " ی جادووگەر:**

گەورەم هاتووم،سەر لە ڕێتم
قوربانی خۆڵی بەرپێتم...
فەرمایشتت لە سەر سەرم
فەرموو بڵێ و من نۆکەرم

**ئەژدەهاك:**

ئەوەی ئەیڵێم، ڕاست پێم بڵێ!

**مۆدۆن:**

بەڵێ گەورەم، فەرموو بڵێ

**ئەژدەهاك:**

درۆ کردن،
لە گەڵ منا، واتە مردن،
مل هەڵکێشان، سەر پەڕاندن
تێ گەیشتی!

PDF 4 KURD

**مۆدۆن:**

تۆ بمێنی و پایەدار بی

بۆ ئێمە گەورەو و سەردار بی

هیچمان ناوێ...

سەرمان ناوێ، ماڵمان ناوێ

تەنها هەر تۆ شکۆدار بی...

**ئەژدەهاك:**

خەوم دیوە!

**مۆدۆن:**

خەو هی تۆ بێ، فریشتەکان

ئینکی... سمکان

دڵنیام چۆنیان نووسیوە

فەرموو... قوربان

"ئەژدەهاك هەڵ ئەسێت و دەس ئەکا بە گێڕانەوە"

**ئەژدەهاك:**

لە خەوما بوو، نەك بە ڕاستی

لە جێگەی گوڵ، دڕکم ئەچنی

دەست و پەنجەم، خوێناوی بوو

بەری دنیا تەماوی بوو...

دارم ئەدی، هەر بە سەوزی

وشکی ئەکرد!

قەلاّم، کۆشکم، چۆڵ و هۆڵ بوو

PDF 4 KURD

گڕی ئەگرت
ئەمویست هاوار بکەم...بڵێم...
بەڵام دەنگم دەر نەئەهات
ڕەوەگورگ ئەهاتنە سەر ڕێم...
خۆر گیرابوو هەڵ نەئەهات
لە ناکاوا شتێکی ڕەش،
جانەوەرێ، هاتە خوارێ
دەستی دامێ... فڕانمی
توونگ گرتمی...
تا ئاسمانی سەر بردمی!
ـ پشوویەك ـ
بەڵام خەو بوو
کاتێ چاوم کردەوە، کات:
نیوە شەو بوو...
ـ پشوویەك ـ
تۆ ئەڵێی چی... بۆ ئەم خەوە؟!
ڕاست پێم بڵێ
"جادووگەر پاش بیرکردنەوە"
**مۆدۆن:**
گەورەی دنیا، پاشای جیهان
سێبەری گشت فریشتەکان
خەوتان مایەی خۆش بەختییە

PDF 4 KURD

نیشانەی بەرزی سەرتانە

دوور لە تەنگانەو سەختییە

لێك دانەوەی بە دڵتانە...

**ئەژدەهاك:**

چۆن بە دڵمە؟...

**مۆدۆن:**

گوڵ لە خەودا ئەبێ بە دڕك

دڕكیش بە گوڵ!

خوێن ئاشتیە!

ئاشتی ناو دڵ!

تەم: ڕووناكی و ئاوەدانی

گڕ:قوربانی

گورگ: هێزە بۆ سەركەوتن

یان نەمردن!!

خۆر لە خەوتا كە هەڵ نەهات

مژدەیەكە بۆ ژیانێكی

پڕ فەڕوو هات!!

**ئەژدەهاك:**

باشە... باشە

ئەی ئەو جانەوەرە ڕەشە

بۆ باس ناكەی فڕانمی

تونگ گرتمی...

PDF 4 KURD

هەڵی گرتم، تا ئاسمانی،

سەر بردمی؟!!

جادووگەری چاو پڕ لە فێڵ...

ڕاست پێم بڵێ...

ڕاست پێم بڵێ...

**مۆدۆن:**

بەڵێ... بەڵێ

گەورەم... بەڵێ

ئەو جانەوەرە ڕەنگ ڕەشە

فریشتەی هەموو ئاسمانە!

هەر چەند ڕەشە!

بەڵام لە دەروون و دڵا

رووناك...گەشە!

هەرچەند بە ڕوو ترسناکە

بەڵام مژدەی ئاسایشە

ئاسایش بۆ،

ژیانی تۆ، بۆ تاجی تۆ

بۆ تەختی تۆ!

ـ پشوویەك ـ

فڕاندنیش... بەرەو ئاسمان

مانای ئاواتە بۆ ژیان

وەرگرتنی مژدەیەکە

PDF 4 KURD

یان هاتنە دی خۆزگەیەکە

زۆر دەمێکە

شای گەورەمان، پەرۆشێتی

خولیای دەروون و هۆشێتی!

**ئەژدەهاك**: "بە پەلە"

زوو پێم بڵێ

کام مژدەیە؟

کام خۆزگەیە؟

زوو پێم بڵێ...

**مۆدۆن:**

داری زڕت ئەژێتەوە

پەل ئەهاوێ، ئەڕوێتەوە!

بەری هیوا و ئاوات ئەگرێ

پاشای گەورەمان ئەژدەهاك

کوڕی ئەبێ!!

**ئەژدەهاك**: "بەسەر سوڕمان و خۆشیەوە "

کوڕم ئەبێ؟

کوڕم ئەبێ؟

**مۆدۆن**: "بە دڵنیاییەوە"

بەڵێ گەورەم هەرگیز ساڵێ

وەرناگەڕێ

کوڕت ئەبێ

**ئەژدەهاك:** "بە پێکەنینەوە... ڕوو ئەکاتە یەکێك لە پاسەوانەکان "

بڕۆ بڵێن ... با خەزنەدار

لە بەردەمما ئامادە بێ

هەر ئێستە بێ

" پاسەوانەکە بە پەلە ئەچێتە دەرەوە "

**ـ پشوویەك ـ**

" خەزنەدار و پاسەوانەکە دێنە ژوورەوە، خەزنەدار ئەنووشتێتەوە "...

**خەزنەدار:**

قوربان... هاتووم سەر لە ڕێتم...

**ئەژدەهاك:**

گوێ بگرە لێم:

لە گەڵ خۆتا...

جادووگەری ڕاستگۆ بەرە

ڕێزی بگرە

بە پارسەنگی قورسایی خۆی

زێڕی بەرێ...

هەر ئیستاکە، دوا نەکەوێ!

**خەزنەدار:**

بەڵێ گەورەم... بەڵێ گەورەم...

"لە گەڵ جادووگەرا ئەچێتە دەرەوە"

**ئەژدەهاك:** "لەبەر خۆیەوە"

کوڕم... ئەبێ

PDF 4 KURD

ئەژدەهاکی بچووك ئەبێ

کوڕم ئەبێ

گرێی دڵی دەیان ساڵم

ئەکرێتەوە...

داری زڕم ئەژێتەوە

کوڕم ئەبێ

ئەژدەهاکی بچووك ئەبێ!

"پاسەوانێك دێتە ژوورەوە و ئە نوشتێتەوە"

**پاسەوان:**

گەورەم،گۆتۆی سەر لە شکری

ئازا و نەبەرد، گەیشتە جێ

ئامادەیە و ئەو ئەیەوێ

بێتە بەر تەختی بزورگتان

بێتە لاتان...

**ئەژدەهاك:**

با خێرا بێ

"پاسەوانەکە ئەچێتە دەرەوە گۆتۆی سەرکردە دێتە ژوورەوە"

" ئەنووشتێتەوە "

**گۆتۆ:**

دەست لە سەر سنگ، کڕنووش بردوو

ئامادە بو...

لە بەر دەمی شای گەورەدا...

PDF 4 KURD

راوەستام... تا فەرمانی

بنێمە سەر هەر دوو چاوم

خۆمی بۆ بکەم بە قووربانی

**ئەژدەهاك:**

گۆتۆی ئازا خۆشیت هانی!

تۆ بڕبڕەی پشتی منی،

گەورەی گشت سەرکردەکانی

تۆ جێی بڕوای ئەژدەهاکی

پشتیوانی قەڵا و کۆشکی

**گۆتۆ:**

گیان لە سەر دەست چاوەڕوانم

سەر بەردە بازی فەرمانم...

فەرمانێ بۆ مردنیش بێ

من بە ئاهەنگی ئەزانم!

**ئەژدەهاك:**

لەلای گۆتۆ، دەنگ و باسی

چەتە و یاخی،

ناو شاخەکان چۆن چۆنییە؟

هەواڵ چییە!

**گۆتۆ:**

هەواڵ مژدەی سەرکەوتنە

ڕێ لە یاخی بوو گرتنە..

PDF 4 KURD

تیرەکانمان...

پەیکانی سەر ڕمەکانمان!

نە خواری کرد، نە سەری کرد

یەك یەك نیشانەی تەواوی،

خۆیانیان گرت

لە یاخی بوو زۆریان کوژران

بە دەست بەستەش گەلێ گیران

**ئەژدەهاك:**

هێناو تانن...

لە گەڵ خۆتان؟!

**گۆتۆ:**

لە زیندانان!

**ئەژدەهاك:**

لە چەتەکان...

هیچیان ماون، هیچیان دەرچوون؟

**گۆتۆ:**

هەر ئەوەندەی پەنجەی دەستن

ئەو کەمەشیان تەفروو توونان!

پشت بە یەکتر نابەستن

لە دوای گەڕانەوەم، داومان

ناوەتەوە... بیان گرن

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

**لە ئەنجاما چی ترتان کرد؟!**

**گۆتۆ:**

**دڵنیا بووین.. گەڕاینەوە**

**خۆمان سەرکەوتوو ماینەوە!**

**ئەژدەهاك:**

**ئەی ژمارەی کوژراوی تۆ؟**

**گیراوی تۆ؟**

**گۆتۆ:**

**کوژراوی من، تەنها دە بوون**

**گیراو... نەبوون!**

**" ئـەژدەهاك هـەڵ ئەسـێتە سـەر پـێ، کـەمێ هـات و چـۆ ئـەکات، دوایـی بـە تووڕەییەوە ئەڵێت:"**

**ئەژدەهاك:**

**دڵم خەریکە لە گۆتۆش،**

**کرمێ ئەبێ...**

**من وام نەویست، من وام ناوێ**

**هەموو... هەموو...**

**ترسنۆك بون!**

**سەرکردەی ئازا پێم ئەڵێ!!**

**لە یاخی بوو هەندێ دەرچوون**

**لێشیان کووشتوون!!**

واته... ماون... نەفەوتاون!

کەچی پێم ئەڵێ... سەرکەوتوون!

چۆن سەرکەوتوون؟!

چەند سەگێکی خوێڕی کێوان

گۆتۆی سەرکردەمیان بەزان!

چاك سەرکەوتوون!!

**گۆتۆ:**

گەورەم، نەبەزیوین، بەڵام...

**ئەژدەهاك:**

بەڵێ... بەزین

من وا ئەڵێم... ئێوە بەزین

ئێوە هەموو... ترسنۆکن!

ئێوە ڕێوین!

ـ بەڵام ـ ی چی!

لە شکرێکی هەزار کەسی!

لەش زرێ پۆش،

تێر و پۆشتە...

هەندێ برسی!

لێی بکوژێ!

واتە... بەزی!

**گۆتۆ:**

گەورەم، وتم، ئەوەی ماون



PDF 4 KURD

به ڕێگەوەن ڕوو لە داون
هەر ئەوەندەی پەنجەی دەستن!
هاكا... كەوتن
هاكا... لەبرسانا مردن!

**ئەژدەهاك:**

هەر وا ئەبێ درۆ كردن!

**گۆتۆ:**

بەڵێن ئەدەم بە شای گەورە
گەورەی لەشكر
بەڵێنی پیاو
تەنها ماوەی دە رۆژی تر!
مۆڵەتم با...
ڕێگەی گەشتێكی ترم با...
برینی كۆن سارێژ ئەكەم
لە یاخی بوو... ئەوەی ماوە
یەك... یەك
وەك... سەگ
لە بەرپێتا... ڕایان ئەگرم
پەتیان ئەكەم...
پاشای گەورەم، داوا ئەكەم
مۆڵەتم بە...

**ئەژدەهاك:**

دە رۆژ زۆرە...



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**مۆڵەتی من هەفتەیەکە!**

**ـ پشوویەک ـ**

**"لە سەر قسە کردن ئەڕوات"**

**بەڵام بەزەیی پێشێل کە!**

**ڕق... بڕوێنە...**

**خۆشەویستی درووێنەکە!**

**دەغڵ و دانیان...**

**خۆیان و ماڵ و منداڵیان...**

**بەیەکەوە... بسووتێنە...**

**من وام ئەوێ!**

**گۆتۆ:**

**بەڵێن ئەدەم**

**شای گەورەمان چۆنی ئەوێ**

**من وا بکەم!**

**ئەژدەهاک:**

**سبەی بەر لەوەی خۆر هەڵبێ...**

**بارەگای شەڕ ئامادە بێ**

**بۆ کەوتنە ڕێ...**

**دوای هەفتەیەک، تاقە یەکێ،**

**لەو یاخی بووانە...نەمێنێ...**

**من وام ئەوێ**

**گۆتۆ:**

**بەڵێن ئەدەم بە شای گەورە**

**یان وا ئەبێ، یان ئەم سەرە**

**بۆ خاك ئەبێ**

**ئەژدەهاك:**

**من وام ئەوێ!**

**گۆتۆ:** "لە دوای قەیرێ ڕاوەستان بە ترسەوە"

**بەڵام شای گەورە ئەزانێ**

**کلك...ناتوانێ**

**بێ سەری مار لە ناوا بێ!**

**سەر تیا بچێ!**

**هەموو شتێ دا ئەمرکێ!**

**هیچ نامێنێ!**

**ئەژدەهاك:**

**ئا بەو شێوەیە ڕسوا بوون...**

**دەر بە دەر بوون**

**خۆی کوشتنە...**

**تازە ژیانی فەرەیدوون**

**هەر مردنە...**

**لەگەڵ ئەوەشدا گەڕانمان**

**بۆ شوێنی ئەو...**

**بۆ خوێنی ئەو!**



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

هەر لە دووی سۆراخ کردنە

دەس هەڵ ناگرین!

**گۆتۆ:**

جێگەی ونە...ڕێگەی ونە

**ئەژدەهاك:**

چارەنووسی هەر مردنە

- پشوویەك -

بەڵام نیازی ئەبێ چی بێ

بە هیوای چی...

ئەخوا و ئەژی...

من تێ ناگەم... تۆ ئەڵێی چی؟!

**گۆتۆ:**

ئەیەوێ کڵاوی با بردووی

بگرێتەوە؟

ئەیەوێ خەوی ڕابردووی

دوێنێی مردووی

تاجی ون بووی

تەخت و بەختی لە دەست دەرچووی

بۆ بێتەوە...

لە پاش ڕزین... داری هیوای

بەرگرێ و بشنێتەوە...

جارێکی تر بژێتەوە

PDF 4 KURD

ئەژدەهاك:

مەحاڵە... بیبینێتەوە...
ئەبێ تا ماوە فەرەیدوون
بەو داخەوە بتلێتەوە!
ـ پشوویەك ـ
" لە سەر قسە کردن ئەڕوات "
دوا هەواڵی... نهێنی زان
وای ڕاگەیان...
کە فەرەیدوون...
وا لە ناوچەی پیرەمەگروون...
چاوەڕوانین...
دڵنیا بین
ئەوسا خۆمان ئامادە کەین
لە ناکاوا... بە سەریا بەین
ـ پشوویەك ـ
بەڵام کە گرتم، نای کوژم!
ئەیکەم بە پەنگ...
بە دنیادا ئەیگەڕێنم...
ئا لێرەدا... لەم شوێنەدا...
شا فەرەیدوون...
وەکوو مەیموون...
بۆ گاڵتە... هەڵ ئەپەڕێنم!

PDF 4 KURD

**گۆتۆ:**

ڕسوا بوونی پیلانێکه
هەر ساتێکی مردنێکه
**ـ پشوویەك ـ**
سەرم بەرز و گەورەم ئەکەی
ئەگەر گۆتۆی جگەر سۆزتان
بۆ گرتنی بە ڕێ بکەی!
مایەی شانازی ژیانمە!
کاری وەها بە من بکەی...

**ئەژدەهاك:**

پەلە ناکەین... بە هێمنی
داو ئەچنین بۆ گرتنی
تۆ... بەیانی
بۆ گەشتی تەمێ کردنی
دوا جاری یاخی بوو... بڕۆ
من هەر ئەوەم ئەوێ لە تۆ!

**گۆتۆ:**

پاشای گەورە... دڵنیابێ
بەڵێنی ئەمجارەی گۆتۆ
ڕوو ڕەش... نابێ

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

من هەر ئەوەم ئەوێ لە تۆ

**ـ پشوویەك ـ**

تۆش بزانە چارەنووسی

ڕەش یان سپی!

بۆ من و تۆ...

وەك یەك وایە... بە تەنیا نین

لە یەك جیا نین

**گۆتۆ:**

چارەنووسی ڕەش گۆڕ ئەكەین

بە دەستی هێز!

دەرگای نووشوستی مۆر ئەكەین

دوژمنی تەختی ئەژدەهاك

سەرشۆڕ ئەكەین!

**ئەژدەهاك:**

گەر وا نەكەین

گوناه ئەكەین

**ـ پشوویەك ـ**

"پاسەوانی بەر دەرگا دێتە ژوورەوەو ئەنووشتێتەوە"

**پاسەوان:**

لۆلۆی وەزیری دەستە ڕاست!

لۆلۆی خزم و جگەر سۆزتان

PDF 4 KURD

داوا ئەکات

بێتە بەر تەختی بزورگتان

بێتە لاتان..

**ئەژدەهاك:**

با ئێستا بێ

با خێرا بێ!

" پاسەوان ئەچێتە دەرەوە "

" لە سەر قسە کردن ئەڕوات "

سەری ماری سڕ بووی بێ تین

لە گیانەلاَوی مەرگ دایە...

هەرگیز ناگاتەوە هاوین!

**گۆتۆ:**

زستانی سەختی بێ ئامان

بەستەڵەکی چیا و کوێستان

ڕەحم ناکەن!

ڕێگەی پیاوی کەوتوو نادەن!

"لۆلۆی وەزیر دێتە ژوورەوە و ئەنووشتێتەوە"

**لۆلۆ:**

ڕۆژی... ڕووناك...

دڵی... ڕووناك

شا ئەژدەهاك...

PDF 4 KURD

لۆلۆ لە بەر تەختی ئەوا!

دەست لەسەر سنگ ڕاوەستاوە

کڕنووش ئەبا!

چاوەڕوانی فەرمایشتی!

گەورەی ئەکا...

**ئەژدەهاک:** "ڕوو ئەکاتە گۆتۆ "

خۆشیم داوایە بۆ لۆلۆ

**گۆتۆ:**

پشت و هێزی کۆشکە لۆلۆ!

"ڕوو ئەکاتە لۆلۆ"

**ئەژدەهاک:**

دەنگ و باسی لای تۆ چییە؟

**لۆلۆ:**

ئەوەی هەشبێ!

شایەنی باس کردن نییە!

بێ بایەخن!

**ئەژدەهاک:**

ئەگەر بایەخیشی نەبێ...

تۆ هەر بیڵێ...

**لۆلۆ:**

ناحەزانی کۆشکی پاشا

چەند برسی و گێرەشێوێنێ

PDF 4 KURD

ڕۆژی... دوێنێ...

لە ناو خەڵکا...

کەوتبوونە قاو داخستن

قسەی بێ جێ و بێ ڕێ کردن...

دوای پشکنین...

هەشت نۆ دەیەکمان لێ گرتن

ئێستا لە زیندانا بەندن!

**ئەژدەهاك:**

نەتان کوشتن؟!

**لۆلۆ:**

پەلە ناکەین... هەتا ئازار

هەتا زەبری قامچی و دار

نهێنیان ئەخاتە ڕوو...

ئەوساش... کووشتن!

خەڵاتیانە بۆ زوو مردن!

**ئەژدەهاك:**

زۆر بەدڵمە... زۆر بە جێیە!

**گۆتۆ:**

پیلانێکی ورد و نوێیە...

گەورەم... لۆلۆ...

عەقڵی دانای کۆشکی تۆیە...

**ئەژدەهاك:** "ڕوو ئەکاتە لۆلۆ"

PDF 4 KURD

**وتت قسەی بێ جێ و بێ ڕێ ئەکەن**

**قاو دا ئەخەن...**

**خەڵك هان ئەدەن...**

**قاو... وەکوو چی؟!**

**چیان ئەوێ؟!**

**لۆلۆ:** "لە پاش دوو دڵی و سڵەمینەوەیەك"

**گەورەم ئەڵێن**

**وەکوو... ئەڵێن!**

**نانیان... ئەوێ**

**لابردنی باجیان ئەوێ**

**ئەژدەهاك:** "بە گاڵتەوە"

**تاجیان ناوێ؟!!**

**ـ پشوویەك ـ**

**گۆتۆ:**

**زیندان و مردنیان ئەوێ**

**ئەژدەهاك:** "بەڕقەوە"

**ئەیان... ناسم!**

**ماڵ بە ماڵ ئەیان سووتێنم**

**یەك بە یەك هەڵیان ئەواسم!**

**چیم لێ کردوون؟**

**دەستم گرتوون؟!**

**برسییانە...**

PDF 4 KURD

پێیان بڵێ
کێ تا ئەمڕۆ لە برسا مرد؟!
ـ پشوویەك ـ

**گۆتۆ:**

گەورەم تا خۆم
هەتا لەشکری سبەینێم
ئامادەکەم، ڕێم کە، بڕۆم!

**ئەژدەهاك:**

تۆ... سەربەستی...
ئەڕۆی... بڕۆ...
بەلاّم بە دڵ چاوەڕوانین
مژدەی سەرکەوتنی گۆتۆ
زوو وەرگرین...

**لۆلۆ:**

هەتا ئێمەش ئامادە بین
پاش هاتنەوە، پاش سەرکەوتن
ئاهەنگی خۆشی بگێڕین
چاوەڕوانین...

**گۆتۆ:**

پاشای گەورە، لۆلۆی دانا
لە ئێستاوە،دڵنیا بن
کە سەر کەوتن

PDF 4 KURD

وا له دەست و هێزی منا!

"گۆتۆ ئەنووشتێتەوە و ئەچێتە دەرەوە"

**ـ پشوویەك ـ**

"ئەژدەهاك ماوەیەك بە بێ دەنگی هات و چۆ ئەكات"

**ئەژدەهاك:**

كێن ئەوانەی گرتووتانن؟!

**لۆلۆ:**

چەند... كەسێكی

دۆست بە كوشتن و تاوانن!

**ئەژدەهاك:**

ناوم... ئەوی!

ناو... نازانن؟!

**لۆلۆ:** "پاش تۆزێ بیركردنەوە"

ئەوەی بیرمە!

یەكێكیان ناوی گوردۆیە

كوڕی كاوەی ئاسنگەرە!

**ئەژدەهاك:**

گوردۆ... گوردۆ

وەچەی شەڕە!

لە نەژادی خێزانێكی دەربەدەرە!

**لۆلۆ:**

لە پارەوە هەتا ئەمڕۆ

PDF 4 KURD

له کوڕانی کاوە... شەشیان
گیران... کوژران
بەڵام دیارە... عاریان نەنا،
وەك خۆیان وان!
**ئەژدەهاك:**
تەنیا... کوشتن!
ڕێگایە بۆ تەمێ کردن!
دوا وەچەی شەڕ
ئەمشەو ئەبێ لە ناو بەرن
کاوەش بگرن!
**لۆلۆ:**
گەورەم ئەگەر کاوەش بگرین
ئەبێ ئیتر دۆش دامێنین!
**ئەژدەهاك:** "بەسەرسوڕمانەوە"
دۆش دامێنین؟!!
**لۆلۆ:**
بەڵێ... گەورەم
تەنیا ئاسنگەر بزانێ
یان بتوانێ
کە تیر و ڕم
دروست بکا... هەر کاوەیە
ئەو ئاسنگەری شارەزای!

PDF 4 KURD

**ئەم ناوەیە!**

**چۆنی بگرین؟!**

**ئەژدەهاك:** "پاش قەیرێ ڕاوەستان"

**گەر ئەو نەما پەك ئەکەوێ؟!**

**لۆلۆ:**

**هۆمان هەر ئەبێ تێی کەوێ!**

**بەڵێ...گەورەم**

**گەر ئەو نەبێ...**

**دڵنیام لەوەی پەکمان ئەکەوێ...**

**دا ئەمێنین!**

**ئەژدەهاك:**

**کەواتە جارێ ناچارین**

**چاو بپۆشین**

**لۆلۆ:**

**بەڵێ... گەورەم...**

**پێویست ئەکا... کاوە نەگرین**

**چاکتر وایە....ئارام بگرین**

**وەکوو فەرمووت، چاو بپۆشین!**

**ئەژدەهاك:** "لە پاش قەیرێ بیر کردنەوە"

**مادام وایە...**

**جارێ گوردۆش هەر مەکوژن!**

**با هەر بەندی ناو زیندان بێ!**

PDF 4 KURD

لەشی خۆراکی لێدان بێ

لە ناو بردنی... هەڵگرن...

بۆ ئەوکاتەی پێتان ئەڵێم...

هەتاکوو خۆم قسە ئەکەم!

**لۆلۆ:**

بەڵێ گەورەم!

تۆ چۆن ئەڵێیت من وا ئەکەم!

**ـ پشوویەك ـ**

"پاسەوانی بەر دەرگا دێتە ژوورەوە و ئەنووشتێتەوە"

**پاسەوان:**

گەورەم... پاشا

شاژن پیاوێکی ناردووە

بە پەلە ڕای سپاردووە!

داوات ئەکا...

**ئەژدەهاك:** "هەڵ ئەسێت و بە شپرزەییەوە"

بە پەلە داوای من ئەکا؟!

**پاسەوان:**

بەڵێ... گەورەم... داوات ئەکا

" بە شڵەژاوییەوە ئەژدەهاك و لە دوایەوە لۆلۆ و پاسەوان ئەچنە دەرەوە"

PDF 4 KURD

# تابلۆی هەشتەم

"جێگا دوکانەکەی کاوەی ئاسنگەرە، کات بەیانییەکی زووە، "پشتکۆی" هاوڕێی گوردۆ، لە دوای گرتنی گوردۆ بۆتە شاگردی کاوە، تازە دوکانەکەی کردۆتەوە و خەریکی ڕێکخستنی کەرەسەی ئیشە، پاش ماوەیەك بێ دەنگی، بە دەنگی بەرز لە بەر خۆیەوە ئەڵێت:"

لە گەڵ دڵی شێت و وێڵما
هەرد و دۆڵ و لووتکە نەما
نەیپێوم و پیا نەگەڕێم
تا دەوەن و دارێ نەما
نەمناسن و نەزانن کێم!
هەتا ئەژنۆ شل بوو گەڕام
تا سنوورێك، خەیاڵ ئەیدی
گەڕام...ڕۆشتم
بەڵام ئەنجام... نەگەیشتم...
بەو دنیایەی کە من ویستم
ـ پشوویەك ـ
سەردەمێکی تر هات و چوو
هەر ئاوارە، هیلاك.. وێڵ بووم

PDF 4 KURD

به دووی ئاراما.. شەوکێڵ بووم
سەر هەڵگرتوو..
لە ناو باوەشی سروشتا
ئەگەڕام بە شوێن بەهەشتا
بەڵام ئەنجام تێگەیشتم
کە لەوێشدا خۆمم نەدی..
خۆم نەناسی!
**ـ پشوویەك ـ**
سەردەمێکی تری تەمەن
بۆ خوای دادپەروەری گەڕام
تا لەدیلی ڕزگارم کەن..
تا بگەمە ڕۆژی ئەنجام
کڕنووشم برد!
مانگم پەرست، خۆرم پەرست
دەریام پەرست، گڕم پەرست
بەڵام ئەنجام هەر وێڵیی بوو
هەر تاریکی، هەر دیلی بوو
**ـ پشوویەك ـ**
سەردەمێکی تر چاوی یار
باڵای شۆخ و شەنگی نازدار
ئاواتم بوون، خولیای گیان بوون
هەوێنی هەموو ژیان بوون

PDF 4 KURD

بەلآم ئەنجام... نەگەیشتم
بەو هیوایەی کە من ویستم
ـ پشوویەك ـ
بەلآم لە گەڕان نەکەوتم
ورەی ئاواتم بەر نەدا!
هەتا بە ئارام گەیشتم
تاکوو کۆڵم بە دیلی دا
تا وێڵ بوونم بە قۆناغی
ئاوەدانیی ڕێگە گەیاند!
هەتا نا ئومێدی و ئاخی..
سەر گەردانیم لە دلآ مرد!
ـ پشوویەك ـ
بیری ئازادیم دۆزییەوە..
خۆم پێ ناسی..
خۆی پێ ناسیم!
ڕوناکترین ڕێم بینییەوە..
سەرکەوتنی ژینم تیا دی..
زانی من کێم!
لە کوورەیا خۆم توانەوە
تا لەگەڵیا ژیامەوە...
ـ پشوویەك ـ
لە ئینسانی دەور و پشتما

PDF 4 KURD

لە چوار دەورما!
لە چاوی برسی و هەژارا!
خۆمم بینی..
لە گەردەلوولی ئازارا...
لە گەڵیانا شەوم بڕی
لە خۆشەویستی ئەوانا...
بەهەشتم دی
کاوەم ناسی، گوردۆم ناسی!
کوردم ناسی!

**ـ پشوویەك ـ**

"کاوە بە جلی کارەوە دێتە ژوورەوە"

**کاوە:**

جێگەی گوردۆم...
قەت ون نابێ...
هەتا پشتکۆم...
لەگەڵا بێ!
هەتا لەم چیا و کەژەدا!
تاقە کوردێ سەر بەرز مابێ
ڕێم ڕووناکە...
ئەو... گوردۆیە...
خاکیش دایك و بڕواش باوکە

PDF 4 KURD

**پشتی ڕاپەڕینم ئەگرن!**

**پشتکۆ:**

**نەك هەر تەنها بۆ ئیش کردن**

**وەك شاگردی ئاسنگەرێ**

**وەکوو شاگردی باوەڕێ...**

**لەگەڵ تۆدام هەتا مردن**

**کاوە:**

**شاگردانی ڕێی سەربەستی،**

**ئەو لەشکرەن!**

**چۆك بە ژێردەستی، دا ئەدەن**

**بۆ سبەینێی بەختیاریش**

**بەهاری ئاوات و مژدەن**

**ـ پشوویەك ـ**

**پشتکۆ:**

**گشت... شاگردان...**

**هەموو... مەردان!**

**تینووین... تینووی... ڕۆژی هەستان**

**چاوەڕوانی.. بانگێ... ئەکەین**

**هەتا بە خوێن...**

**گڕی سەرفرازی خۆش کەین**

**کاوە:** "پاش قەیرێ بیرکردنەوە"

**ناگاتەوە... ڕۆژێکی تر**

PDF 4 KURD

یان ئەوەتا... کڵپەی ئاگر
بۆ سەرکەوتن... بەسەر شەوا
ئەکەینەوە...
یان ئەوەتا... ئەبێ ئیتر!
نەڵێین پیاوین...

**پشتکۆ:** "بە خۆشییەکەوە، نزیکی کاوە ئەکەوێتەوە "
ئەی من... وەستا!
منیش خوێنم... گیانم... دڵم
وا لەبەر و لەپی دەستما
منیش ئامادەم بجەنگم،
لەگەڵ تاریکی و مردنا...
ئەی من... وەستا!
ئەی من چی بکەم... لەگەڵتانا

**کاوە:**
گوێم... لێ بگرە:
هەر ساتێ من کەوتمە ڕۆشتن!
شوێن پێی هەنگاوم هەڵگرە
یان پێکەوە دەست ئەکەینە،
ملی مردن...
یان سەرکەوتن
- پشوویەك -

PDF 4 KURD

**پشتکۆ:**

به دوای وەستای خۆشەویستا

به دوای تیشکی سەربەستیتا

به شوێن پێی ئازادی ویستا

چەندن ژمارەی ئەوانەی،

سووتەمەنی ئاگری جەژنن؟!

**کاوە:**

هەزارانن!

**پشتکۆ:**

تەنها، خەڵکی پێدەشت، شارن؟!

**کاوە:**

له شارەوە هەتا لووتکەی،

هەتا پلەی سەختی کێوان

تا نزاری چڕ و بێشەی

ساردی کوێستان!

**پشتکۆ:** "له دوای بێ دەنگییەك"

بەڵام... وەستا!

ئەمڕۆ ژیان سارد و سڕە

جووڵە کەمە... دنیا کڕە...

دەنگ نابیسم... له هیچ لایەك

تا شەقەی باڵی... باڵندە!

هەتا جووڵە و شنەی بایەك

PDF 4 KURD

**کاوە:**

لە پێش گەرداو هەڵکردنا...

لە پێش شەپۆلی مردنا!

دەریا ماتە، ئاسمان شینە

ئەوەی بێ خەم بێ زەمینە!

لە بێ دەنگی وا بترسە!

لە پێش گەرداو هەڵکردنا!

**پشتکۆ:** "لە دوای کەمێ بیر کردنەوە"

ئەوەی ویستم...

ئێستا بە دڵ تێگەیشتم...

**ـ پشوویەك ـ**

"لە سەر قسە کردن ئەڕوات"

باشە... بازاڕی ئیش کردن

ئەمڕۆ بۆ کێ؟

ئەکەوێتە قۆڵ کوتاندن

کوورە بۆ کێ ئەدەمێنین؟

ئارەق بۆ... چی... ئەڕژێنین؟

بۆ داس.. یان بۆ تیر و کەوان؟

بۆ بێڵ... بۆ پاچ؟

یان بۆ نووکی تیژی پەیکان؟!

**کاوە:**

هیچ... کامێکیان!

PDF 4 KURD

**پشتکۆ:**

چی تر ماوە!

**کاوە:**

چەکوش ماوە!

هێزی دەستی هێرش ماوە

**پشتکۆ:**

کەواتە ئێستە ئیش ئەکەین؟!

**کاوە:**

هەتاکوو مردن ئیش ئەکەین...

ئیستاش ئەبێ،

چەکوش فریای دەستی بڕوای

ڕاپەڕینی هەڵمەت بخەین!

پەلە... بکەین

پێش چێشت هەنگاو

ئاسن لە بووتەی کوورەدا،

ئەکەین بە ئاو...

هەتا چەکوش دێتە بەرهەم

دەست هەڵ ناگرین!

**پشتکۆ:**

ئارەقی ماندوێتی ناسڕین

دەست هەڵ ناگرین

هەتا چەکوش دێتە بەرهەم

PDF 4 KURD

وچان نادەین

چەكوش فریای دەستی بڕوای

هەڵمەت ئەخەین!

وەستا... لەگەڵتا... ئامادەم!

بەڵێن ئەدەم...

بەڵێنی پیاو كە نەسرەوم!

هەتا چەكوش دێتە بەرهەم...

من ئەوەندە تێگەیشتووم!

بۆ ئامانجی گەل ئیش ئەكەم...

لە خۆبوردووم!

**كاوە:**

ئەم چەكوشە!

یان چەكوشێك ئەبێت ناوی

ئەچێتە ناو، ناوی زیندوو

پشت لە دوای پشت بۆ شانازی

باسی ئەكەن نەوەی هاتوو

یان ئەوەتا ئەمیش ناوی،

كوێرەوە بووی مێژوو... ئەبێ،

وون و مردوو!

ـ پشوویەك ـ

"لە تابلۆیەكی بێ دەنگیدا كە ماوەیەك ئەخایێنێت دەست ئەكەن بە ئیش كردنێكی بێ وچان و ئارەق ڕشتنێكی سەختی ماندوو بون بۆ دروست كردنی چەكوشی ئازادی و ڕاپەڕین"

PDF 4 KURD

"دوای لێبوونـــەوە و دروســـت كردنـــی چەكوشـــەكە، بـــەدەم هەناسەســـواربوونی ماندوێتییـەوە " كـاوە " چەكوشـەكە ئـەگرێت بـە دەسـتەوە و لێـی ورد ئەبێتـەوە و " پشتكۆ " ش لە كاوە نزیك ئەبێتەوە و چاوەڕوانی ئەوە ئەكات كە چی ئەڵێت"

**كاوە:** "لەگەڵ چەكوشەكەیەتی"

مایەی ڕەنجی بێ پشوودان
تۆم بۆ ئەم دەستانە خوڵقان
ئەم دەستانە، كە قڵێشیان
دەمیان بۆ تۆ كردۆتەوە...
تا تۆڵەیان... لە زۆرداران...
بكەیتەوە...
مایەی ژیانی تێكۆشان
تۆم بۆ ئەم دەستانە خوڵقان:
تینیان بەرێ، گوڕیان بەرێ
هێزی شاخ و داخیان بەرێ
تا بتوانن هەڵت گرن
بۆ ئامانجی ڕووناكە ڕێ،
هەڵت بڕن

**- پشوویەك -**

مایەی تەقەللای بێ وچان
مایەی ڕەنجی بێ پشوودان
تۆ لە كوورەی ئاگری سوورا
ژیانت كرا بە بەرا

PDF 4 KURD

دوای توانەوە لە ئازارا،
لە دایك بووی
ئێمەش وەك تۆ...
ئەوە گوردۆ... ئەوە پشتكۆ...
وەكوو هەموو ڕەنجدەرانێ
ئازار چاوی كردووینەوە
دەی ئەی دۆستی چەوسانەوە
با پێكەوە بگەینە جێ...
جێگە لووتكەی ژیانەوە...
ـ پشوویەك ـ

ئەی چەكوشی هێز و بڕوا
نیشانەی ڕەنج و توانا...
دۆستت زۆرە،
جێگەت سەر گلێنەی چاوە...
بەڵام هێشتا،
تینوێتی زاخاوت ماوە،
تینوێتی زاخاوی دوایی
ئەبێ هەر بە خوێن بشكێنی
خوێنی... ناپاك
خوێنی تاوانی ئەژدەهاك
ـ پشوویەك ـ

PDF 4 KURD

**پشتکۆ:**

**وەستا... ئارام، لە ناو گیانا**

**گەردی وەڕس بوونی لێ نیشت**

**چاوەڕوانی دوور و درێژ...**

**وا ئۆقرەی کوشت**

**کەچی هیچ دەنگێکم نەبیست!**

**کاوە:**

**من پێم ووتی**

**یان ئەوەتا شەوەزەنگی**

**ئەمشەو ئەبێ بە چراخان**

**یان ئەوەتا هەر تاریکیی**

**مردن ئەبێ وەك گۆڕستان!**

**ـ پشوویەك ـ**

**"کاوە لە سەر قسە کردن ئەڕوات، دوای کەمێ بیرکردنەوە ڕوو ئەکاتە پشتکۆ"...**

**گوێم لێ بگرە**

**هەر ئێستاکە پێ هەڵگرە**

**بڕۆ هەتا دووڕیانی**

**ئەو دیوی گرد،**

**چاو هەڵ بخە،چاوێکی ورد**

**هەر کاروانێکت بەدی کرد**

**پێشەنگەکەی " سوور " چووەوە**

**بێ ڕاوەستان**

وەرامەکەم بۆ بێنەوە...

زوو وەرەوە

**پشتکۆ:**

سەر لە پێناوا ئامادەم

چیت وت بیکەم

" بە پەلە ئەچێتە دەرەوە "

" کاوە بە دەم هات و چۆ کردنەوە "؛

دوژمن ستەمە بتوانێ

ڕیشەی بڕوا دەربکێشێ

تەنیا پواز... پواز نەبێ

داری ئەمجارە ناقلێشێ

من دڵنیام کاروان پاکە

دوور لە کەسانی ناپاکە...

بەڵام گومان ئالەم کاتە

هەبێ باشە، هەبێ چاکە

**ـ پشوویەك ـ**

"ڕوو ئەکاتە دانیشتوان"

گەر سەرکەوتین... تاج بۆ کێ بێ؟

لە بیرتان بێ

ـ بەڵام قسەی خۆمان بێ ـ

هەموو ئەڵێین بۆ فەرەیدوون

هەر من ناڵێم با بۆ ئەو بێ...



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دیارە لێم ئەپرسن بۆچی!

ئەی بۆ کێ بێ؟

بیر و بڕوای من وا ئەڵێ

- بۆ کوردێ بێ -

خوێن بڕێژن، کورد قوربانی

مەردانە بێ،

بۆچی ئەنجام بۆ "پارسێکی"،

بێگانە بێ...

با هەڵوێستیش دۆستانە بێ

من وائەڵێم لە بیرتان بێ!

"کاردای جوتیار بە ماتیەوە دێتە ژوورەوە و پێش ئەوەی قسە بکات، کاوە بەرەو ڕووی ئەچێت و ئەڵێت":

**کاوە:**

هیچتان نەبیست؟

چی ترتان کرد؟

پێت نەوتن کەی ئەجووڵێین،

بەرەو جێگەی گفت و بەڵێن

" کاردا ماتی دایگرتووەو وەرام ناداتەوە، کاوە لە سەر قسە کردن ئەڕوات":

بێ وەرامی، وەکو شتێ... گرفتاری

وا ئەتبینم...

بە ڕەنگ و ڕووتا پەست دیاری

چی ڕووی داوە؟ چی پێم بڵێ!

راست پێم بڵێ!

" کاردا ئەم جارەش هەر وەرام ناداتەوە "

**کاوە:**

وا... تەقم...کرد...

وا... شەقم... برد

چی رووی داوە...مەیشارەوە

چی... پێم بڵێ؟

**کاردا:** "بە قورگی پڕ لە گریانەوە "

چیت پێ بڵێم...

دەنگ و باسی جەرگ و دڵ بڕ؟

هەواڵی کۆستی کوت و پڕ؟

چیت پێ بڵێم...

**کاوە:** "بە شڵەژاوییەوە بەرۆکی کاردا ئەگرێ و ڕای ئەوەشێنێ"

هەواڵی مەرگە؟! کۆستی کێ؟

زوو پێم بڵێ وا شەقم برد

**کاردا:**

کاروون... کاروون

کارونمان... مرد!!

**کاوە:** "دەستی بەر ئەبێتەوە و تەواو سست ئەبێت و ئەچێتە ئەو لاوە بە دەنگێکی پڕ لە تاسەوە ئەڵێت":

کارونمان مرد!کارونمان مرد؟

بانگدەری شاخ و کێومان مرد؟



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

" پاش تۆزیك بیر كردنەوە، لە پڕێكا... بە خێراییەوە بە دەنگێكی بەرزەوە لە كاردا ئەچێتە پێشەوە و ئەڵێت":

**بەڵام نەت وت**

**كارون چۆن مرد؟**

**كوژرا؟ گیرا؟ نەخۆشی گرت؟**

**كارون چۆن مرد؟**

**كاردا:**

**دوێنێ... دوێنێ**

**لەو پەڕی زێ،**

**زێی گەورەدێ.**

**كات دەمەو... نیوەڕۆ ئەبێ...**

**لە گەڵ سییانی ترا ئەبێ**

**لە ناكاوا... تووشی... بۆسەی،**

**زوو نراوەی.." گۆتۆ" ئەبێ**

**لە دوا شەڕێكی بێ پشوو،**

**كارون و دوانیان ئەكوژرێ...**

**تەنیا یەكێكیان دەر ئەچێ!**

**بە دزەڕێ... ئەویش هەڵدێ!**

**پێش قەیرێ بوو... گەیشتە جێ!**

**ئەو هەواڵە شوومەی دامێ!**

**كاوە:**

**خەم لە دەروونەوە ئاڵا!**

PDF 4 KURD

**کۆستی کارون...**

**داخی گەورەی نا بە دڵا**

**بەڵام پێم مەڵێ کارون مرد!**

**مردن..**

**واتە بیرچوونەوە**

**ئاوا بوون و لێبوونەوە!**

**بەڵام هەرگیز ئازادیخواز**

**لە بیری گەل نەچوونەوە!**

**مردنی وا:ـ ژیانەوە،**

**ڕاپەڕین و هەستانەوە**

**دروست ئەکا!**

**کۆستی وەها: " سەربەستی**

**خۆشەویست... ئەکا "**

**ـ پشوویەك ـ**

**کاردای بە جەرگ... با دەستی خەم**

**نەخەینە ژێر چەنەی دامان**

**نە زۆر نە کەم**

**هەڵی نەدەین بە دوژمنان،**

**پێمان شاد بن**

**با ئەم کۆستە ڕەشەی مردن**

**بۆ ڕووناکی سبەی هاتن**

**تینمان باتێ... بۆ پێشەوە،**

PDF 4 KURD

بۆ سەرکەوتن...

**کاردا:** "دوای ئەوەی پشوویەك ئەدات و تۆزێ دێتەوە هۆش خۆ و قسەکانی کاوە کاری تێ ئەکەن ئەڵێت":

چی بڕیار بوو... بە جێ هێنرا

قسەی بەڵێن... بە کردەوە!

بە ڕێ کرا!

گفتی زمان و گفتی دڵ،

مەردانە هەمووی یەك خرا!

**کاوە:**

گشت ئامادەن؟

**کاردا:**

چاوەڕوانی تەقینەوەن!

**کاوە:**

ئەی چاوی پیس... چاوی دوژمن؟!

**کاردا:**

هەموو ونن!

گشت لە شکری بووك بردنن!

**کاوە:**

بووك بردنن؟!

**کاردا:**

لە دوێنێوە... کۆشك... ژاوەی دێ

لۆلۆ خەریکە بۆ "مزداك" ژن ئەهێنێ!

PDF 4 KURD

**کاوە:**

ئەم ڕێکەوتە...

بۆ تۆڵەی داخ لە دڵ بەختە!

ئەم هەڵکەوتە!

زێڕی وەختە!

**کاردا:**

ئەبێ... بڕۆم... چاوی دوایی

بە ناو ڕیزا... بگێڕمەوە...

تا وەرامی دڵنیایی

بە تەواوی ئەهێنمەوە!

**کاوە:**

چاوەڕوانم...ئەمێنمەوە!

"کاردا ئەچێتە دەرەوە "

**ـ پشوویەك ـ**

"پشتکۆ بەپەلە خۆی ئەکات بەژوورا، پێش ئەوەی قسە بکات کاوە ئەڵێت":

**کاوە:**

ئادەی... بڵێ...

هەواڵ چی بوو؟ مژدەم بەرێ!

**پشتکۆ:**

وا کاروانێ...

لە دوورەوە...لە دوورە ڕێ

دیارە بۆ ئێرە مل ئەنێ!

PDF 4 KURD

بریسکەی سووری پێشەنگی!

درەوشەی دێ...

دەنگی...زەنگی...

ئەگاتە گوێ!

**کاوە:**

هەر ئەوەندەی پێشەنگی سوور!

کاروانی ماندووی دوورە ڕێ

بگاتە... جێ!

ئەوسا ئەزانیت...چی ئەبێ!

چی ئەقەومێ!

**پشتکۆ:**

ئەبێ کاروان نیشانە بێ...

نەهێنی ئەم...هەستانە بێ!!

**ـ پشوویەك ـ**

"تابلۆی بێ دەنگ:ـ مادیا دێتە ژوورەوە، ئەچێتە پاڵ کاوەوە و دەست ئەکات بەچرپە چرپ لەگەڵیا، ئەڕواتە دەرەوە، دوای ئەو کاردۆخ دێتە ژوورەوە، دیسانەوە ئەمیش ئەچرپێنێ بە گوێی کاوەدا، ئەچێتە دەرەوە، ئنجا دوا بەدوای ئەمیش زێمری‌و زاماوا دێنە ژوورەوە ئەمانیش هەمان جووڵانەوەی ڕابردوودووبارە ئەکەنەوەو ئەچنە دەرەوە. لەم تابلۆیەدا شانۆ وەك پورەهەنگی بزوتنەوەی لێ دێ، مەبەست لەم تابلۆیەش نیشانەی دوا ئامادە بوونە بۆ ڕاپەڕین".

"قاوغی بێ دەنگی تابلۆی ڕابردوو، بە دەنگ و هەراو غەڵبەی خرۆشاو و ڕاپەڕینی میللەت ئەشکێت، تا بێت وردە وردە دەنگەکە نزیکتر ئەبێتەوەو گەورەتر ئەبیسترێت، لەم کاتەدا ئەوەی لەسەر شانۆیە " کاوەو پشتکۆ "ن... پشتکۆ بەخوێن گەرمیەوە ڕوو ئەکاتە کاوەی وەستای و ئەڵێت":

PDF 4 KURD

**پشتكۆ:** "گوێ هەڵ ئەخات"

دەنگ ئەبیسم...وەستا...دەنگە

دەنگی خرۆشاوی خەڵکە؟

گرمەی هەورە؟ یان چەخماخەی،

ئاسمان سوتێنی برووسکە؟

وژە وژی ڕەشەبایە؟

یان گەرداوی ناو دەریایە؟

دەنگ... ئەبیسم... دەنگە

**کاوە:**

کوڕم منیش چاك گوێم لێیە

ئەوە گرمە و ناڵەی هەوری،

دەنگی خەڵکە

ئەوە چەخماخە و بروسکەی!

هاوبیرانی من و تۆیە

کوڕم منیش چاك گوێم لێیە!

**پشتكۆ:**

وەستا... دەنگێکی...بەسامە

کوانێ دەنگی خەڵك وایە؟!

**کاوە:**

کوڕم...میللەت... کە برسی بوو

تینووی ڕۆژی سەربەستی بوو

داخ لە دڵی ژێر دەستی بوو

دەنگی وایە!

**پشتکۆ:**

وەستا...ئەم دەنگە...تاکوو بێ

بۆ نزیکی لای ئێمە دێ...

**کاوە:**

گیانمان بە پیریەوە ئەچێ!

**پشتکۆ:**

کەواتە بۆچی ناجوولێین؟

دەستەوەستان ڕاوەستاوین؟

**کاوە:**

کوڕم... بە بەڵێنی... ئەوان...

ئێمە چاوەڕوان کراوین!

نەوەستاوین

**پشتکۆ:**

وەستا... ئەی چەك: شمشێر...قەڵغان

تیر و کەوان

چی هەلگرین؟... بە دەستی ڕووت!

بچینە وێزەی دوژمنان؟

**کاوە:**

لە زەخیرەی چەکی دوژمن

کە هەر خۆم دروستم کردن!

ساڵ زیاترە...لە بەرەوە!

**بە نەهێنی ئەدزمەوە!!**

**هەر بەو ڕم و تیرەی خۆیان،**

**خۆیان ئەبێ بکوژمەوە!**

**پشتکۆ:**

**ئەی ئەوانەی وان بەڕێوە،**

**چیان پێیە؟...**

**کاوە:**

**چی بە دەستەوە هاتبێ!**

**ئەگەر بەرد بێ، ئەگەر دار بێ**

**هەڵ گیراوە!**

**پشتکۆ:**

**ئەی من...وەستا... چی هەڵ گرم؟**

**ڕمێ... شمشێرێ... هیچ ماوە؟**

**کاوە:**

**ئامادەیە... هەڵپەسێرراوە!**

**پشتکۆ:**

**لە کوێ؟ لە کوێ دانراوە؟!**

**کاوە:**

**لە گەنجینەی ژێر دوکانا**

**لە جێی دوژمن پێ نەزانا، دانراوە!**

**پشتکۆ:**

**وەستا...دەبا... دەریان بێنم**



PDF 4 KURD

بە سنگمەوە... بە دڵمەوە

وەك كۆرپە... بیان نووسێنم...

یەك لە سەر یەك ماچیان بكەم!

**كاوە:**

دەریان بێنە!...

بە شێنەیی بیان هێنە...

ئا... لێرەوە... بچۆ خوارێ!

بن میچ نزمە، سەرت نەشكێ!

دای نەوێنە!...

"پشتكۆ لەو جێگایەوە ئەچێتە خوارەوە كە كاوە بۆی دەست نیشان ئەكات، دەنگی خەڵكەكە زیاتر نزیك ئەكەوێتەوە... كاوە لە بەر خۆیەوە":

**كاوە:**

ئەم تۆفانەی كەهەستاوە

چی خۆی لە بەر دەما ئەگرێ!

ئەم... لێشاوە

كام تاریكی... ڕاناماڵێ؟

ئەم تۆفانە... مردن لووشە

چ زۆردارێ هەڵ نالووشێ!

ئەم لافاوە... ترسناكە!

چۆن قەڵای ڕەش داناپۆشێ!

ـ پشوویەك ـ



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

"پــشتكۆ" بــە باوەشــێ ڕم و تــیر و شمــشێر و كەرەســەی ئەوســای جەنگــەوە سەرئەكەوێتەوە،دایان ئەنێت و ڕوو ئەكاتە كاوە و ئەڵێت:

**پشتكۆ:**

وا هێنامن نامنە سەر دڵ

وەستا... بڵێ... چی هەڵگرم؟

چیم ئەدەنێ؟

**كاوە:**

هەركامێكیان دەستیان بەیتێ

بەرامبەر دوژمن وەك یەكن

دەمی شمشێر... تیر و كەوان

سەری چەكوش... یان نووكی ڕم...

**پشتكۆ:**

ڕم... هەڵ ئەگرم

" ڕمێك هەڵ ئەگرێ "

"دەنگی خرۆشاوی خەڵكەكە هـەر لـەنزیك بوونەوەدایـە، كاردا و مادیـا دێنـە ژوورەوە"

**كاردا:**

دۆزەخی... گەلی... خرۆشاو

كوورەی غەزەبی داخراو!

كەوتوونە ڕێ... بەرەو كۆشكی،

شای حەپەساو.

**مادیا:**

هەزارانن... لە سەر دەستیان

PDF 4 KURD

گیانیان، دڵیان، هەڵ گرتووە،

یان سەربەستی یان مردنیان

بۆ ئەنجام... هەڵ بژاردووە

"کاوە دەست ئەکات بەخۆکۆکردنەوە، بەرکۆشەکەی ئەکات بە سەری ڕمێکەوە، چەکوشەکەی هەڵ ئەگرێت، کاردا و مادیاش لەو چەکانەی دانراون هەر یەکەیان بابەتێك هەڵ ئەگرێت"

**پشتکۆ:**

ئەی پاسەوانانی کۆشکی،

زیندە بە زۆر بەچاڵ کردن

دەور و بەریان نەگرتووە؟!

**کاردا:**

چواردەوری کۆشکیان تەنیوە

لە سەر ئاگری ترس ئەژین!!

**کاوە:** "ڕوو ئەکاتە هەموویان"

وا ئەم بەر کۆشە لە سەر ڕم،

ڕمی تۆڵە سێن.. هەڵ ئەگرم...

یان ئەبێتە ئاڵای ژیان

یان بە کفنی سووری گۆڕم

"کاردوخ و زێمری و زاماوا هەرسێکیان بە پەلە دێنە ژوورەوە"

**کاردۆخ:**

کاتی قسە نەما... هیوا،

چاوەڕوانی کردەوەیە

خوێن لە ئێمە داوا ئەکا!

زێمری:

پەلە ئەکا، بانگمان ئەکا

زاماوا:

داوای یەکێتیمان ئەکا...

کاوە:

وا سوێند ئەخۆین...

دوای سوێند ئەڕۆین!!

"هەموویان لەیەکتر نزیك ئەبنەوە. دەستیان بەچەکەکانیانەوە بەرز ئەکەنەوەو لەیەکیەوە ئەئاڵێنن، دەنگی خرۆشاوی خەڵکیش هەر لەزیاد بووندایە. "کاوە" سوێندەکان ئەخواو ئەوانیش بەکۆمەڵ ئەیسێننەوە..."

سوێندە، سوێندی کورد پەرستی

سوێندی سەرشۆڕی نەویستی

سوێندی بڕوا و خۆشەویستی...

سوێندی لە خۆ... داماڵینی،

بەرگی نۆکەری و ژێر دەستی

سوێندە، سوێندی کورد پەرستی

سوێندە بۆ خۆری سەربەستی

★★★

سوێندە هەموو ئەیلێینەوە

سوێندە کە ناگەڕێینەوە

★★★

سوێندە بەو خوێنانەی ڕژان

PDF 4 KURD

بوون بە چراوکی ڕێی ژیان
سوێندە بەو سکانەی سووتان
سوێندە بە فرمێسکی دایکان
سوێندە بەو زەردەخەنانەی،
لە سەر لێوی کۆرپە کوژران.

★★★

سوێندە هەموو ئەیلێینەوە
سوێندە کە ناگەڕێینەوە

★★★

سوێندە ئەیخۆین بەو زمانەی
بوونی کوردی پێ پژاوە
سوێندە ئەیخۆین بەو ولاتەی
کوردستانی دایکی ناوە:
بە شاخ و داخ و ڕووباری
بە بێشەی چڕ و نزاری
بە هەموو مشتە خۆلێکی...
بە ئاو و بەرد و داری

★★★

سوێندە هەموو ئەیلێینەوە
سوێندە کە ناگەڕێینەوە

★★★

سوێندە بە ڕم بە تیر... چەکوش

PDF 4 KURD

به مەچەکی هەڵگرانی

سوێندە بە مەشخەڵی شۆڕش

بە کڵپە و گڕی سووتانی

سوێندە هەموو ئەیلێینەوە

سوێندە کە ناگەڕێینەوە

"بەدەم وتنـەوەی ئـەم بەیتـەی دواییـەوە لەگـەڵ پـەردە داکشاندا ئەچنە دەرەوەو لەهەمان کاتا دەنگی خرۆشاوی خەڵکەکە تەواو شانۆ پڕ ئەکاتەوە"

PDF 4 KURD

# تابلۆی نۆهەم

"جێگا کۆشکی ئەژدەهاکەو ژووری شاهانەی، کات دەمە و ئێوارە، ئەژدەهاك خۆیو لۆلۆ و خەزنەدارو هەموو دەستو پێوەندەکانی و پاسەوانەکانی کۆبوونەتەوە، شڵەژاونو شپرزەن، دەنگو هەرای خرۆشاو و ڕاپەڕیوی میللەت ئەبیسن، لەو پەنجەرەیەوە کە بەسەر ڕووکاری دەرەوەدا ئەڕوانێ، ئەژدەهاك تەماشا ئەکاتو پشتی لە دانیشتوانە، وەزیرو دەستو پەیوەندیش لە شپرزەییدا هەر بە یەکا دێن. "...

**ئەژدەهاك:** "لە دوای وەرچەرخانەوە و ماوەیەك بە پەلە هاتوچۆ کردن"

**گاگەل برسین، گاگەل زۆرن**

**سەر بە قۆچی تووڕە و مۆرن**

**گاگەل مل لە چەقۆ ئەسوون!**

**ئاگری ئەجەل هەڵی گرتوون:**

**وا بەرەو کۆشکی من هاتوون**

**ـ پشوویەك ـ**

**دەنگی سەگەل، بەزم و ڕەزمی**

**ئاهەنگی ئەمشەوی کۆشکی**

**لێ شێواندم!**

**تا خەیاڵی مەست بوونیشی،**

**لێ تەراندم!...**

" پاسەوانێك دێتە ژوورەوە و ئەنوشتێتەوە "

PDF 4 KURD

**پاسەوان:**

**گەورەم... مژدە!**

**ئەوا لاکی دەیان ڕووتە**

**لە ناو چەقی ڕێدا کەوتوون**

**خلتانی خوێنی خۆیان بوون**

**ئەژدەهاك:** "بە تووڕەییەوە "

**دەیان، دەیان، بڵێ سەدان**

**یان هەزاران...**

**سەگ ڕاناگرم، بۆ قوروسکان!**

" پاسەوانەکە ئەچێتە دەرەوە "

" پاش تۆزێ بیرکردنەوە "

**ـ پشوویەك ـ**

**بەڵام هەزاریش بەڵایە**

**هەندێ ناخۆشیی لە دوایە**

" ڕوو ئەکاتە هەموویان "

**ئەزانن بۆ؟!**

" ڕوو ئەکاتە لۆلۆ "

**تۆ پێم بڵێ.. تۆ...تۆ...لۆلۆ!**

**لۆلۆ:** "بە شڵەژاوییەوە"

**گەورەم... چونکە... چونکە "ئۆتۆ "**

**ئەیان بەخشێ بە تەختی تۆ!**

**ئەژدەهاك:** "بە گاڵتە پێ کردنەوە"

PDF 4 KURD

**بە عەقڵی تۆ!**

"پشوویەك لە سەر قسە كردن ئەڕوات"

**ئەی تۆ چی ئەڵێیت خەزنەدار**

**بۆچی بە بەلاًی بزانم لاكی هەزار؟!**

**خەزنەدار:** "بە شڵەژاوییەوە"

**چونكە... چونكە...بەزەیی شا**

**ئەجووڵێ بۆ دەردو سزا!**

**ئەژدەهاك:**

**نەء...نەء... هەموو ئەبزڕكێنن**

**هەموو قسە ئەدۆڕێنن!**

"پشوویەك و دوای قەیرێ هاتوچۆ كردن ڕوو ئەكاتە هەموویان"

**ئەزانن بۆ؟.**

**لاكی هەزارانم ناوێ!**

**چونكە سبەی كە ڕۆژ هەڵهات**

**دنیا تۆزێ گەرم داهات**

**بۆگەن ئەكەن!!**

**دەروو ناوی كۆشكی جوانم!**

**لەو بۆنە پیسە پڕ ئەكەن**

**ـ سەرداری كۆشك بێ سەر ئەكەن ـ**

**ـ پشوویەك ـ**

**ئەزانن من چۆنم ئەوێ!**

**من وام ئەوێ:**

PDF 4 KURD

**کەم.. بکوژرێ**

**بەڵام.. پاشماوە.. دەست بەستە!**

**گشت بگیرێ**

**لە دواییدا... کۆمەڵ...کۆمەڵ!**

**بۆ ناو دەریا فڕێیان دەن**

**بە خۆراکی ماسییان کەن!**

**من وام ئەوێ**

**لۆلۆ:**

**پاشای گەورە...چ...خواستی بێ**

**خوا و فریشتەش ئەوەی ئەوێ!!**

**خەزنەدار:**

**فەرمایشتە... قسەی بەجێ،**

**پیلانی ڕاست هەر وا ئەبێ؟**

**ـ پشوویەك ـ**

**ئەژدەهاك:**

**ئادەی... ئێستا!**

**ئا بزانن... گاگەل... هێشتا!**

**قۆچ لێ ئەدەن!**

**یان ماندوو بوون و برسێتیی!**

**کۆڵی شکستی پێ داون!**

**"دوو پاسەوان بە پەلە ئەچنە دەرەوە بۆ تاقیب کردن"**

**"لە دوای پشوویەك، ئەژدەهاك لە سەر قسە کردن ئەڕوات"**

PDF 4 KURD

کۆیله... کۆیله... کێ بیستوویەتی

کێ دیوێتی... هەتا ئەمڕۆ!

زمانی قسەی بێته گۆ!

کۆیله... کۆیله... کێ بیستووێتی!؛

سەربەست... بڕوا

سەربەست... بخوا

کۆیله... دیله... کۆیله... بەندە

کۆیله تاکوو مردن عەبدە!

" دوو پاسەوانەکە دێنە ژوورەوە و ئەنووشتێنەوە "

**یەکەمیان:**

گەورەم...ڕەش و ڕووتی... برسیی

وەك گەڵای دار لێ کوژراون

بەڵام ئەوانەی که ماون

بەسەر لاکا، لاکی یەکا...

هەنگاو ئەنێن... دێنه پێشێ!

**دووەمیان:**

گەورەم...زۆرن...بێ شومارن

وەك شێت هاری پەلامارن

سڵ ناکەنەوە... له مردن!

**ئەژدەهاك:** " به تووڕەییەوە "

مادام وایه... پێیان بڵێ

تا لافاوی خوێن هەڵ ئەسێ

PDF 4 KURD

هەتا بە کۆمەڵ غەرق ئەبن

با بکوژن... هەر بکوژن!

دەست نەپارێز..دەست هەڵنەگرن

وەك دروێنە، دروێنە کەن

داڵ برسێتی.. چاوەڕوانی،

لاکی کۆیلەی مردوو ئەکەن

" پاسەوانەکان ئەچنە دەرەوە "

ـ پشوویەك ـ

ئـەژدەهاك ئەچـێتەوە لای ئـەو پەنجەرەیـەی بەسـەر ڕووکـاری دەرەوەدا ئـەڕوانێت پاش قەیرێ تەماشاکردن ئەڵێت:

ژیان پەندە... پەند وەر ئەگرم

پەند لە ڕۆژانی ڕابردوو...

بڵێن... چی کەم؟!..

بۆ ئەمجارە بۆ داهاتوو

زمان هەمووی ئەسووتێنم

لاڵم ئەوێ!

ژیانیان ڕیشەکێش ئەکەم!

بڵێن: چی کەم؟..

وەك ولاٌخ ئەیانخەسێنم

پیاوم ناوێ!

دیلم ئەوێ..

دیلم ئەوێ!!

PDF 4 KURD

**لۆلۆ:**

**گەورەم هەر تۆ دڵتەنگ مەبە**

**چیت بوێ ئێمە وا ئەکەین**

**بۆ ئەم جارە.. کەس دەرناکەین!**

**هەتا دوا یەك ڕسوا نەکەین**

**خەزنەدار:**

**هەر تەنیا.. شا.. دەربەست نەبێ**

**چۆن بڵێ ئێمە وا ئەکەین**

**ـ پشوویەك ـ**

"لە پاش کەمێ هاتوچۆ کردن بەتووڕەییەوە ئەژدەهاك وەرئەگەڕێتەوەو ئەڵێت":

**ئەژدەهاك:**

**چیم بۆ ئەکەن.. چیم پێ ئەڵێن**

**قسەی زلی ژووری گەرم**

**درۆی زەقی نەبووی بەڵێن..**

**کۆشکم پیاوی وەك ئێوەی بوو،**

**بۆیە عەبد هاتنە سەرم!**

**ـ پشوویەك ـ**

**کە ئەمپرسی، چۆنە هەواڵ؟**

**هەور بوایە، تۆفان بووایە**

**لە منتان ئەکرد بە ساماڵ!**

**دەستی " وایە "!**

به ڕۆژ هەفتە و مانگ وساڵ

لە سەر سنگتان ڕاوەستا بوو

هەموو شتێ هەر تەواو بوو!

**لۆلۆ:**

گەورەم.. هەرچەند...سەرزەنشتی

ئێوەی سەردار.. وەکوو بەرد بێ

لای من گوڵێکە تێم ئەگری..

بەرزییم زیاتر پێ ئەبەخشێ

**خەزنەدار:**

توانج و سەرزەنشتی شا

چاوی هۆشمان ئەکاتەوە!

ڕوومان زیاتر سپی ئەکا!

**لۆلۆ:**

پاشای پایەدار بزانێ

لە کۆمەڵی ڕەش و ڕووتا

لە ناو دنیای ڕووت و قووتا!

گەلێ ویژدانمان کڕیوە!

بە نهێنی... زۆر پوازی

ناکۆکیمان داتاشیوە!

**ئەژدەهاک:**

باشە.. ئەنجام؟

من ئەنجامم ئەوێ ئەنجام؟..



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**لۆلۆ:**

کرمی پواز..کە داری خوارد

لە ناوەوە پووتی ئەکا!

بە چاو ئەڵێی قەت ناکەوێ،

کە خۆی نواند..

بەڵام لە پڕ کاتێ بینیت

بەلادا هات!

**خەزنەدار:**

کاتێ بەلادا هات..ئەمرێ

ئیتر ئەنجامی سەرکەوتن!

داوێن لە تەختی شا ئەسوێ!

**ئەژدەهاک:**

"ئەچێتەوە لای پەنجەرەکە و گوێ هەڵئەخات و ئەگەڕێتەوە ئەڵێت:"

وشەی سەربەستیم.. دێتە گوێ

سەربەستی بۆ ژیانی کێ؟!

بۆ ئەوانەی خۆم کڕیومن؟

هەر بە دیلی بوون و دیومن؟

بۆ کۆیلە؟.. یان بۆ سەپان؟

**ـ پشوویەك ـ**

"ئەو پاسەوانەی لەوەوبەر چووە دەرەوە، بە پەلە دێتە ژوورەوە و ئەنووشتێتەوە و ئەڵێت":

**پاسەوان:**

گەورەم وەکوو شەستەباران

تیر ئەبارێ.. بۆ سەر سەری،

PDF 4 KURD

بۆ سەر دڵی گوناهکاران!

بەڵام گەورەم دەریای ئاگر

تا بێ شەپۆلی گەورەتر

ئەکا بە گڕ کۆشکی بەرزا

لەم کاتەشا.. هەواڵێکیش،

هات و بەسەر، سەر گلێنەی..

چاوی هەمووماىا چزا!

**ئەژدەهاك:**

ئەی چاو کوندەپەپوو.. دیارە

ئەو هەواڵەی کە بە تۆ بێ

زریکەی ئێش و ئازارە..

بەڵام.. بیڵێ!!

**پاسەوان:**

بەزامەوە..

زامی خوێنی لەبەر ئەڕوا

گۆتۆی سەرکردە هاتەوە

بەڵام.. هیوا..

لە چاویا کوژاوەتەوە!!

**ئەژدەهاك:**

چۆن ئەبێ چۆن؟ کوا لە کوێیە؟

ئەوەی هەمبێ هەر گۆتۆیە..

هەر گۆتۆیە، هەر گۆتۆیە!!

PDF 4 KURD

**پاسەوان:**

لەبەر دەستی حەکیمانا

لەبەینی مان و نەمانا

لاشەی خوێناویی کەوتووە!

لەش بێ جووڵە.. چاو نووستووە!..

ئەپارێینەوە.. لە " ئۆتۆ "

هەڵسێتەوە سەرپێ گۆتۆ

**لۆلۆ:**

هەواڵێکە.. بۆکوڕووزی

جەرگی هەڵقرچاوی هانیی

هەواڵێکە.. گەڵاڕێزی

بەهاری تاساوی هانیی

**خەزنەدار:**

هەواڵی.. ژاکاوی هانیی

تەمی بەری چاوی هانیی

ئەپارێینەوە لە " ئۆتۆ "

لە " ئانانا "، "ئینکی "، "نامۆ "

هەڵسێتەوە، چاك بێتەوە

سەرکردەی پاڵەوان.. گۆتۆ

**ئەژدەهاك:** "بە تاسەیەکی بە کوڵ و پڕ لە ناسۆرەوە "

کاری پێچەوانەی ژیان

دەستووری ئاوەژووی دنیا!

PDF 4 KURD

**وا ئەسوڕێ ژان لە دوای ژان**

**لە ناوەختا، هەمووی یەکخا،**

**ڕێکەوت،بەخت،چی پێ ئەڵێن،**

**ناو لێ ئەنێن!**

**کاتێ هاتن بۆ ناخۆشیی،**

**یا خود خۆشیی، بە کۆمەڵ دێن!**

**لۆلۆ:**

**پاشای گەورە... بە دوای ژانا**

**ژانی کرێوەی زستانا!**

**گوڵی بەهار لە دایك ئەبێ**

**لە باخچەی کۆشکی شاهانا!!**

**ئەژدەهاك:** "ڕوو ئەکاتە ئەو پاسەوانەی هەواڵی بریندار کردنی گۆتۆی هێناوە"

**بڕۆ هەواڵم بۆ بێنە**

**سۆراخ زوو زوو بە ئەنجام دە!**

**تا بزانم گۆتۆ چۆنە؟**

**"خەریکە بڕواتە دەرەوە بانگی ئەکاتەوە"**

**ڕاسپێرە.. با.. لاسیراب**

**لە بەردەمما ئامادە بێ**

**هەر ئێستە بێ...**

**دوا نەکەوێ**

**پاسەوان:**

**بەڵێ گەورەم هەر ئێستە دێ!**

"ئەچێتە دەرەوە"

**ئەژدەهاك:** "لە دوای ماوەیەك بێ دەنگی و هات و چۆ كردن و بیر كردنەوە ئەڵێت":

دەربەدەری، داڵدە نەبوون
زۆران لە گەڵ مەرگا ئەگرێ..
كەواتە ئێستە فەرەیدوون
وەك سەگ بە كۆشكم ئەوەڕێ
سەرچۆپی كێشی ناو گاگەل!
ئەبێ ئەو بێ!
مەرگ هێنایەوە ئێرە!
با بەخێر بێ!

**لۆلۆ:**

گەورەم..كێ ناڵێ... ئا ئێستا
لە خوێنی خۆیدا ناگەوزێ
لە مەیدانی بەر كۆشكتا

**خەزنەدار:**

وەكوو چەقەڵی ترسنۆك
بۆ مریشكی ناو ئاوایی
چۆن بە دزە دێتە سەر چۆك
بە فێڵ... فێرە!
وایش فەرەیدوون بە نهێنی
مەرگ هێنایەوە ئێرە..

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

ئەوا.. ڕۆژێك.. نەء...هەفتەیەك

بە برسێتی وا مانەوە،

بەرگەیان گرت.. ئەی دوای ئەوە؟

ئەبێ چی بکەن؟ بۆ کوێ ئەڕۆن؟

ئەبێ لاکی یەکتر بخۆن

ئەی دوای ئەوە؟. ئەبێ بمرن..

یا ئەوەتا کۆیلە بن..

وەکوو جاران.. هەتا مردن!

کڕنوش بردن!

"لاسیراب"ی جاڕچی کۆشك دێتە ژوورەوە و ئەنووشتێتەوە"

**لاسیراب:**

پاشای گەورە.. ئەوا هاتووم

لە بەر تەختی بزورگتانا!

کڕنوش بردووم!

سەرم وا لە پێناوتانا!

**ئەژدەهاك:**

دەنگ زل، لاسیرابی جاڕچی

باش بوو هاتی

ئەزانی چی؟

**لاسیراب:**

فەرموو.. قوربان.. هەرچی بڵێی

PDF 4 KURD

**ژیانیشمی..ئەخەمە.. ڕێی!**

**ئەژدەهاك:**

**ئا.. کەواتە.. گوێم لێ بگرە**

**زۆر لە جاران وریاتر بە**

**خۆت ئەزانی هەندێ برسی**

**ئەمشەو تۆزێ دڵیان گرتووم**

**چاکتر وایە جارێ بدەی..**

**کە قەیناکا لێیان بووردووم**

**تا بڵاوەیان پێ بکەی..**

**خۆت ئەزانی..**

**زەوی تێر بوو، خوێن ناچێژێ**

**پێیان بڵێ.. با لەمە زیاتر نەڕێژرێ!!**

**لۆلۆ:**

**قسەی شای گەورە پەسەندە.**

**خەزنەدار:**

**گەوهەر و یاقووتی پەندە.**

**لاسیراب:** "بە ترسەوە":

**بەڵام گەورەم پاشای مەزن**

**برسی زۆرن!**

**یەك دوو هەزار زیاتر ئەبن**

**گوێم لێ ناگرن..**

PDF 4 KURD

با دەنگیشم گڕوو زل بێ..

لە چاویاندا...

وەکوو فوویەك وایە تەنیا

بیکەی بەناو ڕەشەبادا!

**ئەژدەهاك:** "بە تووڕەییەوە لە لاسیراب ئەچێتە پێشەوە"

وا دیارە بەر لەوەی بچیت

زۆر حەز ئەکەیت لێرە بمریت!!

**لاسیراب:** "بە ترسەوە"

بەڵێ.. گەورەم.. ئەوا ئەڕۆم...

پەشیمانم ئەوا ئەڕۆم

"بە شڵەژاوییەوە ئەچێتە دەرەوە"

**ئەژدەهاك:** "دوای کەمێ هاتوچۆ کردن"

هەرکاتێ تەوقی عەبد شکا

پێیان لە پێوەند ترازا

کەوتنە ئەوەی شێر هەڵکێشن

مانای وایە زەنگ لێ درا

زەنگێ پێم ئەڵێ: ئەژدەهاك

وریابەرەوە ڕاچڵەکە!

دەستی زەبروزەنگ شل مەکە!

هەناسەیەك لە دەست مەدە

تەخت و بەختت بپارێزە!

PDF 4 KURD

خوێن بڕێژە...

ئەگینا..ئەنجام..ستەمە!

زۆر ستەمە... زۆر ستەمە!

**لۆلۆ:**

بەڵام گەورەم، قەڵات سەختە

کێ ئەتوانێ بگاتە.. ئەم،

تاج و تەختە!؟

کێ ئەتوانێ دڕ بە شوورەی،

کۆشکی بەرز و بەردین بدات؟

کێ ئەتوانێ؟..کێ شەڕ لەگەڵ،

سێبەری خواکانا ئەکات؟

**خەزنەدار:**

هەتا ئەمڕۆ ژین وا ئەڵێ:

تاج نانەوێ، شا ناکەوێ

**ئەژدەهاک:**

ئەمە ڕاستە، ئەبێ وابێ!

بەڵام هەر کاتێ دەستی دیل

گەیشتە ڕم، گەیشتە تیر

مانای وایە: زەنگ لێ درا

**ـ پشوویەك ـ**

"پاسەوانێك بە پەلە و شڵەژاو، دێتە ژوورەوە"

گەورەم وا لافاوی هەستاو

**لافاوی خەڵکی خرۆشاو!**

**شوورای یەکەمینی ڕادا!**

**لە جێی خۆی تلیسایەوە!**

**هەرچەند کرا،**

**تەوژمی ڕق بەربەست نەکرا!**

**ئەژدەهاك:** "بە شپرزەییەوە ڕوو ئەکاتە هەموویان"

**من پێم وتن.. زەنگ لێ درا..**

**فریا کەون... من پێم وتن..**

**لۆلۆ:** "ڕوو ئەکاتە پاسەوانەکە "

**ئێوە جێتان قەڵای سەختە**

**سەنگەری شەڕتان قایمە!**

**ئێوەی پڕچەك تیرو و پۆشتە**

**چۆن ئەبەزن؟ چۆن ئەهێڵن!**

**کۆیلە شوورەی بەرزی کۆشك!**

**داگیرکەن و بڕوخێنن..**

**خەزنەدار:**

**یان ئەوەتا ئێوەش لە گەڵ...**

**کۆیلەدا دەست تێکەڵن..**

**یان ئەوەتا ترسنۆکن..**

**سەنگەریان بۆ بەجێ دێڵن!**

**ئەژدەهاك:**

**ئەبێ وابێ، دەست تێکەڵن**



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**ئەم قسەیە ئەسەلمێنم..**

**لە ژێرەوە هەبێ و نەبێ...**

**دەست تێکەڵن..**

**ئەم قسەیە ئەسەلمێنم!!**

**پاسەوان:**

**گەورەکانم.. نمەکی..شا**

**کوێرمان ئەکا.. گۆجمان ئەکا!**

**گەر بێت و پشتی لێ هەڵکەین**

**لە گەڵ عەبدا دەست تێکەڵ کەین**

**بەڵام.. بەڵام.. گەورەکانم**

**شتێك هەیە دەستی بەستووین**

**چاوی گرتووین..**

**ئێمە جێمان.. قەڵایەکە..**

**سەخت و کون بڕ..**

**ئێمە.....**

**ئەژدەهاك:** "قسەکانی پێ ئەبڕێت"..

**ئەی چۆن ئیتر..**

**تۆ پێم ئەڵێی بەربەست ناکرێ!**

**ئەی چۆن ئیتر!..؟..**

**پاسەوان:**

**گەورەکانم.. شتێك هەیە..**

**تێی نەگەشتووم.. ناوی چییە؟..**

PDF 4 KURD

جادووی گیانی نەهێنییە؟..
یاخود چاوی تەلیسماوی..
فریشتەکانی ئاسمانە!..
یان هێزی دەستی خواکانە
لەناو دەروونی ئەوانا!..
دێت و ئەچێ..
تینی ئاگریان ئەداتێ
هێزی بڕوایان ئەداتێ
ترسی مردنیان دەر ئەکا!
شەڕیان لەگەڵدا پێ ئەکا!
گەورەکانم.. شتێك هەیە
لە چاویانا... تیشك ئەهاوێ!
لە گیانیانا.. گڕێك هەیە..
ئەستێرەی پڕیشك ئەهاوێ!
گەورەکانم: ئەو پڕیشکە..
گڕوو.. تیشکە!..
لە چاوی ئێمەدا نییە..
لە گیانی ئێمەدا نییە..

**ئەژدەهاك:**

ئەم قسانە بۆ من مەکە..
ئەمە ڕێی خۆ تەفرەدانە..
قسەی پیاوی ترسنۆکە!

"له پاش ماوەیەك هاتوچۆ كردن و بیر كردنەوە ڕوویان تێئەكا"

بیهێننە بەرچاوی خۆتان:

ماوەیەك بێ دووروو درێژ

شێر برسیی بێ

پلێ گۆشت چییە.. نەیدیبێ!

چاوی سووری.. لە تاوانا،

دەرپەڕیو بێ، ئارام نەگرێ

قەپاڵ لە شیشی ئاسنی،

قەفەز بگرێ

بیهێننە بەر چاوی خۆتان

لەو شێرانە..بەربنە ناو

كۆمەڵی ڕووتەی خرۆشاو

ئەبێ چی بكەن؟..

ئەبێ لاشە چۆن ئەنجن كەن!؟

چۆن بیپچڕن، چۆنی وردكەن..؟

بیهێننە بەر چاوی خۆتان!

لۆلۆ:

دیمەنێكە موچوڕكەی ترس

دێنێ بەسەر تاپای لەشا

دیمەنێكە لە خەویشا

مایەی زەنەق چوونی عەبدە!

پاشای گەورەم

PDF 4 KURD

ئەم بیرە، بیرێکی وردە

هەڵی چاکە، داوا ئەکەم

شێری برسی.. ئێستا بەردە!

**خەزنەدار:**

هەر شێری برسی ئەزانێ

چۆن کۆیلە و عەبد بخوا!

هەر شالاٌوی ئەو ئەتوانێ..

درِ بە دوژمنانی کۆشك بدا!!

هەڵی چاکە، با خوانی وا

پێشکەشی شێری برسی بێ

با تێر بخوا!!

**ئەژدەهاك:** "ڕوو ئەکاتە پاسەوانەکە"

کەواتە تۆ.. برِۆ ئێستا

چاوەڕوانبە تا "لاسیراب"

جارِ بۆ تەمێی دوایی ئەدا..

ئەگەر هاتوو.. لە دوای ئەوەش..

ئەو قسانە دادی نەدا!

ئەوسا ئیتر.. ڕامەوەستە

بیکەنەوە.. دەرگای ئاسن!

با شێری برسیی دەرپەڕن!..

شالاٌو بەرن.. لەش ئەنجن کەن

ئێسك و پروسك تێك بشکێنن

PDF 4 KURD

دوایی بەم ژاوەیە بێنن!!

**پاسەوان:**

بەڵێ گەورەم... فەرماییشتتان

لە سەرسەرمان!

" ئەڕواتە دەرەوە "

**ئەژدەهاك:** "دوای هاتوچۆ کردنو بیرکردنەوە ڕوو ئەکاتە لۆلۆو خەزنەدار"

زەردەواڵە، کە وروژان

بە دەست یەك یەك چزوو ناکرێن

بۆت ناگیرێن..

بەلاّم کە شا پلێتەی سووتان

خرایە ناو کونی شاریان

ئیتر تەواو دا ئەمرکێن!

**ـ پشوویەك ـ**

جوتیار، ئاسنگەر، ئاشەوان

زمانیان گرت.. بوون بە ئینسان!

لە من هەستان؟!..

"ئەو پاسەوانەی لەوەوبەر هەواڵی بریندار بوونی گۆتۆی هێنا بوو، دێتە ژوورەوە، بە شپرزەییەوە ئەڵێت":

**پاسەوان:**

گەورەم.. پاشا..کۆستی ناوەخت

کۆستی جگەربڕمان وا کەوت!

زام خوێنی نەگیرسایەوە

دوا تروسکەی چاوی گۆتۆ..

بەتەواوی کوژایەوە!

"دوای قەیرێ ڕاوەستان ئەنوشتێتەوە و ئەچێتە دەرێ "

**ئەژدەهاک:** "لە دوای حەپەسان، بە نائومێدییەوە ئەڵێت"

گۆتۆم!گۆتۆی سەرکردەم مرد؟!

پارێزەری تاجەکەم مرد؟..

گۆتۆم...گۆتۆم... گۆتۆم چۆن مرد؟..

**لۆلۆ:**

کۆستێکە زل، ڕۆژێکە شووم

هەواڵێکە گڕەی دۆزەخ...

ئەدا لە ڕووم

ئەنجامێکە کە دەسەڵات

ناتوانێ قسەی تیا بکات!

**خەزنەدار:**

بۆ ئەم هەواڵی ناسۆرە

وەکوو گڕی دارستانێ

چۆن بسووتێ..

خەمی گیانم ئا بەوجۆرە

کڵپە ئەکا وا ئەسووتێ!

**ئەژدەهاک:**

هەتاکوو گۆتۆ زیندوو بوو

مردن لە کۆشکی من دوور بوو

PDF 4 KURD

بەڵام ئێستا کە گۆتۆم مرد!
تارمایی ترس پەیدا بوو
ڕوو شاراوەی ئاشکرا بوو
هەست بە بوونی،دەنگ و ڕەنگی
جووڵە و بزووتنەوەی ئەکەم..
**ـ پشوویەك ـ**
بەڵام بواری ترس نادەم
بێتە پێشێ.. من ئەبێ دەست
دەستی تێ سرەواندن پێشخەم!

**لۆلۆ:**

ئەژدەهاکی گەورە ئەبێ
بەسەر مردنا سەرکەوێ!

**خەزنەدار:**

ژین هەتا ئێستا وا ئەڵێ
شا ناکەوێ..تاج ناکەوێ!

**ئەژدەهاك:** "لە دوای ئەوەی دەنگی نەڕەی شێری برسی بەڕەڵا بوو بە ئاشکرا ئەبیسێت:

ئادەی.. ئادەی..با شاڵاوی
چنگی ڕفتان..پڕ ئازار بێ
ئادەی.. ئادەی.. با خوێناوی
کۆیلەکان بە ڕووبار بێ
ئادەی.. ئادەی.. با کەڵبەتان..
کەڵبەی لە ئەڵماس تیژترتان!

PDF 4 KURD

**کەڵبەی ناو دەمی برسیتان**

**ئێسك و پروسك وەك خۆڵ ورد کا!**

**ئادەی.. ئادەی.. با کەڵبەتان..**

**وەك کینەی ئەژدەهاك وابێ**

**ئادەی.. ئادەی.. ئادەی..ئادەی!!**

**ـ پشوویەك ـ**

**لۆلۆ:**

**گەورەم هەرچەند ئەمشەو ئازار**

**بوو بە گرێی دڵی هەزار**

**بەلاّم چاوەڕێین بەربەیان**

**مژدە بێنێ وەکوو بەهار**

**بڵێ:سەرکەوت ئەژدەهاکی،**

**پاشای جیهان**

**خەزنەدار:**

**چاوەڕوانین تا خۆر هەڵدێ**

**تا ئەم شەوە کۆتایی دێ**

**ئەژدەهاك:**

**چاوەڕوانی، ئێشك گرتن**

**کەی ئەنجامن!بۆ برینی،**

**ئازاری شەو سارێژ کردن**

**چاوەڕوانیی، چاوەڕوانیی**

كۆتايى بە كام شەو هانى

ـ پشوويەك ـ

"پاسەوانێك بە شەڵەژاوى دێتە ژوورەوە "

**پاسەوان:**

گەورەم دۆزەخى داخراو

دۆزەخى خەڵكى خرۆشاو

قيامەتى.. دڵ پڕ لە قين

نە شوورەى بەرد..بەرگەى ئەگرێ

نە قەڵاى دەرگا ئاسنين

**ئەژدەهاك:**

ئەى شێرى دڕ، شێرى برسى

قولاپى چنگى داماڵيين

كەڵبەى ژەهرين؟

**پاسەوان:**

داديان نەدا، هەر زوو بەزين!

**لۆلۆ:**

ئەى ئێوە چين؟

**پاسەوان:**

گەورەكانم بێ هودە بوو

هەرچى ڕەنجێ ئێمە دامان

چارى نەبوو..

بەر بەست نەكران!!

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

**گەیشتنە کوێ؟ئەنجام چی بوو؟**

**پاسەوان:**

**شوورە لەدوای شوورە ڕما**
**قوللەی قەلاٚ داگیرکرا!**
**زیندان ڕووخا..**
**بەندی گیراو..سەربەست کرا!**
**گەورەکانم هەر بەکۆمەڵ**
**لێیان ئەخەین!لێ ئەکوژین**
**بەلاٚم وەکوو ئاوی کانی،**
**لە هەموو بستە ئەرزێکا..**
**هەڵئەقوڵێن!**
**شتێك نییە چاریان بکات**
**بڕوایان وەکوو هەورازی،**
**پلەی سەختی کێوی بەرزی**
**ولاٚت وایە!داگیر ناکرێ!**
**تیشکی چاویان! وەکوو تیشکی**
**خۆر وایە بە دەست ناگیرێ**

**ـ پشوویەك ـ**

**هاکا.. شەپۆلی.. ترسناك**
**گەیشتە ژووری ئەژدەهاك**
**گەورەم.. ئەنجام:نووتەك،تارە**

PDF 4 KURD

سەر دەرکەین ماڵ بێ پرسیارە؟

"ئەچێتە دەرەوە"

**ئەژدەهاك:**

من ڕاناکەم.. تا شیرەکەم

لە پێش مردنا ماچ نەکەم!

کوا شیرەکەم؟

"پاسەوانێك شیرەکەی بۆ ئەهێنێ"

**لۆلۆ:**

با بەر لەوەی دەستی برسی

بمانگاتێ..خۆ دەرباز کەین

خۆزگەی ناحەز نەیەتە دی

سەری پاشا سەرفراز کەین؟..

چونکە گەورەم مانەوەی وا

بەرەو شەوەزەنگمان ئەبا..

لەگەڵ مەرگا چۆن شەڕ ئەکرێ

دەست چۆن پشکۆی ئاگر ئەگرێ؟..

**خەزنەدار:**

گەورەم..پاشا..خۆدەرکردن

واتا بۆ ئێمە سەرکەوتن..

**ئەژدەهاك:** "بەتەوس و پێکەنینەوە "

کاتێ هێزم لە دەستا بێ

من چی بڵێم.. هەمووشتێ..

PDF 4 KURD

ئەڵێ ئەبێ.. ئەبێ وابێ
هەتا سروشت.. ئاسمان.. دەریا
پرشنگی خۆر..لووتکەی چیا
کڕنووش ئەبەن
سەر شۆڕ ئەکەن..
لە بەردەمما..لە بەر پێما!
ـ پشوویەك ـ
بەڵام کاتێ کە دەسەڵات
کەوتە سەر ڕێی هات و نەهات
ڕێکەوت کەوتە پشت هەڵکردن
هەموو شت پشتم تێ ئەکات..
هەتا ئێوەش.. هەتا ئێوەش
ڕووی نۆکەریی وەر ئەگێڕن
ڕێم لێ ئەگرن!
ـ پشوویەك ـ
بەڵام هەر وا بە ئاسانیی
ڕێگەی مەترسیی دەرناکەن
چۆن ئەیەڵم پەشیمانیی
بە پەنجە گەستنێ دەرخەن
چۆن ئەیەڵم دوای مردنم
بژین وەکوو جاری جاران
بۆ نوشوستی و ژێرکەوتنم

PDF 4 KURD

هەر من بکەن بە ناونیشان
چۆن ئەیەڵم کەچرنووکی
ئێوەی بێ وەفای پشیلە!
پێستی شاهانەم داڕنێ
چۆن ئەیەڵم دڵی سپڵە
دوای مردنم پێ بکەنێ
- پشوویەك -
وەك ژن خزاونەتە پاڵ من
شایستەن بۆ ئەتك کردن..
ئەتانەوێ بەقسەی زل
ترسنۆکیی ئارایشت کەن
ڕێگە نادەم.. چۆن ئەیەڵم..
بە ئاسانی وا پشت هەڵکەن
- پشوویەك -
"سەربازێکی لەش خوێناویی بە شپرزەییەوە خۆی ئەکا بە ژوورا "

**پاسەوان:**

ئومێد نەما.. وا قەلاّ و کۆشك
بۆ یاخی بوو هاتنە سەر چۆك
ئەو شوێنەی ڕووناکیی تیایە
تەنیا هەر ژووری پاشایە
داگیرسێنی.. ئەم ئاگرە
سەرکردەی ئەم ڕێی بەلاّیە

PDF 4 KURD

**گەورەم.. كاوەی ئاسنگەرە**

" ئەچێتە دەرەوە "

**ئەژدەهاك:** "ڕوو ئەكاتە لۆلۆ و خەزنەدار"

**دەست بە زاخا كردن وایە**

**تەفرە و مل شكاندن وایە**

**وتم كاوە وەچەی شەڕە**

**سەر پەڕاندن بەو ڕەوایە**

**وتیان: ئەمە پەلەی تیایە!**

**دەستتان بڕیم..كوێرتان كردم**

**بە ڕێی مردنتانا بردم**

**ئێستەش ئەتانەوێ ڕاكەن..**

**دڵنیابن قەت ڕا ناكەن**

"ئەژدەهاك شیرەكەی هەڵ ئەكێشێ و بەدەم ئەم قسانەی خوارەوە لۆلۆ و خەزنەدار ئەكوژێت "

**با بیچێژن ئەو ژاراوەی**

**خۆتان كردتانە كاسەوە**

**با كفەی بێ ئەو خوێناوەی**

**خۆتان لێتان ئەخواردەوە!**

" هەردووكیان ئەكەون و ئەمرن "

"دوای لێدانی مۆسیقایەكی تایبەتی و پشوویەك كە ماوەیەك ئەخایەنێت، ئەژدەهاك لە بەر خۆیەوە:

**ئەژدەهاك:**

**تەنیام.. تەنیام..مامەوە خۆم**

PDF 4 KURD

ئەی خۆم ئەبێ بۆ کوێ بڕۆم؟
ڕێی شەوی مەرگ ترسناکە
هەموو شتێ.. هەردوژمنی
ئەژدەهاکە!..
چاوم لێیە..چەم.. چیا.. هەرد
چاوم لێیە تا دار و بەرد
تا.. تاجەکەم.. تا..تەختەکەم
تا کەلوپەلی ژوورەکەم!
منیان ناوێ لێم بێزارن
بۆ مردنم..چاوەنوارن
ـ پشوویەك ـ

کوا دڵۆپێ فرمێسك ڕشتن
کوا ئاخێکی گەرم ناشتن!
کوا بەزەیی سەر ڕوخسارێ
کوا..تکایە؟کوا هاوارێ؟
کوانێ ئەو دەستانەی ئەڵێن
بۆ تەنگانە درێژ ئەکرێن
نایانبینم..هەموو ون بوون
هەموو وەك ئەمانە مردن "مەبەستی لۆلۆ و خەزنەدارە"

ـ پشوویەك ـ

"لەم کاتەدا و لە گەڵ بەرزبوونەوەی دەنگی خرۆشاوی میللەتدا کاوەی ئاسنگەر خۆی ئەکات بە ژوورا و پڕ بە دەنگ ئەڵێت":

**کاوە:**

زاڵم.. وا شەو باری نەویی

وا رووناکیی دنیای پڕ کرد

وا کاروانی ئازادیی کورد

بە، بەهاری هیوای گەیی

زاڵم.. تۆ بۆ کوێ دەرئەچی؟

**ئەژدەهاك:** "ڕوو ئەکاتە هەردوو پاسەوانەکە "

ئەنجن..ئەنجن..لەتلەتی کەن

وەك سەگی خوێڕی پەتی کەن!

"کاوە لەگەڵ هەردوو پاسەوانەکەدا ئەکەوێتە شەڕەوەو بەدەم شەڕ کردنەوە":

**کاوە:**

بۆ کێ ژیان..؟بۆ کێ ئەمرن

بۆ کێ؟ڕێ بە میللەت ئەگرن؟

ئەی دیلەکانی تاریکیی؟

کوێرە ڕێگا

ئەنجام بۆ هەڵدێرتان ئەبا!

"لە ئەنجامی شەڕدا کاوە هەردوو پاسەوانەکە ئەکوژێت و لە ئەژدەهاك ئەچێتە پێشەوە و ئەڵێت":

**کاوە:**

هەر..ڕوو بەڕووی سڵ نەکردن

شێری تۆڵە هەڵ ئەکێشین



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

له پشتەوە دەستی کوشتن

وەك ترسنۆك ناوەشێنین!

**ئەژدەهاك:**

کێیە بتوانێ ئەژدەهاك

له ناوبەرێ..یان..بیکوژێ

کێ زات ئەکا..کێ ئەوێرێ

ڕێی لێ بگرێ؟!

**کاوە:**

منم ئەوکەسەی ئەژدەهاك

ماری ناو دەروونی ناپاك

له ناو ئەبا

منم خوێنی ئەڕژێنم

منم مێشکی ئەپژێنم!

"دەست ئەکەن بەشەڕ، کاوە بەدەم شەڕەوە له سەر قسە کردن ئەڕوات":

ئەی جانەوەر

ئەی تارمایی ئەهرەمەنی

تاریکی و شەڕ

دالّدەت نییە، چۆن دەرئەچی

بۆ کوێ ئەچی؟.

چوار دەوری قەلاّت ئاگرە

مەبزوورەوە دەست هەلّبڕە!

PDF 4 KURD

**ئەژدەهاك:**

ئەژدەهاك و دەس هەڵبڕین
ئەگەر ئاسمان ئەگەر زەمین
لە یەك بدەن.. من نابینن
دەست بەستە بم
کڕنووش بۆ عەبدی خۆم بەرم

"ئەکەونە شەڕێکی سەختەوە، چەند جارێك کاوە ئەکەوێتە مەترسیی لەناوچوونەوە، تا لەئەنجامدا ئەژدەهاك ماندوێتی تەنگی پێ هەڵ ئەچنێ و ئەوسا کاوە بە چەکووشەکەی کە هەر لەسەرەتاوە بە دەستی چەپ هەڵی گرتووە، هەڵ ئەکوتێتە سەر ئەژدەهاكو مێشکی ئەپژێنێ، لەم کاتەدا گوردۆی کوڕی بە پڕتاو دێتو باوەش ئەکات بەکاوەی باوکیا، دوای ماوەیەك ئینجا، پشتکۆ. کاردا. مادیا. کاردۆخ. زێمری. زاماو. یەك لەدوای یەك دێنە ژوورەوەو کاوە لەناوەڕاستیانا بەدەنگێکی زوڵاڵەوە ئەڵێت":

**کاوە:**

بە لاشەی کوردی قوربانیی
بە خۆری بییر، وا زستانی
تەنگ و تارمان کرد بە بەهار
بە خوێنی دڵ..بە ئارەقی
چەوسانەوەی ئێش و ئازار
خۆمان لە دەست شەو راپسکان..
کەوتینە ڕێ!
تەوقی دیلێتیمان پسان..
هەڵمەتمان بردا..

PDF 4 KURD

**بە بازووی قاڵی تێکۆشان:**

**پشتی تاوان،**

**پشتی ئەژدەهاکمان شکان**

**با ئەم ڕۆژە جەژنی گەل بێ..**

**جەژنی ژیان**

**جەژنی کوردە چەوساوەکان**

**با ئاگری ئەم نەورۆزە**

**لە سەر لووتکەی بەرزی وڵات**

**هەتا هەتایە بسووتێ**

**بڵێسەکەی هاوار بکات:**

**بڵێ: نەوەی ئادەمیزاد..**

**کورد بوو یەکەم ڕاپەڕینی**

**شۆڕشی سوور بەرپا بکات**

**کۆتایی**

PDF 4 KURD

کەلـەپور بناغـەی ئـەم شـانۆگەرییەی داوەتـەوەو لەکلاورۆژنـەی بەیتـە میللـی فۆلکلۆرییەکانیـەوە تیـشکی وەرگرتـووە لـەکوورەی ئەوانـدا قـاڵ کراوەتـەوە. ئاوڕدانەوەیەکە لەسەردەمە تاریکەکانی رابردووی دوور.

ئەوکارەسـاتو بەسـەرهاتانەی لـەواقیعی تـاڵی رۆژانـەی ژیـانی ئەوسـای دڵدارانـدا لـەنێوان خێـرو شـەڕدا لەچنگاوشـبوونی یـەکترو زۆرانبازییـەکی سـەختدا بـوون. ڕووداوەکـان لەسـنوری کـاتو وەخـتی ئـەو سـەردەمانەدا ماونەتـەوەو بـەلای رابـردووی نزیکو ئێستەماندا نەهاتوون.

## کەسەکانی ئەم شانۆگەرییە

1- پیرۆت: شوانەی گوند
2- مام وسوو: رەزەوان
3- بایز: کوێخا
4- سوارە: هاوڕێی پیرۆت
5- خاوەر: کچی کوێخاو دڵخوازی پیرۆت
6- هەمین: ژنی کوێخا بایز
7- پیربالٚ: ئاشەوان
8- باپیر: بەتەمەنترین پیاوی گوند
9- مەمەند: کوڕەزای باپیرە، منالّی یەکەم
10- زۆراب: کوڕەزای باپیرە، منالّی دووەم
11- حەمە: قەتار چی

لەگەلٚ:

ئا =کۆرسی سەرەکی
ب =کۆرسی منالاٚن
ج =حیکایەتخوان
د =دەرهێنەر

هەروەها: کۆمەلٚەخەلٚکێ، ڕێبوارێ، چەند دەنگێ.

PDF 4 KURD

# تابلۆی یەکەم

دەرهێنــەری شـانۆگەرییەکە: "لەگـەڵ دەسـت پێکردنـدا، بـاڕژنی ئاسـکێ ئەبیـسترێ، بـێ دەنگی، پەردە بەئاستەم ئەکرێتەوەو دەرهێنەر دێتە پێشدەمی شانۆکەو رووئەکاتە بینەران:

میوانە خۆشەویستەکان، شەوتان رووناك

چاوتان رووناك..

بەخێرهاتن بۆ بینینی ئەو چیرۆکەی

لەم ساتەوە

وشەکانی ئەبزوێنو ئەبنە تابلۆو

ئەبنە ئەکتەر..

تا تەماشای وردی ئێوە لە سەرە ڕێی،

بەسەرهاتو.. ناوگێژەنی کارەساتا،

ڕاگرێتو.. بیکا بەسەرپشكو رابەر

★★★

میوانە خۆشەویستەکان

من تەنیا بۆ ئەوە هاتم..

دیدەنیتان لەماڵی ئەم شانۆیەدا

وەك ماڵانی کوردەواری

بخەمە سەر دیدەکانمان

من پێش بینینتان ناکەوم

PDF 4 KURD

"ئاسك" چیەو چۆنەو بۆچی؟!
ئەتانەوێ و ناتانەوێ؟!
ڕقتان لێ بێو خۆشتان بوێ
من نادوێمو شانۆکەمان:
باخۆی بدوێ
میوانە خۆشەویستەکان من ئەڕۆم
لەگەڵ "ئاسك" جێتان دێڵم
دیسانەوە.. شەوتان ڕووناك
دڵتان ڕووناك. "ئەڕوات"

"پەردەکە بەتەواوی ئەکرێتەوە حیکایەتخوان، لەجێگەی بۆ تەرخان کراوی خۆیدا ئەبینرێ، لەم دیمەنەدا، دیوی ناوەوەو بنەبانی شانۆکەو، ڕووناکی بەتەنیا لە بەژنی حیکایەت خوان ئەدرێو بەپێی هەموو بزوتنەوەیەکیشی چەپکە تیشکەکە لەگەڵیا ئەڕوات".

**حیکایە تخوان:**

هەبو.. نەبو.. دێرزەمانێ
کاتێ باپیرە گەورەمان
تینو تاوی بازۆکانی ئەچوون بەگژ
تاوێرەبەردی چیادا
کاتێ هێشتا خوێنی لاویی ئاگرێ بوو
لەلەشیانداو
چۆکی بەتۆفو وەیشومەی:
گەوەی شاخەکان دا

PDF 4 KURD

سەردەمێ بوو.. ژیان ئاوا بەرپێکانی
رۆشن نەبوون
پەنجەرەی بیر.. لەسەر وشە داخراو بوو
نسێی زانین.. بەستەڵەکی بێ هەتاو بوو
لەورۆژەدا.. هۆشیش وەکوو قوتیلەکان
کز ئەسووتا
نەی ئەتوانی تاریکایی ناو دارستان
رووناك بکا
هەژارەکان لەناو گەرووی،
مەرگو ژاندا
پارووی گریاویان قووت ئەدا
تا گزنگیان ئەخستە ناو:
دوای ئێوارەی ئەموستە چاو
رەنجیان ئەداو.. رەنجیان ئەدا
★★★
لەودەمەدا..
پەندی پیران.. ڕازەڕاوێ بوو
یاسا لەناو ئەودا ئەزا
گرێ کوێرەی گیروگرفت
ئەدرایە دەس خۆشەویستی بیکاتەوە
تاکوو گفتار.. لەئاوێنەی رۆژگاردا..
شەوقی چاکە بداتەوە..

PDF 4 KURD

**ڕۆشنی کات بەپێی کردار**

★★★

**هەبوو.. نەبوو لەودەمەدا**

**گوندێ هەبوو**

**پێیان ئەوت: گوندی ((خەزان))**

**لەبناری چیایەکدا.. ڕاکشابوو**

**سەری لەناو نزارێکداو،**

**قاچەکانی لەناو شەپۆلی توڕەبووی،**

**چەمێکدابوو..**

**چیا هەزار بەهەزار و سەختو سەرکەش**

**گەلیی تەنگی**

**پلەی خزی**

**ملەی بەرزی**

**ئەشکەوتی قووڵو زەبەندی**

**جەنگەڵیو.. دارودەوەندی**

**موچڕکی ترسو سامیان، تیا:**

**نشیمەن بوو**

★★★

**پایزێ هات.. سەرمای چیا**

**داروباری ڕووت کردەوە**

**چەم.. هەڵ لەرزی**

**شوانەی گوندی مل نوقم بووی**

PDF 4 KURD

ناو فەرەنجی..
دەستی سەر گالۆکی تەزیی
خەڵکی خەزان..
بەر لەهێرشی ناکاوی تووشی زستان
کەوتنە خۆیان "تاریکی، ئەڕوات"

"شانۆ رووناك ئەبێتەوە، دیمەن گوندەکەیەو شوانی گوند (پیرۆت)ەو، بەقەد پاڵی چیاوەیەو پاڵی داوە بە گابەردێکەوەو خەریکی شمشاڵ لێدانە، هەر دوای چەند ساتێ، بەبێزارییەوە، شمشاڵەکەی ئەکاتەوە بەبەر پشتێنەکەیداو هەڵئەستێتە سەرپێو ئەکەوێتە هاتووچۆکردن، ئینجا لەبەر خۆیەوە ئەڵێ":

**پیرۆت:**

چوار ساڵ..چوار ساڵ.. چۆن تەواو بێ؟!
ئەی کێ ئەڵێ تەواویش بێ..
ئەو.. ئەمداتێ
ئەی کێ ناڵێ هەموو ڕەنجم بەبا نادا
ئەی کێ ناڵێ؟!
- وچان -
وەك دلێ.. ئەم دێیە دڵم لەو کرمێیە
- وچان -
خوێنی ئەکەمە کاسەوە
چۆنی نادا؟!
واجارێ سێ. ساڵیم پسان

PDF 4 KURD

**خوا گەورەیە.. خوا.. خوا**

**ـ وچان ـ**

**نە ء.. ناتوانێ.. گوندی خەزان**

**گەورەو بچوك.. لەو بەڵێنە ئاگادارن**

**ئاشناو رۆشنا.. لەگەڵ مندان**

**نە ء.. ناتوانێ!**

**ـ وچان ـ**

**ئاخ شوانکاریی.. ئاخ تەنیایی**

**هەرخۆم، بێکەس، خوایە.. خوایە**

**بۆ نەتدامێ تەنیا خوشکێ**

**گەروابوایە..**

**ئێستە من وا کوێرەوەریم**

**ئەم شاخو ئەوشاخ ئەگێڕا؟**

**ـ وچان ـ**

**ماڵم ئەبێ؟!**

**ئەبمە خاوەن چەند سەرمەڕێ؟!**

**خۆم بۆ خۆم شوانێتی ئەکەم؟**

**تەم لەسەر چاوم لائەبەم؟**

"بێ دەنگی، زەردەخەنەیەك ئەیگرێ، گوڕو تینێکی دێتەوە بەبەردا".

**بەڵام لەبەر چاوە جوانەکانی خاوەر**

**چۆن دەربەست بێم؟**

**چۆن بهێڵم.. کەبێزاری دڵ کوێرم کاو،**

ترس لەگیانم بنیشێ

دەربەست نایەم.. ئەهێنێ گەر

چاوەڕوانیم.. دەساڵی تر توول بکێشێ

دەربەست نایەم،

دەربەست نایەم!

- وچان -

مەلای دێ

ئەودنیا دیدەیە

راست ئەکا.. پێم ئەڵێ:

کوڕم ئارام

ئارامی (ئەیوب)ت هەبێ.

- وچان -

مەلام دی پێی ئەڵێم

قوربان تۆ.. هەر ئەڵێی.. ئارامی (ئەیوب)و..

پێم ناڵێی.. کام ئەیوب؟! لەکوێ؟!

پێی ئەڵێم: حەز ئەکەم بزانم

ئەو.. چەند ساڵ.. ئارامی گرتبوو

ئەویش هەر وەکوو من

حەزی لە:

خاوەرێ کردبوو

- وچان -

"مام وسوی رەزەوان دێتە ژوورەوە، ئەگاتە لای پیرۆت، سڵاو دەکاو لەتەکیەوە دائەنیشێ"



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**پیرۆت:**

وەی سەرچاو مام وسوو
ونی.. ون.. ناتبینم
قسەتم ئەوەندە پێخۆشە
وەك تینوو وەهام بۆی
پێم نالێی.. تۆ لەکوێی؟

**وسوو:**

پیرۆت گیان.. نازانی
ئیشو کار هێندە زۆرە
لەبن دێ؟!
خوا ئاگای لێیەتی
سرەوتم هەر نییە!

**پیرۆت:**

راست ئەکەیت.. ئەزانم خۆت تەنیاو،
رەزەکەش..

**وسوو:** "قسەکەی پێ ئەبڕێ"

مەپرسە.. ئەوەتەی هەستاوم
من هەر داو دائەنێم بۆ رێوی
ئەزانی.. چی ئەکەن بەو رەزەم
مەپرسە.. ئەم سەرەم چەند قاڵە
وەڵڵاهی نازانم چی ئەکەم!

PDF 4 KURD

**پیرۆت:**

**پێم بڵێ.. ئەمڕۆکە.. هیچت گرت؟!**

**پێوە بوون؟!**

**مام وسوو.. گوێ بگرە**

**ئەمجارە چەندت گرت.. هی منن**

**وتت چی؟!**

**وسوو:**

**دوێنێ چوار پێوە بوون**

**چاویان وەك**

**پشكۆی ناو.. ئاگردان**

**زیتە زیت**

**بریسكو هۆڕیان بوو**

**پێش وەخت.. من قەولم پێدابوو**

**ناردمن بۆ كوێخا**

"بەپێكەنینەوە"

**دیارییەك بۆ ماڵی كوێخا بێ**

**ئەی دیاریی تۆش نییە؟!**

**پیرۆت:** "مام وسوو دێتە پێشەوە"

**مام وسوو.. گوێ بگرە**

**تو خوا گەر گوێ نەگری..**

**گێژاوی ناو سەرم..هەتا بێ**

**تورە تر..دەروونم لوول ئەدا..**

PDF 4 KURD

## دیمەنی پێنجەم:

"شانۆ ڕووناك ئەبێتەوە،بێ ئەوەی دەسکاری هیچ دیکۆرێکی دیمەنی لەوەوبەر کرابێ، هەرچی ئەکتەرەکانی ناو ئەم شانۆ گەرییەشە ڕیزبوون،دەرهێنەر وەك یەکەم جار لەدەست پێکردنی یەکەم تابلۆدا دیمان، دێتەوە بەردەمی شانۆکە و ڕوو ئەکاتەوە بینەران"

**دەرهێنەر:**

**میوانە خۆشەویستەکانم**
**ئا بەم جۆرە..شانۆگەریی**
**" ئاسك " تان دی و،ئابەو جۆرەش**
**کۆتایی هات..**
**گەر ئەپرسن**
**منیش وەك ئێوە نازانم**
**پیرۆت ئاسکەموبارەکی..بۆ داگیرا؟**
**گەڕایەوە؟چی بەسەر هات؟**
**لەگەڵ خاوەر بەیەکتری شادبوونەوە؟**
**یاخود لەملەی بەرزەوە**
**بەرەو خەرەند،هەڵدێرا و کەوتە خوارەوە؟**
**منیش وەك ئێوە نازانم!**
**ئەمجارەشیان تەنیا من بۆ ئەوە هاتم**
**لەبەر دەرگای**

PDF 4 KURD

**ماڵی ئا ئەم شانۆیەدا..ڕاوەستام و،**

**ماڵ ئاواییتان لێ بکەم**

**بەڵام بەر لەوەی بڕۆن و بەڕێتان کەم**

**ماوەم بەنێ**

**یەك یەك ناوی ڕاستەقینە و،**

**ئەکتەرەکانی " ئاسك "تان**

**پێشکەش بکەم...**

"یەکە یەکە دەست ئەکا بە پێشکەش کردنی هەموو ئەکتەرەکان"

**ـ بێ دەنگی ـ**

"بارِژنی ئاسکەکە ئەبیسرێتەوە،تاریکی"

- کۆتایی -

PDF 4 KURD

# ڕووبار

شاعیرانی ولاّتەکەم!
بۆچی خۆتان لەناو تەنها
دەوارێکی هۆبەی شیعرا
قەتیس ئەکەن؟!
بۆ لەیەك ئاواز ئەخوێنن؟!
بۆ تۆوی گوڵێك ئەچێنن؟!
چاوی شیعر..کوێ نابینێ؟!
گوێچکەی شیعر..چی نابیستێ!
خەیاڵ کوا سنووری هەیە!
بەهرە کوا ڕێی دووری هەیە
بڕوا بکەن!
ئا ئەم دڵە بچکۆلەیە
کە ئەوەندەی هەرمێیەکە
نەك سەر زەمین
گەردوون جێگەی تیا بۆتەوە و
زەمانیشم تەنها نووکی
بەگێنگڵی قەڵەمێکە!

1984

PDF 4 KURD

# کوڕی زەریا

بۆ صەمەدی بیهرەنگی

لەشەوێکدا کە تەم و مژ
وەك دەم و چاوی "ڕەزاشا"
لەتاراندا گرژ و مۆن بوو
ئەو "خۆر و شێر و شمشێرە"ی
بە ئالاّوە لکێنراون
بێزار بوون و بەپێ دزکێ
پشتیان بۆ یەکتری دانا و
هاتنە خوارێ.
شمشێرەکە خۆی هەڵدا بۆ ناو مشتی خۆر
خۆریش سواری کۆڵی شێر بوو
کەوتنە ڕێگا
لە شەقام و مەیدان و کۆلاّنی شاردا
ئەگەڕان بۆ ناو نیشانێ
ـ بۆ کوێ ئەچن؟!
دەنگەکە وەك هاژە وابوو
خۆر ئیستێکی کردوو وتی:

ـ تۆ کێی؟!
ـ کوڕی ڕووبار و زریانم
منم "صەمەدی بیهرەنگی "[1]
خۆر ناسێوە
بۆی پێکەنی
هەردوو دەستی بۆ درێژ کرد
ـ ئەمە تیشکێکی خنکاومە و
لە زەریاوە هاتۆتەوە
شمشێرەکە بە دەنگێکی
تیژ و باریك هەڵیدایە:
ـ ویستیان تۆ بەمن بکوژن!
بمکردایە بەرگیان لە زێڕ بۆ ئەکردم
بەڵام نەمکرد..
چونکە ئەمزانی ڕۆژێ دێ
ئەمکەیت بەناوونیشان و
تابلۆ بۆ کورتە چیرۆکێ.
پیرە شێری دڕ نەڕاندی:
ـ تاکوو ئەمڕۆش ئەو چیرۆکەی
ناوی منی تیا هێناوە
پۆلیسەکان لێی ئەترسن
چونکە کەدەستی ئەدەنێ
چیرۆکەکە هەڵمەت ئەباو.


PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بەسەریاندا ئەنەڕێنێ
صەمەد مات بوو
بەدەنگێکی ئێجگار هێدی
دواو وتی:
ـ بۆ کوێ ئەچن؟!
وا ئەزانن سەردەمی سەگی پۆلیسی
بۆنی خۆر و شێر و شمشێر و ئاو ناکات؟!
بۆ کوێ ئەچن؟!
کە خۆر گڕی چاوانی خۆی
هاویشتە ناو دوو گلێنەی
چاوەکانی صەمەدەوە
ئەوسا وتی:
ـ لەبەر ئەوەی چاوی وشەت
لەچاوانی
منداڵە لانەوازەکان ناتروکێنی
لەبەر ئەوەی هەورە بروسکەت هاویشتە
دڵیانەوە و هەتا ئێستەش
لەناویانا دێیت و دەچیت!
بۆ سوار نابی لەگەڵماندا و
من بخەیتە گیانێکەوە بمباتەوە
بۆ ئاسمانێ
خۆری تیا زیندانی نەکرێ!

PDF 4 KURD

شمشێر سەری گوڵ و باخچە نەپەڕێنێ!
شێر ئاسکە بێکەسەکان نەترسێنێ!
صەمەد سوار بوو
لەپاشکۆی خۆرەوە سوار بوو
بردنی و هەر
بردنی تا گەیاندنیە:
ئەو گوندانەی شانی ساڵیان
داداوەتە سەر قەراغی
مەرگی دەغڵ و کێڵگەکانیان
ئەو شارانەی قفڵ لە قوڕگیان دراوە
ئەو گەڕەکانەی دەرامەت لەناویاندا
بە دارشەق هات و چۆ ئەکات
ئەو ژوورانەی گەر بە ڕێکەوت
تووتکەکانی "شابانوی "ی شۆخ
بە لایاندا تێ بپەڕن
لووتیان ئەگرن
ئەو..ئەو..ئەو..ئەو!
صەمەدی ماندوو ئارەقی ناو چاوانی
بەگوڵ ئەستێرەیەك سڕی و ئینجا وتی:
ـ ئەمێننەوە؟!
یان ئەچنەوە بۆ ناو ئالآ؟!
ئەوەی دیتان هەورەکانی

PDF 4 KURD

ناو دڵ و سەری ئێرانە.
یەکەم جار خۆر
وتی:
ـ تۆ خۆت لەهەر کوێم دائەنێی
دام بنێ یان،
ئەمدەیتە دەستی هەرکەسێ
صەمەد خۆری هەڵگرت و بردی تاکوو دای
بە نووسەرێ
کە داستانی تیربارانی
وڵاتی خوێن و هەتاوی ئەنووسێوە و
برسیشی بوو
نووسەرەکەش خۆرەکەی خستە دڵێوە و
دڵێشی دا بە هەژاران!

★ ★ ★

کە صەمەد هاتەوە
ڕوانی شێر تووڕەیە
شێر وتی:
هەر شوێنێ مەترسیی
لێ ئەکرێ لەوێ بم
بێ سوارم بەبێ سوار ڕام مەگرە.
صەمەد ڕۆی..هاتەوە
سوارێکی لەگەڵ بوو

کەڵەگەت، مەچەك پڕسنگ تووکن
سوارەکە ڕاستەوخۆ چووە سەر
کۆڵی شێر
"سەرەتا نەمناسی سوار کێیە
نەمدیبوو برینی
هێندم بیست کە ڕۆشتن
شێرەکە پێی ئەوت:"موعینی "[2]
هەر شمشێر مایەوە بێ ئارام
بەدەنگە تیژەکەی خۆی وتی:
ـ من دیاریم بۆ کام پیاو؟!
چ دەستێ ئەمگرێ؟!
ـ دەستی من!
منداڵێك ئەمەی وت هەشت نۆ ساڵ
ـ لەکوێوە تۆ هاتووی لە کوێوە؟!
ـ لەدنیای چیرۆکی
صەمەدی بیهرەنگی و
ناو چاوی ئەوەوە
من هاتووم!
ـ ئەی ناوت؟!
ئەی تۆ کێی؟!
ـ خەسرەوم!![3]
بیهرەنگی ماچی کرد

**شمشێر خۆی هاویشتە**

**ناو مشتی بچکۆلەی خەسرەو و**

**پێکەوە چوونە ناو دەربەندوو**

**ئەشکەوتی کێوەکان.**

**بەتەنیا بیهرەنگی مایەوە**

**کە زەریا بانگی کرد**

**لەسەر خۆ پێی هەلگرت**

**بیهرەنگی چوەوە ناو ئاو و**

**لە ئاودا**

**کازێوەی بەیانی**

**ئێرانی بەدی کرد.**

تشرینی یەکەمی 1979

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

# له ڕاکشانێکدا

نیوه شەو بوو
ناو نیشانی دوا هۆنراوەم هەڵیسانم:
ـ گەر ئەتەوێ
خەوی شیعرت لێ نەزڕێ.
هەستە و سەرم ئاسودەکە.
ـ چیتە؟!
ـ وشەکانت
هەندێکیان وڕکیان گرتووە!
ـ لەچی؟!
ـ بیانبینە!
"با " هات
گڤەیەکی کردوو وتی:
ـ ئەو دارستان و دەربەند و پێ دەشتانەی
لەم شیعرەدا تۆ منت تێ فڕێداون
هێندە بەلەشی من تەنگن
هەر کە هەڵم کرد ئەزانم
لە بەرما ئەدڕێن و ئەوسا...

PDF 4 KURD

ـ ئەی چیت ئەوێ؟!

ـ ئەڕۆمەوە بۆ دەربەندوو

دارستان و پێ دەشتە ڕاستەقینەکان

لەم دێڕانەدا هەڵناکەم!

ئەگەر منیشت خۆش ئەوێ

ئەتوانیت بێیت دیدەنیم کەیت.

کە " با " ڕۆیشت

"کەو " هات و وتی:

ـ ژوورەکانی ناو شیعرەکەت

چەندە جوان و ڕازاوەش بن

هەر بە قاقەزیان ئەزانم

بەفر دەست نەکاتە ملم

من ناخوێنم!

ـ ئەی ئەوە نییە وا بەفرم

بۆ باراندووی؟!

ـ ئەو بەفرەی تۆ باراندووتە

کە ماچی ئەکەم نابزوێ!

پەیکەرێکی سپییەو من

دڵی خۆم نادەم بە پەیکەر!

کەو هەڵفڕی و ڕووبار وتی:

ـ تا لێرە بم درەختەکان سەوز نابن

کێڵگەکانیش ئەوەندەی تر تینوو ئەبن.

PDF 4 KURD

**ـ ئەی ئەوە نییە درەختم**

**بۆ ڕواندوویت و**

**کێڵگەشم بۆ دروست کردوویت؟!**

**ـ من ئەتناسم**

**تۆ چەند شاعیرێکی ڕاڕای**

**هەر ئەوەندەی**

**دڵت کرمێ بوو لە شیعرێ**

**ئەوسا بە نووکە قەڵەمێ**

**دارەکانت لە بنەوە هەڵ ئەکەنێ**

**کێڵگەکانت ئەسڕێتەوە..**

★ ★ ★

**" با "..ڕۆی**

**"کەو"..ڕۆی**

**ڕووبار ڕۆیشت و**

**ناو نیشانی شیعرەکەش ڕۆی**

**بەتەنیا وشەی "خەم" نەبێ**

**جێی نەهێشتم و**

**بەجووتە ڕاکشاینەوە.**

1978

PDF 4 KURD

# داستانی مامەیارە

دڵدارانی چیای "بۆتان "
بەدەم شنەی "لاوك"ەوە
ئەی گێڕنەوە:
هەموو ساڵێ: مانگی گوڵان
دەمەو عەسری ڕۆژێکی سەوز
بۆ چەند ساتێ
چاویان لێیە:وا کاکە مەم
لە کەژاوەی
هەورێکی سپی نزمەوە
بە هێواشی
دێتە خوارێ و،
لەناو خەرمانەی گوڵاڵەی ترۆپکێکدا
ڕائەوەستێ
چاو ئەگێڕێ..
هاتۆتەوە و.. چاو بۆ "خاتوو زین "ئەگێڕێ.
دڵدارانی چیای "شاهۆ"
بەدەم شەپۆلی "هۆرە"وە

ئەیگێڕنەوە:
هەموو ساڵێ لەڕێ بەندانی زستانا
بەیانی ڕۆژێکی سپی
بۆ چەند ساتێ:
چاویان لێیە "برایمۆك"هاتۆتەوە و
لەژێر تاقی پەلکە ڕەنگینەی سەر بەفر و،
لەبەر پەنجەرەی هەتاوی گورگەزێدا
ڕاوەستاوە و
چاوەڕوانی دەرکەوتنی "پەریخان"ە.
دڵدارانی شاخی"گۆیژە"ش..
بەدەم قاسپەی "قەتارە"وە
ئەیگێڕنەوە:
هەموو ساڵێ لەمانگی گەلاڕێزاندا
لەخۆرنشینی ڕۆژێکی خەماویدا
چاویان لێیە:
مامەیارە[4].. ئەسپ سوارێکی غەمگینە و هاتۆتەوە
چاو ئەگێڕێ
چاوی پڕ پرسیار ئەگێڕێ و بە نەرمەغار
سەروخواری "سیروان"ئەکا.
مەکۆی خولیای
هەر وەك چمکی،
مشکییە ڕەشەکەی ئەو سەرە بێ سرەوتەی



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دێت و ئەچێ
وەکوو سیروان خۆی کردبێ بە هەناویا
لە نێرینەی ئازارێکی بێ بواردا.
شەپۆلی عەشقی هەڵ ئەچێ
بەرە..بەرە
خولیاکان ئەبن بە پلە و،
دانە بەردی خزی "بەمۆ"و
بە سەریاندا هەڵ ئەگەڕێ
لەو..بەرزەوە
مامەیارە، ئەسوتێت و چاو..ئەگێڕێ
مامەیارە، جێ ژوانە کۆنەکانی بەدی ناکا و،
دوو سێ دڵۆپ فرمێسکی ڕوون
دێنە قسەو
لە پاش تۆزێ
لەناو چاڵی چەناگەیدا وشك ئەبنەوە
لە پڕێکدا:
مامەیارە، لە پڕمە و حیلەی ئەسپەشێی
شەلاڵ بە عارەقی شین و مۆری ڕێگە
دائەچڵەکێ:
ـ چ کارەساتێکی چڕە
چۆن بتبینم؟!
لەم تەمەدا

PDF 4 KURD

نه لق چاوی وا له "پەله" و
نه پەل گەلای خۆی ئەبینێ
چ کارەساتێکی چڕە!
شەپۆل زریکەی شەپۆلی،
تەنیشتی خۆی نابیستێ و،
ڕۆژ سەعاتی خۆی ون ئەکا.
منیش خەمێکی ڕیش سپیم
له مابێنی "ئەسکی کۆیه و شارەزوور"دا
سەری بڕاوی ڕۆڵەی خۆم
لەگەڵ خۆمدا ئەگێڕم و..
له چاوانی ئەبڵەق بوویان
ورد ئەبمەوە.
" ئەو چاوانە:
گولاڵەی هەڵپچورکاویان.. له بندایه
ئەستێرەو مانگی کوژراویان.. له بندایه
تەرمی حەیران و لاوکیان.. له بندایه"
ماچیان ئەکەم
دەست به قژیاندا ئەهێنم
یەکە..یەکە..ئەیان دوێنم
ئای که عومرێکی درێژە
من سەری سەودای، بڕراوی
کوڕ و کچی خۆم ئەدوێنم

چیم لێ ئەکەن؟!
زۆر ستەمە..دار بە داری
دارستانێ هەمووی بگری و،
تۆش نەتوانی
فرمێسکی چاوی گەلاّیەك چییە بیسڕی!
زۆر ستەمە
لەم هەوارە چۆلاّنەدا
بژیت و گوێت
لە کۆتەڵی بێ کۆتایی و لاوانەوەی،
کەژ و کێو بێت
مەرگ: داڵێکی باڵ ڕەشی ڕمووزنە
چاوم لێیە:
باڵ لە خوێنی،
لەبەر ڕۆشتووی گوندەکانم
وەر ئەدات و،ئەفیڕێنێ و
بانگی نەهاتە ساڵ ئەدات
چ کارەساتێکی چڕە
چۆن بتبینم؟!
ـ مامەیارە،ئەسپ سوارێکی تووڕەیە و
هاتۆتەوە..
بەرەو هەر مەڵبەندێ ئەچێ
خوێن جلەوی لێ وەرئەگرێ



PDF 4 KURD

ڕوو ئەكاتە هەر تەلانێ
پەپوویەك دێ و
لەسەر قەڵپۆزی زینەكەی
هەڵ ئەكورمێ
لەناو تەم دا
حیلەی ئەسپەشێ..هاوارە
مامەیارە:فەقیانەكانی هەڵ ئەكاو
یەك دوو ئاوزەنگی لێ ئەدا.
وەكوو نەورۆز هەڵ ئەگیرسێ و
ئەچریكێنێ:كێ دڵدارە؟!
ـ هۆ مامەیارە..هۆ مامە
ئەو داڵە "نەجیب پاشا "یە
ئەو بەردە كێلەش لەسەری هەڵنیشتووە
جێ نزرگەی
دوا خەوی "ئەحمەد پاشا"یە
ـ"نەجیب پاشای"ی سەر لەشكری
سوڵتان كە هات
دەستی نایە بینی گوڵ و
نانی كوێر كرد
بە "ڕم" سەری
وشەی نالی و كوردی هەڵگرت
لە دووكەڵدا "كۆیە"ی خنكان

چ کارەساتێکی چڕ بوو!

ـ بیگێڕنەوە!
بەرە بەیان لەسەر سنگی ئەسکی کۆیەی
ئەرخەوانیی.قریوەی سوارەی بابان و،
حیلەی ئەسپ و گرمەی تۆپی مامەیارە لە دەربەند و
شیو و دۆڵی سام لێ نیشتووی خەواڵودا ڕژانە ناو
ڕیز بە ڕیزی شڵەژاوی تورکانەوە. دەنگدانەوەی
ناڵەی ئەشکەوت. گێژەڵووکەی ژێر سمی ئەسپی
سەرکێش و بریسك و هوڕی شمشێری بە هەسانی
ڕق تیژ کراو، درێژەیان دا بە جەنگی شەووهەتاو.
نەجیب پاشا هەر وەکوو داڵە کەرخۆرە لەسەر
گردێ هەڵنیشتبوو،لەخەم خۆرکی ڤینی کوردا
فەرمانەکانی ئەچەڤین. ترسیش وەکوو دارکونکەرە
دڵی ئەخوارد. لەو ساتەدا مامەیارە هەڵۆیەکی
بەرزە فڕی چاو گڕدار بوو. بەسەر سەری ئەو
داڵەوە گڕی ئەخوارد. داڵ تۆقیبوو. هەڵفڕینی
بیرچووبۆوە. ڤیڕەی گەیاندە ئەستەمبوڵ.
فێستەکانی بابی عالی گردبوونەوە. فریای کەوتن
ڕەنگی پیلانێکیان بۆ ڕشت پیلانی دوو سەر
وای ئەوت:

PDF 4 KURD

1- سوڵتان باوکە
دڵی باوکیش
لە بەفری "پیرەمەگرون "ی
قەڵەم ڕەوی بابانەکان سپیترە
لە بەخشیندا
دەستی سوڵتان
لە مێرگەکانی "شلێر"و
دەشتی "بیتوێن "سەوز ترە!
سوڵتان فەرمووی:
لە ناوەڕاستی مەیداندا
دەوارێکی سپی هەڵدەن
سەر بەرەو خوار ڕم و شمشێر هەڵبواسن
خوا بخەنە ناوەندەوە
لەجێی ئالاّ..قورئان هەڵکەن

2- لە بیرتان بێ
پواز چوو بۆ کوێ دوای کەون
"لییرە "سیحرە و..بریقەکەی
ئاوی چاوی کەڵەسواری بابان ئەبات
"لییرە"سیحرە و..بیان دەنێ
کە وەریان گرت
ئەبنە توولە و دوا ئەکەون

PDF 4 KURD

ـ گڕی پیلان،وەك لە وشكە پووشی دەشتی،
هاوینێكی درەنگ بەربێ
هەتا ئەهات لەئۆردووی سوارەی بەباندا
ئەتەنێوە..
لەناو چاڵی كونە ڤینی
چەند دڵێكدا..
هەر پس مامی "ئەحمەد پاشا"
ئاسكی وەفایان سەر بڕی
خوێنی بەڵێن،تك تك بەڕیش و سمێڵی
ڕوو زەردانا هاتە خوارێ
مەشخەڵانی هەڵمەتی سوار دامردەوە
تۆپەكانی مامەیارەش
ئەو...ڕۆژانە
لەبەر سێبەری دەواردا
خەویان لێ كەوت
چ كارەساتێكی چڕ بوو!
ـ داڵ پشووی دا. داڵ تێری خوارد. داڵ كەوتەوە
بەرزە فڕی. داڵ بەنینۆك ئەرزی ئەدڕی.
شەڕی بە ڕەشەبا ئەفرۆشت. لیرەی ڕۆ كرد.
خەزنەداری ئەحمەد پاشا كورتە بنەی دڵ دڕكەزی
كە لیرەی دی چاوی چنۆكی داپچڕی لە بەردەمی
ئاوێنەدا خۆی ئەبینی بۆتە پاشا كلاّومشكی

PDF 4 KURD

فڕێ داو فێستی سووری کردە سەری لە بەردەمی
ئاوێنەدا قاقا بە سوارەی بەبان و مامە یارەوە
شاخ و داخ و دێی سك سووتاو پێ ئەکەنێ لە بەردەمی
ئاوێنەدا خۆی ئەبینی ڕاوەستاوە و لەبەر پێ یدا
بەچۆکدا دێ: سلێمانی چ کارەساتێکی چڕ بوو
- ڕۆژێکی تر،تاریك و ڕوون
لەسەر سنگی "ئەسکی کۆیەی "ئەرخەوانیی
سوارەی سوڵتان
وەك باوبۆران
وەك برووسکەی پێش ڕێژنەی
هەورێکی تاڵ
وەکوو لوورەی ڕەوە گورگێ
دڕیان بە گەوە و لووتکەدا
هاتنە پێشێ..
وەکوو مافوور
دەشتەکانیان پێچایەوە..
کڵپەی ناو دەمی ئەژدیهای دەشتی کۆیە
ئاسنی تیا ئەتوایەوە.
سام: لافاو بوو
لەناو سامدا
هەربەتەنیا مامەیارە
ورەیەکی داگیرساو بوو.

**ـ ئەی مامەیارەی بەتەنیا**
**جێ ماو لەناو ژیلەمۆدا**
**وا سوارەی تورك**
**گەیشتنە سەر تۆپەكانت**
**زامی باسك و دەفەی شانت**
**زنەی خوێنیان گەش و ڕوونە**
**گوڵە باخ لەسەر فەقیانەت**
**ئەنەخشێنن**
**چاومان لێیە:**
**لەسەر چۆپی مەرگی خۆتا**
**بەرامبەر خۆر هەڵیان ئەبڕی**
**كە خۆر و خوێن ئەگەن بە یەك**
**باڵات ئەبێتە ئاوێنە و**
**شەوقێكی سوور ئەداتەوە لەچاوی كەژ**
**ئەی مامەیارە..تۆ ئێستە**
**بەو گردەوە..**
**دار ئەرخەوانێكی تەنیای**
**دێیت و ئەچی و..**
**مردن بە باڵای ژیانی**
**لووتكە ئەبڕی!**
**ـ تا چاو بڕكا ئۆردووی كوللە زەرد ئەچنەوە.**
**ڕەش ئەچنەوە. توركی كوللە ژیان هەر بە كاڵێی**

**ئەخۆن. ئالآی سولّتان ئاسمانێکی خوێناوییە**

**"مانگ"ی خۆی ئەتك کردووە.تا چاو برِکا پەل و پۆی**

**رِەش داگەرِاوی داری سووتاو تەرمی کێلگە و دەغلّ و**

**دانیان هەلگرتووە.**

**ـ سولّتان: دەس نوێژی بەخوێنی ساوایانی**

**کورد شتووە.ژنی سولّتان بەکل چێوکی**

**زوخالّی ئێسکی "حەبیبە"و "شەم" ی شەیدا**

**ئەو چاوانەی خۆی رِشتووە.چ کارەساتێکی چرِە**

**ـ زامەکانی لەشی یارە**

**دەم و لێون**

**ئەو وەختەی تۆپ ئەگرمێنیّ**

**نم..نم..نم..نم**

**ئەبارێتە سەر خۆلّەمێش**

**گولّ لە ئاگردا ئەپشکویّ**

**چ وەرزێکی**

**نەبیستراو و نەبینراوە**

**"کیّ کەی دی**

**خەزان:گولاّن برِوێنیّ"**

**ـ هاتنە سەری زەوی و ئاسمان وەك دوو بەرداش**

**لەبەر چاوی ئەخولانەوە و ئەسکی کۆیەیان ئەهارِی.**

**درەختی کەژ سەر بەرە و خوار ئەبوونەوە و بە قژ خۆیان**

**هەلّ ئەواسی.رِۆژ ئاوا ئەچووە رِۆژ هەلاّت.لووتکەکان**



PDF 4 KURD

بەسەر بناردا ئەشكانەوە. "بەور"ی زامدار ئەینركان و ڕاكشا بوو.ژەندرمەكان بەچوار دەوریا سونگییەكانیان كردە ئەڵقە. ئەڵقە لە دیلی بریندار ئەسڵەمێوە. هەنگاوێك و دوو هەنگاو و هەتا ئەهات ئەڵقەی سونگی بازنێ بوو تەسك ئەبۆوە.لەپڕێكدا:بیست دەستی ڕەش درێژ بوون و دایان بەسەر بارگیرێكدا و بە چوار لانەی ڕقێكی ئەستوور و زبر شەتەكیان دا. بارگیر رووی كردە خێوەتی نەجیب پاشا

ـ یارەی زامدار

یارەی دڵدار

گوریس لەزام شەتەك دراو

بەسەر پشتی ولآخەوە

ڕێ ئەكات و،

وردە..وردەش

كزەبایەك، بە شێنەیی

لە باشوورەوە هەڵئەكات

كزە با دێ و

بە چرپە باسی تاوانی

خەزنەدار و خزم و خوێشی

ناپاك ئەكات.

كزەبا دێ و..

بە چرپە باسی ئازایی

PDF 4 KURD

مامەیارەی..فەقیانە سوور
بۆ گولاڵە زیندۆکانی
لارێ ئەکات.
ولاخ ئەڕوات.. بە هەورازا
دیلی زامدار.. بۆ بەردەمی
خێوەتی پاشا سەر ئەخات.
ـ لەسەر دەیان ئەستوونی زیو
قوبەی ئاوریشمینی خێوەت
هەڵدرابوو.
خۆر بەو دیو ملەدا..داگەڕابوو
لە ناوەوە:
جێگەی حەریری ڕەنگاو ڕەنگ
لەسەر دۆشەك و سەر کورسی
ئەڵقە بەستووی
ناو دیوە خان..ڕاخرابوو
بە دیواری بەرەو ژوردا
پێستی پڵنگ و دەڵەك و
وێنەی سوڵتان..هەڵواسرابوو
"کوڕی پاشای بەر چلچراش"
لەناو قاقای پێکەنین و
جامی بادەی ئەستەمبوڵدا
وەك گێلاس سوور هەلگەڕابوو

PDF 4 KURD

لەناو پەرداخی زێڕینی
بەردەمی نەجیب پاشادا
چەپکێ گوڵی
کێوی کۆیە،دانرابوو
لەو شەوەدا
ئەو گوڵانە
چەند چاوێکی لێڵ و پێڵی
نامۆ بوون و
بەبێ دەنگیی
ئەگریان بۆ:مامەیارە!
ـ کە ڕۆژ بۆوە هێشتا دووکەڵی هەناسەی
پێ دەشت و شاخ، دوور و..نزیك. لە ئاسمانێکی
خامۆشی ڕەنگ مسیندا پێچێیان ئەخوارد. ئەسکی کۆیە
شەهیدێ بوو لە کفنی زەردەگیا و پووشی سەر
تابووتی لاشەیەوە هێشتا خوێنی لەبەر ئەڕۆی
بۆنی مردن و بارووت و لاکی ئەسپ و پارچە پەڕۆ و
کۆتەرە دار. ئەگەیشتنە لووتی گوندی دوورەبنار
کە خۆر هەڵهات وەکو ئەویش بۆ یەکەم جار
چاو لە کۆیەدا هەڵبێنێ، لە نێوانی هەردوو کەلدا
نامۆیەکی حەپەساو بوو. ڕەنگی ئاسۆ وەك روخساری
شۆڕە ژنێکی سیلگرتوو زەردێکی هەڵ بزرکاو بوو.
نەجیب پاشای پەڕ بەسەری سنگ بە نیشانەی

PDF 4 KURD

زێڕینی سوڵتان نەخشاو، طاوسێ بوو فیزی بایی و
ڕەنگاو ڕەنگی گیڤ کردوە. لە خێوەت هاتە دەرەوە
باستۆنی یاقووت بە سەری بەرامبەری "هەیبەت سوڵتان"
ڕائەوەشان. بە کلکی باستۆن یەك دوو جار تەقەی
لە چەرمی چەکمەکەی قاچی هەستان،بۆڵەیەك و فەرمانی
داو ژەندرمەکان وەك زەردەواڵە ورژان، هێندەی نەبرد
دەموو چاوی مامەیارە تووڕە:وەکوو گێژەنی ئاو.
لەناو پەڵە قەمەیەکدا هاتە بەر چاو. وردە وردە
دەم و چاوی ناو قەفەزی سونگی و قەمە بە ئازار قاڵ
هاتە پێشێ تا گەیشتە بەردەمی داڵ

ـ کەواتە تۆی مامەیارە؟!

ـ بەڵێ منم..مامەیارە.

ـ چ شەیتانێ..

چوو بووە بن کلێشەی تۆوە؟!
چ جرجێکی کافرستان
دەروونی تۆی هەڵ ئەکۆڵی
چۆن بە تەنیا ئەچووی بەگژ
گەرداوی بەحری سوڵتان و
بێشەلأنی.. بلێسەدا؟!

ـ دەروونێ شەیتانی تیایە
گوڵ و نان و ئاو بکوژێ

ـ تەنیا نەبووم

PDF 4 KURD

من دار بەڕووی کەژەکان و،
شیعری "نالی"م لەگەڵدا بوو
تەنیا نەبووم
من ڕۆحی سپی مەولانەم
لە تەکدا بوو
من هەڤێ بووم، خۆم.. خۆم
لە پشتەوە پێکا
من سەر تۆپچی.. ئۆردووی خۆم بووم
پێم وترابوو
چارە نووست:
بە زنجیری
تۆپەکانتەوە بەستراوە
من ئەو زنجیرەم بەرنەدا
ـ ئەی ئێستاکە؟!
ـ ئێستە دیلم
من..مردنم
زۆر جار ڕاوناوە تا ئێرە
ڕامەوەستن
ئەوە شمشێری دەستتان و..
ها.. ئەوەش تەختی گەردنم.
ـ دوژمنی ئازا..ناکوژم.
ـ بیبەنەوە ـ

ـ ئەی مامەیارە
ئەی کڵپەی ناو قەفەزی
شەوی ئێستە
دامەمرکێ
کە چاوانت لرفە ئەکەن
بە پشتاوپشت..
تاریکی بۆ دواوە هەڵدێ
دامەمرکێ
کە چاوانت گڕ ئەسێنن
داڵ هەست ئەکا
پەڕو باڵی ئەسوتێت و
نێزەی ترسێ.. لە بێخەوە
پێکەنینی دوێنێ شەوی
هەڵ ئەکەنێ.
ئەی مامەیارە.. تۆ ورەت
گێژاوێکی ترسناکە و..
خێوەتەکەی نەجیب پاشای
تیا ئەخنکێ..
ئەی مامەیارە..تۆ ئێشی و
کەچی چرای حەیرانی سوور
لەسەر سەری خۆت هەڵ ئەکەی!
ـ کاروانی شەو کاروانی ڕۆژ ڕەویان کردوو،

وردە وردەش ئازار: زامی لەشی دیلی
مامە یارەی بەجێ ئەهێشت. گۆشتە و زوونی
کۆنە برین بەسەر پێستی ڕەنگ کێڵگەوە
نەخشەیەکی بچکۆلە بوو لە خاك و خۆڵی بێژراوو
لە گردۆڵکە و باخ و ڕەزی سوتێنراوی میرنشینی
بابان ئەچوو کاروانی ڕۆژ کاروانی شەو کۆچیان
کردوو جارێك دووجار داڵ لە دڵی خۆیدا وتی:
"ئەگەر سەرکێشی وەك یارەم
لەگەڵدا بێ..
من بۆ سوڵتان
چین و ماچین
ئاسمان ئەگرم
چیاکانی هیمالایای بۆ سەر ئەبرم"
ـ بەلاّم یارە
برینێکی عاسی و گیرە
زامی خاك و زامی لەشی
نەدا بە پارە و بە لیرە
بۆ بابی عالی و بۆ سوڵتان
"پیرەمەگرون "ی سەری خۆی
دانەنەوان!
ـ ئەی چیت ئەوێ؟
ـ تەنها یەك شت

PDF 4 KURD

ـ چییە بیڵێ:
ـ ڕێگەم بدەی.. جارێکی تر
هەوای گۆیژە هەڵمژمەوە و
دەس کەمەوە.. ملی ئەزمڕ
ڕێگەم بدەی.. جارێکیتر
سلێمانی.. ببینمەوە و
وەك منداڵێ.. لە باوەشی
"پیرمەسووردا" ئارام بگرم
ڕێگەم بدەی
قومێ لەو ئاوەی سەرچنار
بخۆمەوە و
ئینجا بمرم!
ـ مامەیارە گەڕایەوە
ئێستە شاری سلێمانی،
بێوەژنێکی ڕەشپۆشە
لەژێر دارە غەمبارەکەی
" شێخ هەباسە"
کۆتەرەی ئەژنۆی ناوە بە کوانووی
سینەیەوە
پرچی شەو ئەهۆنێتەوە
چ کۆتەڵێکی بەسامە
مامەیارە:ئەسپی بێ سوار

PDF 4 KURD

بەچوار دەوریا ئەگێڕێت و..
ڕانك و چۆغەی
خوێنكیی. ،
شەهیدی داوە بەپشتی
ڕووتی ئەسپاو
سمكۆڵاَن و حیلەی ئەسپیش
لە هاژەی شین و شەپۆڕدا
تێكەڵی سیروان ئەبنەوە
چ كارەساتێكی چڕە
چۆن بتبینین؟!
ـ ساڵ هات و ڕۆی
بەلاَم خۆری كوردستانی
لەئاسمانی خوێندا..گیراو
هەر بەر نەبوو
تابووتی شەوی ڕیز بەستوو
هەوەڵی بوو، دوایی نەبوو
ئیستە یارە
پیرە مێردێكە كۆڵەوژ،
لەگەڵ هەموو بەبادانی
دووكەڵێكدا
ژیلەمۆی تەندووری ناخی
تێك هەڵ ئەدا.

PDF 4 KURD

لەگەڵ هەموو ئاوڕێکدا
قوڵپی گریانێکی تازە
لە ئەسپی کۆیەی سنگێوە
سەرهەڵ ئەدا.
ئێستە یارە،
ژانێکی پشت کۆماوەیە
یادێکی گۆچان بەدەستە و هەناسەسوار
بە کۆڵان و بازاڕ و شەقامی شاردا
سووڕ ئەخوات و،
سەری بڕاوی ڕۆڵەی خۆی
لەگەڵ خۆیدا ئەگێڕێت و
لەچاوانی ئەبڵەق بوویان
ڕائەمێنێ
لەپڕێکدا
مامەیارە لەبەر دەرگای مزگەوتەکەی مەولانەدا
ئێستێك ئەکاو ئەچێتە سەر سەکۆیەك و ڕووی هەتاوی
خۆی ئەکاتە نسێی دەروونی ئەو خەڵکەو پێیان
ئەڵێ:
ـ بانگتان ئەکەم
لەم شوێنەوە
تاشەبەردی هاواری خۆم
فڕێ ئەدەمە ناو گۆمی

مەنگ و کپی.. دڵتانەوە
ئەم بێدەنگییە نەکوژن
ئەتان کوژێ
ئەو دەڵە دێوە سەر نەبڕن
سەرتان ئەبڕێ
ئا..ئەم تەمە ڕانەماڵن
خواش ون ئەکەن
لق ئەبێ چاوی لە پەل و..
پەلیش گەڵای خۆی ببینێ
ـ من مردووم و ئێوە زیندووـ
یەك جێ بێڵن
سەد جاری تر
"ئەسکی کۆیە"ئەژێتەوە
لە جیاتی خەمی یارەیەك ئەبێ خەمی هەزار یارە
لە دەورتان کۆبێتەوە.
گوێ ڕابگرن
هەر خوا نامرێ، وەسێت ئەکەم:
من نامەوێ بە مردووییش هاوسێی گۆڕی
خەزنەدار و ناپاکانی ئەسکی کۆیەی شاخ فرۆش بم.
من لە سەیواندا مەنێژن ئەوان لەوێن.
جیامکەنەوە هەربەتەنیا لەسنگی گردی گولان دا
بمشارنەوە.
ـ ڕۆژ هات و ڕۆی بەیانییەك لەبەهاردا

PDF 4 KURD

گردی گوڵان مامەیارەی لەباخی سنگیا شاردەوە
گردی گوڵان چنارێکی هاتە قسەو بەدەم شنەی
"با" وە ووتی: لە ئێستەوە لەبەر پیرۆزیی
ئەم پیرە وا ناوی خۆم لەم هەوارە ئەکەمەوە و
ناوی ئەنێین گردی یارە
ـ ئەی مامەیارە
ئەی مێژووی گڕمۆڵە بووی
کونجی ئازار
لە خۆرنشینی چاوانتا
کازیوە ئەخوێنێتەوە
لە کۆنە زامی لەشتەوە
هەتا ئێستەش
بۆنی بارووت دێتە لووتمان
حیلەی ئەسپەشێکەی تۆیە
هەموو ڕۆژێ
لەو.. بەرزەوە
بەسەرماندا ئەحیلێنێ و
بانگمان ئەکات.
ـ ئەوا ئەمڕۆش
مامەیارە.. ئەسپ سوارێکی زۆر قۆزە و
هاتۆتەوە..
لەسەر لووتکەی پیرەمەگرون ڕاوەستاوە و
هاوار ئەکات
ئەم بێ دەنگییە نەکوژن

ئەتانکوژێ
ئەو دەڵە دێوە سەرنەبڕن

PDF 4 KURD

**سەرتان ئەبڕێ**
**ئا ئەم تەمە ڕانەماڵن**
**خواش ون ئەکەن**
**لق ئەبێ چاوی لەپەل و**
**پەلیش گەڵای خۆی ببینێ**
**مامەیارە..ئەسپ سوارێکی تووڕەیە و**
**هاتۆتەوە..**
**بەرەو هەر مەڵبەندێ ئەچێ**
**خوێن جڵەوی لێ وەرئەگرێ**
**لەناو تەمدا**
**حیلەی ئەسپەشێ:هاوارە**
**مامەیارە..فەقیانەی سوور**
**هەڵ ئەکات و**
**یەك دوو ئاوزەنگی لێ ئەداو**
**وەکوو نەورۆز**
**هەڵ ئەگیرسێ و،**
**ئەچریکێنێ:**
**کێ دڵدارە و**
**کێ دڵدارە؟!**

سلێمانی
مایسی 1980

PDF 4 KURD

# بەیتی ئاگر

"چیرۆکە شیعر بۆ نەورۆز"

ـ ساڵ نییە، پەل و پۆی، درەختی گڕگرتوو
چراخان لە کەژ و دەربەندا هەڵ نەکا.
ساڵ نییە ئەو گڕە چیرۆکێ بۆ عەشقی
کاوەیەك نەنووسێ و
بۆ مەرگی زوحاکێ
دۆزەخێ دانەخا.
ساڵ نییە.. ئەو گڕە ماڵ بە ماڵ نەگەڕێ و
دەستی یاد بە سەری،
نەورۆزدا نەهێنێ
ساڵ نییە.. پشکۆی ئەو.. ئەژدیها کوێر نەکا و،
تاریکی ڕاو نەنێ.
ئەم "بەیت"ی(5) ئاگرە، پشتاوپشت،
دەماودەم هاتووە
هەر جارەی بە ئێسکی،
کوڕێك و کچێکی "ئاسنگەر"
بڵێسەی خۆش بووە

دەئێستەش گوێ بگرە
بۆ بەیتێك لەم بەیتی دێرینی ئاگرە:

★ ★ ★

سەردەمێك بوو
دنیای تاریك و نووتەك
وەك ئەشكەوتی
قوولٚ و نسرمی بەسام
چۆكی ڕەشی دادابوە سەر:
گوند و شار و
ڕەز و دێبەر و شەقام..
گولە گەنمی چاو بەسەوزیی هەلٚكۆلٚراو
كوژراوی ناو برسێتی و قات و قڕ بوو
مالٚی هەژار
لە خەم سیخناخ
كوانووی هەژار
بێ پشكۆ و سارد و سڕ بوو
هەر دەستەیەك.. لەدابەستەی ئەستەموولٚ
كۆشكیان پڕ و.. ورگیان پڕ و
بەدەماغ.
ناو مالٚیان پۆشتەو پەرداخ.
ئەو سەردەمە.. نەهەنگەكان
نەهەنگی والی و سولٚتان

PDF 4 KURD

بەسەرچاوە و.. بەر ڕووباری،
ئاوی ژینی کوردستانیان گرتبوو
ژەندرمەکان: مۆتەکەی ترس
سواری سنگ و سواری دەنگ و..
دەس بە نێزە سەرشەقام و
ناو کۆلأنیان گرتبوو
ئەوەی دەنگی لەبەر دەمی
ژەندرمەدا هەڵبڕیایە
ئەوەی لە سەگی سوڵتانیش یاخی بووایە
ئەوەی دەستی بۆ خەنجەری،
بەرپشتێنی ببردایە..
زوو لە چینی ناو دیواریان گرتبوو.
* * *
ئەو دەمە، زستانی، شەوێکیان
وەیشوومە و بەفرانبار
زریانی بەلوورە ئاسمانی تاریکی،
لوول ئەدا و لە گڤەی پڕتاوی
مێگەلی پەڵە هەور
ئەترسا و رای ئەکرد
بەرە و ژوور بەرە و خوار
سەری خۆی هەڵ ئەگرت.
وژەی ناو دارستان

ڕێ و بانی چۆڵ و هۆڵ
کەناری زێی هەڵچوو
لێشاوی ملگرتوو
بەرە و ناو شیو و دۆڵ
خەرەندەی بەهاژە و توڕەبووی
کەف کردووی بێ سروشتی
ترساو بوون
ئەو شەوە "ڕەواندز":
ژنێکی غەمگین بوو
لە نوێنی شەختەدا نووستبوو
ئەو شەوە.. لەژووری ماڵێکی
قوڕینی بن میچ و گوێسەوانە نزمدا
قوتیلەکەی بەدووکەڵ،
تەواو ڕەش.. داگەڕاو،
ئەسووتا و شەوقێکی زەردباوی
ئەدا لە ڕوخساری غەمگینی
دوو برای "پیربال و کاکە لاو"
دوو برای وەرزێری پێستی لەش
وەك بەڕووی ناو ئاگر هەڵقرچاو
دوو برای بەرچاو ڕوون،
کاغەزنووس بەحەرفی حوجرەکەی
لای.. مەلا.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دوو برای داخ لەدڵ
بۆ تۆڵەی باوکێکی بەدەستی،
ژەندرمە تاسێ ڕۆژ،
لەچەقی مەیداندا
سەرەو خوار.. هەڵواسراو.
ئەو شەوە.. جووت برا
بەڵێن و بڕیاری
دوو کاری زۆر گەورە و،
سامناکیان بەیەك دا:

★ ★ ★

ـ مانگێکی تر، زستان وەکوو، پیرە مێردێ
دەم و دانی ئەکەوێت و..
سەری لە گوێ قەبر ئەلەرزی
مانگێکی تر سەرما ئەمرێ
گوڵی کێویی
بەلاسکی پەنجە سەوزەکەی
بەفر لەسەر خۆی لا ئەداو،
دوور و نزیك
چاو لە شوانی گوند دائەگرێ
بەهار دێت و لەدەرگای
حەوشەمان ئەدا و
ئەگری و ئەڵێ

کێ بێ گڕی کوژاوەی چاوەکانی من
هەڵکاتەوە و تاسەر لووتکەی دەسم بگرێ؟!
کێ بێ نەورۆزی زیندانیم،
ئازاد بکا و
بە دەنگی بەرز
لاوکی سوورم بۆ بڵێ؟
ئەی گڕی جەژنە سەوزەکەم
بەڵێن ئەدەم من ئەو کەسەم
مانگێکی تر لەسەر بانیژەی ماڵەکەم
ئەتکەمەوە و لەبەر چاوی:
ژەندرمەکان
کڵپەت ئەگەیێنمە ئاسمان.
ـ یاخی بوونە لەتاریکیی
خەنجەر کالان بەجێ دێڵێ
شەختەی بێدەنگیی ئەشکێنم
ئەو وەختەی تۆ
ئاگر ئەکەیت بەگڕ شەوا
منیش ئەچم..بێ ترس ئەچم
لەسەر قەدە ئەستوورەکەی
سوورە چناری گۆڕەپان
بەکوێرە و خەتی ـ دەس خەتم ـ
بەگەورەیی ناوی ـ کاوە ـ و

وێنەی چەکوشەکەی دەستی
ئەنەخشێنم
دەور و بەری سوورەچنار
وەك ڕۆژ ڕووناك ئەکەمەوە
بە هاواری کاوە و نەورۆز
ئەم سەر هەتا ئەوسەری شار
ئەخرۆشێنم
★ ★ ★
ئەو مانگە تێ پەڕی و زستان مرد
دوو برای دەرون پڕ
لەسەر تێز چاوەڕوان
گفتاریان شەقاوی هەڵهێنا
بۆ بڕیار ئەنجام دان.
ئەو ساتەی..زەردە پەڕ،
لەهەوری مەیلەوئاڵ
کەژاوەی ئێوارەی بۆ جوانیی
کرد بەماڵ.
ئەوساتەی ناو باخ و بێشەلاّن
بەدوا تیشك،
سەر لق و گەلاّیان هەزاران ڕەنگیان گرت
ئەو ساتەی.. ئاوێتەی ڕووباری
لەدوور دیار

PDF 4 KURD

بریقەی بەشەوقی ڕێك ئەیدا
لەچاوی بن بنار
ئەوساتە..كاكە لاو
لە حەوشە لەهەیوان
لەچیلكە و چەوێڵ و بڕەدار چی هەبوو،
بەباوەش سەری خست بۆ سەربان
لیژنەدار لەسەریەك
ئەوەندەی باڵای خۆی
كۆمەڵ بوو..
بۆ ئاگر تێ بەردان بنەوەی پووشوو بوو
لەسەر چۆك دانیشت و،
پزیزكی "بەردەستێ"
پووشووی گرت
تەنێوە..تەنێوە..تاسەرێ
بڵێسەی بەلرفە و بەشاڵاو
چناری ئاگر بوو
تا ئەهات بەرە و ژوور،
هەڵ ئەچوو.
خرۆشا ناو شاروو..
هەر، سەربوو.
لە دەرگا و پەنجەرەی ماڵەوە..
هاتنەدەر.. دەنگە دەنگ

چی ڕویدا؟ چی قەوما؟
شڵەقا گۆمی مەنگ
وەك لاولاو
ئاگری نەورۆزی کاکەلاو
لە شاردا دەست نەما سەرنجی،
لە بالآی نەئاڵێ
وەك پشکۆش
دڵێکی ڕەش نەما
بەچزەی ئازاری،
تا سەر ئێسك کونکەری،
تل نەداو نەناڵێ.
★ ★ ★
لەولاش پیربالْ وەك سمۆرە
بەقەدی لووسی چناردا هەڵگەڕابوو
لەسەر لقێکی دووفاقە هەڵکورمابوو
بە کوێرە خەتی ـ حوجرەی کۆن ـ
بە حەرفی گەورە و خوار و خێچ
نووسی: کاوە
نووسی: نەورۆز
لە پاڵیدا وێنەی چەکوشێکی کێشا.
بە دیمەن ئێجگار ناقۆڵاْ
بەکوێرە خەت بوو بەئاڵاْ..



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

کەهاتە خوار.. ئەمیش لەسەر:
سەکۆ گەورەکەی گۆڕەپان
بەرامبەری باڵە خانەی تەختە بەندی
جێگرەکەی والی و سوڵتان
داروباری کۆ کردەوە
ئاگرێکی وەك ئاگرەکەی
کاکەلاوی لێ کردەوە
کاتێ بەدەم کزەی باوە
کە شەوقی ئاڵی کلێپەدار
ئەیدا لە بالآی بزورگی سوورە چنار
ناوی نەورۆز.. ناوی کاوە
وەك مانگی ناو پەڵە هەور
جارە ناجار..
ون ئەبوون و دەر ئەکەوتن
بەسەر پەیژەی بڵێسەدا
بۆ کوشتنی تاریکە شەو سەر ئەکەوتن
* * *
شار ڕاچڵەکی
کۆلآن.. کۆلآن.. گەڕەك.. گەڕەك
دەرگای حەوشەی خڕ داخراو
کەوتنە سەر پشت
هاتنە دەرێ ورد و درشت

PDF 4 KURD

وەك گۆمی مەنگ
خەڵکێکی زۆری حەپەسا و
لەدەوری ماڵی کاکەلاو
لەدەوری سوورە چنار و،
سەکۆی گەورە
ئەڵقەیان بەست.. خڕ بوونەوە
چاوێکیان کرد بەچوار چاو و
ورد بوونەوە..
هەر سەر بوو ئەنرا بە سەری
تەنیشتەوە..
چرپەی پەنا گوێی نەهێنیی
سەر سوڕهێنەر
لەم پەڕەوە هەتا ئەو پەڕ
یەکە.. یەکە.. ئەڕۆیشت و..
ئەگەیشتەوە..
دوو ئاگرەکەی
جووتە برا
لەژووری دڵی تاریکی
ئەو خەڵکەدا.
بوون بەچرا.

٭ ٭ ٭

ئەم هەواڵە گڕ گرتووە
وەختێ فڕی و خۆی کرد بەناو

PDF 4 KURD

**سەراو قشڵەی ژەندرمەدا.**

**ڕاڕەو و داڵانی تاق، تاق...**

**دوور و درێژ**

**پێکدا ئەهات.. جمەی ئەهات**

**تەقەی پاژنەی خێرای پۆستاڵ،**

**بن بزمار ڕێژ**

**جیڕە جیڕی دەرگای ژوور و**

**قرە قڕ و.. کۆکە کۆك و..**

**بانگ کردن و "جنێودانی "**

**کوردی و تورکی و..**

**شڵە ژان و سەرسم دان و ژاوە ژاویان**

**لە گێژەنی ترس و بیمدا**

**بۆ خوێن ڕشتن**

**پەنگی ڕقیان ئەخواردەوە**

⋆ ⋆ ⋆

**لە بنەبانی داڵانی سەرەوەشدا**

**لەژوورێکی فراوانی بن میچ بەرزی**

**پڕ قەنەفە و پڕ فەرشدا**

**لەسەر کورسیەکی کەتەی**

**پاڵ پشت و دەسك نەرمدا..**

**ڕوو لەپەنجەرەی بەپەردەی،**

**ئەتلەسی سەوز داپۆشراو**

PDF 4 KURD

نزیك كوورەی ناو دیواری

بەحاڵ گڕ لەپشكۆ هەستاو..

جێگرەكەی والی و سوڵتان

پەپاغ لەسەر

برۆ پڕی.. لچ ئەستووری..

دان ئاڵتوونی.. ڕوخسار ترشاو..

دانیشتبوو.

لەناوەڕاستی ژووریشدا

سەرەك ژەندرمەی ورگ زل

چوار پەل قەوی.. كەللە بەران

ڕاوەستابوو..

نقەو هەناسەی لەسنگی،

خۆی بڕیبوو

گوێی بۆ فەرمانی سەركردەی

دەم كەف كردوو

ڕاگرتبوو..

ـ تۆ پێم بڵێ لەكەیەوە

بۆرە پیاوی ئەم شارە

وایان لێ هات لەفەرمانی

"بابی عالی" یاخی بن؟!

چۆن توانیان.. چۆن ئەوێرن

وابێ باك..

PDF 4 KURD

**دەست بۆ مشتووی**

**خەنجەری تۆڵە بەرن؟**

**ئەی ئێوە چین..**

**بەردن.. دارن..**

**بتن.. کەرن.. بارگیرن؟**

**ئەوەتا وا ئاگرپەست**

**نەوەی شەیتان.. دز.. جەردە**

**بەئاشکرا بەر دەروازە و،**

**ڕێی سەرامان پێ ئەگرن!**

**ئاگر و دووکەڵ ئەکەن بەگژ**

**پەڕە و حەرفی قوڕئاندا**

**شیر هەڵ ئەبڕن**

**لەڕووی پایەو..**

**تەخت و بەختی سوڵتاندا!**

**گوێم لێ بگرە!تاچوار مێخەی**

**ئاگر پەرست نەکێشن**

**من نامەوێ جارێکی تر**

**دوور و نزیك بمبینن!!**

⋆ ⋆ ⋆

**هەر ئەو شەوە ژەندرمەکان**

**وەکوو کوللە، وەك واشە**

**دوو دوو..سێ سێ**

دەس بەسونگی، بەپڕتاو
ڕژانە ناو گۆڕەپان و سەرشەقام
ڕێگەی پردوو باخ و چەم و
دەوری شار و قوتکەی بەرز و
یاڵیان گرت..
هەر ئەو شەوە..هێشتا گڕی
ئاگرەکەی جووت برا
لەسەر بان و گۆڕەپاندا ئەسووتا
کەگەیشتن فێ گرتوانە،
شێت و هار
بەپێ لەقە.. بەسەتڵە ئاو
گڕی ئاگرو.. بڵێسەیان
تەواو دامرکاندەوە..
بەدەم نووکە شەقی قین و..
بوغز و.. جنێو دانەوە.
پەرش و بلاّو..
سەرە بزوتك.. کەڵە پشکۆ.
لەجێی کلێپە.. دووکەڵی ڕەش
پێچاو پێچ!
سەری خەم و نوشوستی خۆی
هەڵ ئەگرت..
دەنگ و باسی دوو ئاگرەکە و



PDF 4 KURD

جوت برای
بۆهەوری سەر ئاسۆی دوور و
بەهەواری کۆچەرەکان..
ئەگەیاند
هەر ئەو شەوە..لەپشتەوە
باڵی جووت برا.. بەستران
بەدەم زرمەی شەق و دۆنکی و..
تێلاّوە..
لەش خوێناوی بۆ زیندانی،
شەوەزەنگ بران.
بەفەرمانی پەپاغ لەسەر
جاڕچی هات و
جاڕی ئەدا:
ماڵی پیربالّ و کاکەلاو لەگەڵ ئەرزا تەخت کرا.
شوێنەواریان کرد بە کولانە بۆ سەگ و
توولە و تانجی ماڵی پاشا.
هەر ئەو شەوە.. بە تەورداس
کەوتنە وێزەی سوورە چنار
لەڕەگەوە دەریان کێشا
لەت لەتیان کرد
کۆمەڵ.. کۆمەڵ
بەشان بردیان



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بۆ دارەڕای تەویلەی نوێی
قشڵەو سەرا
هەر ئەوشەوە درەنگانێ
بەفەرمانی پەپاغ لەسەر
جاڕچی پەپو هاتەوە دەر
ئەمجارەیان جاڕێکی دا
چزە و کسپەی لەدەروونی
عاشقانی ئاگر هەستان
کە ئەیقیڕان:
جووتە برا..
لەدار دران!
★ ★ ★
بەیانی کەشاری گریاوی
قژ ئاڵۆز..
ئەستێرکی خوێنینی..
چاوانی هەڵ هێنا
دوو سەری،
بڕڕاوی خۆی بینی.
بەیانی کە هەتاو ڕێی کەوتە
ناو شار و
چووە سەر سەکۆکەی گۆڕەپان
لەناکاو کەوت بەسەر،

دوو لاشەی عاشقی پڕشنگیاو،
زۆر گریا!
ئەوەتا وا ئێستە
بە دەرگای سەراوە
پیربالّ و کاکەلاو
دوو جەستە و دوولاشەی
سارد و سڕ چوون بەفرن
بەلاّم بۆ جەژنەکەی دلّداران
دوو گیانی سەوزن و
دوو هەلّۆی ئاگرن.
ئەوەتا وا ئێستە شەمالّ هەلّیکرد
بەپەنجە ئەسپایی
کاکۆلّیان لا ئەدا و..
تەوێلّیان ماچ ئەکا
ئەوەتا بەچرپە بۆ گەلاّی درەخت و
بۆمەل و بۆ شەپۆل
مەرگی سوور باس ئەکا
ئەڕوات و سەر ئەکا بەهۆبەی
ڕەوەندا..
ئاگریان خۆش ئەکاو هەوالّی
شارەکەی دوو برای،
نەورۆزیان پیّ ئەلّیّ..

ئەڕوات و جارە جارە چنارێ

ڕای ئەگرێ

شەماڵە و ئەم بۆنی کاکۆڵی

ئەوانی لێوە دێ

ئەوەتا وا ئێستە هەورێکی

زۆر چڕی هێناوە

ئەم هەورە..لەدوور ڕا

هاتووە و ماندووە..

ئەم هەورە گێنگڵی

ژانێکی بەتاوە..

ئەم هەورە.. لەگڕی ئاگرەکەی

جووت برا.. کەوتەوە

لەو.. زاوە

هاتووە و بۆ دوا جار برایان ببینێ

هاتووە بۆ دوا جار دەمی عەشق،

بنێتە ناو دەمیان

ئەوەتا وا شوانی نوقم بووی.

تا ئەژنۆ لە گیادا

بەرە و ژوور ئەڕوات و

قۆڵی کردووە بەقەفی

گۆچانی سەر شاندا..

هەنگاوی خەماویی



PDF 4 KURD

وەردی تەڕ ئەشێلێ
ئەو ئەڕوا و پەلکە گیای بەر باران،
لاسک جیڕ،دێتەوە شوێنی خۆی،
بێ ئەوەی نیشانەی ڕێگەیەك جێ بهێڵێ.
ئەوەتا ورد ئەڕوا و
گۆرانی بارانە، بۆ کۆچی سوور ئەڵێ.
"باران بارانە،هۆرەی بارانە
هۆرە بۆ کۆچی سووری یارانە
باران بارانە شەستە بارانە
چاوی ئەو کەژە زنەی گریانە
باران بارانە ڕیزە بەڕیزە
ئەوەتا چاومان وا لە ئازیزە
باران بارانە نەرمە بارانە
کۆچی بێ وادەی سووری یارانە،
★ ★ ★
ڕۆژ هات و چوو
کارەساتی جەژنی کوژراو
سیمای پیربالّ و کاکەلاو
ون نەئەبوون لەخەیاڵدا و..
جێیان نەهێشت سۆمایی چاو
لەناو ژووردا
لە هەیوان و حەوشەدا

PDF 4 KURD

ئەبینران ئەهاتن ئەچوون.
لەکێڵگەدا
تۆویان ئەچاند..
ئاوی جۆگەیان هەڵ ئەگرت
لەگەڵ منداڵی گەڕەکدا..
ڕایان ئەکرد..بازیان ئەدا..پێ ئەکەنین.
شەوی هاوین
لەنێو پەل و نێوان گەڵای درەختەوە
مانگ..دەم و چاوی ئەوان بوو
لێو بەخەندە.. دەر ئەکەوتن.
شەوی پایزیش.. لەخەونی
ئاشنا و ڕۆشنا و هاوڕێدا.
گەلێ جار ئەبوون بە دوو مەل
باڵیان سوور و
بەر سنگ سەوز و
لەسەر بەفری دووره لووتکەی،
بەر زەردەپەڕ.. هەڵ ئەنیشتن.
⋆ ⋆ ⋆
ئەگەر چی ئەو ساڵە
هەڕەشەی ئاگر و ئاسنی ژەندرمە
بەپەت و مێخ کێشان
بەزمان لە بندا بڕین و..

PDF 4 KURD

**بەسونگی و بەقەمە**

**مۆتەکەی ژیانی سەرسنگی**

**خەڵکی بوون؟**

**تاقیبی بەردەوام..**

**چیتان کرد؟ لەکوێ بوون؟!**

**بۆچی، چۆن؟**

**ئەگەرچی هەندێ کەس..**

**بۆ پاشا بوون بەورچ،**

**بەمەیمون.. بەسەگی چوارچاو و**

**لەشەودا.. خۆیان کرد..**

**بەخێوو.. جنۆکە.. بە درنج**

**بەلاّم ڕێی هەتاوی**

**پیربالّ و کاکەلاو..**

**ئەو زەنگەی پار نەورۆز،**

**لێیان دا.**

**تاریکی نەیتوانی قووتی داو،**

**هەڕەشە نەیتوانی کپی کا!**

⋆ ⋆ ⋆

**بەرداشی سالّ سوڕا**

**وا نەورۆز خەریکە جارێ تر**

**سەر بات و بێتەوە**

**نزیکە.. کراسی گولاّلە لەبەرکا**

PDF 4 KURD

نزیکە دەسماڵی وەنەوشە،
بەشانیا بدات و
کڵاوی نێرگزو گەزیزە،
لەسەرکا..
نزیکە و بە سەردان
جووت برا دێنەوە
ماڵ بەماڵ ئەگەڕێن تا جەژن،
ئەڕوات و ئەوساکە،
ناوەستن.. ئەچنەوە!

⋆ ⋆ ⋆

بەدوو ڕۆژ پێش ئەوەی
کە نەورۆز بێتەوە..
لەشاردا..ماڵە و ماڵ..
بانگێکی نەهێنیی.. دەماغ و
دەمامك.. هەڵبەستوو.. ئەگەڕا
بانگ وەکوو هەرێز وپەڵە هەور
تەنیێوە..
بانگ ئەی وت:
بۆ ئەوەی کە نەورۆز
بڵێسەی بەرزتر بێتەوە و..نەکوژرێ
با چاوگی ئەو گڕە "بیرمان "بێ
بۆ ئەوەی درەختێ کە ناوی کاوەی

PDF 4 KURD

لەسەر بێ و بمێنێ.. با ڕەگی ئەو دارە
بنج بەستی.. دڵمان بێ..
بۆ ئەوەی.. کە گیانی پیربال و کاکەلاو
شاد بکەین
باهەموو.. هەر هەموو
ببینە هەزاران پیربال و کاکەلاو
تا بچین بە باوەش
هەتاو و نان و گوڵ بێنین و
بیدەین بە، هەژاری ڕەنج خوراو.
کەژاوەی ئێوارەی نەورۆزی
سەوز هات
هێشتا خۆر چەند ڕمێ
بەرزتر لە کەنار خۆرنشین،
وەك دەمی تەندووری ئەسووتا
شار کڕ بوو. بێ دەنگی گۆمێك بوو
زۆر سامناك
هەر کە خۆر یەك دوو ڕم
چووە خوار
ئەنگۆرە [6]دەرکەوت و تاریکیی،
حوچێ بوو بازی داو بەگوڕ هات.
ئەو ساتە بێ دەنگی تەقیۆە..
لەناکاو..لەجیاتی دوو ئاگر

هەزاران ئەستێرەی ئاگرو،
مانگ لە سەر،سەربانی
شار هەڵهات..
بانێژەی ماڵ نەما..
هەورەبان.. سەرقەلاّ.. سەرگومەز
گۆڕەپان.. ناوکۆلاّن.. گردەکەی سەر قەبران،
قوتکەکان.. نزم و بەرز..
شوێن نەما
کە کڵپەی ئەم ئاگرە پیرۆزە
بۆی نەبێ.. بەچرا
لەشاردا.. قەدێکی درەخت و دار نەما
گەورەبێ.. یان پچووك
باریك بێ.. یان ئەستوور
چنار و.. دارەبەن.. دار بەڕوو
دار مازوو
شۆڕە بی.. گوێز و توو..
بەنووسین.. یان وەکوو نیشانە
بۆ کاوە... بۆ نەورۆز
نەبێ بەو مژدەیەی
پێش وەخت نێرگزی
ئەم ڕۆژەی میوانە!
جائیتر.. پاشا و بەگ

PDF 4 KURD

ژەندرمە.. چی ئەکەن؟ کێ ئەگرن؟

چەند ئاگر خامۆشکەن؟

چەند درەخت لەبندا هەڵکەنن؟

ئەوەتا وا لەپاڵ هەزاران ئاگردا

هەزاران پیربالّ و کاکەلاو

ئەو ئاگری نەورۆزە خۆش ئەکا.

PDF 4 KURD

# داستانی بەردەقارەمان [7]

"بۆ مامۆستاو هاوڕێی خۆشەویست،
زانای مێژوونووس د. کەمال مەزهەر پێشکەشە".

ـ 1 ـ

ئیستە شەوە لە سەر شانی لووتکەی "سێ کەوان "
وەك شاژنێ ڕۆنیشتووە
"مانگ" ی حوزەیران.
سەرو قژی بە چارشێوی هەورێکی تەنگ،
داپۆشیوە و بریسکەی دێ،
ڕووی زیوینی وەك ئاونگ
شێوەی سوخمەی پوولەکەچن ورشە و پرشەدار
بەهەیاسە و قوبەی ڕوونی ئاسمانەوە،
ئەستێران هەزار.
لە ئاوێنەی تریفەدا دەشتی بازیان
پێ ئەکەنێ و دەرئەکەوێ دانی سپی،
جۆگەکەی " کانی شەیتان "
پیرەمەگروون پیرەمێردی قژ بەفرینی،
دەروون تەم گرتوو

**چاوی لووتکەی بڕیوەتە پاشەڕۆژی،**
**هێشتا نەهاتوو.**
**دارستانی سنەوبەری بەفیز و لووت بەرز،**
**لەژوور شانی لاپاڵەوە،**
**ئەڕوانێتە ئەرز.**
**دارهەناری سوراوکردووی،**
**دەم پڕ لە شیلە**
**قۆڵ و باسکی سپی و سۆڵی،**
**هەرمێ کێویلە..**
**لەم شەوەدا بەدەم کزەی بای باشوور و،**
**بەفرەوە هاتوو،**
**دێن و ئەچن لەجۆلانەی،**
**شەماڵدا ئارام گرتوو.**
**بۆنی شەوی هاوینانی نزیکی باخچە**
**مۆردی پەرژین،گوڵە زەردو،ڕەشەڕێحانە**
**بۆ نووستنی درەنگانێ خەونی پڕ گوڵاو**
**ئەپرژێنن لەوەنەوزی،**
**کەروێشکەی ناوچاو.**
**ئاگری شوانی سەردوورە شاخ،**
**سوورباو کە هەڵدێ**
**دەمێ گەش گەش**
**دەمێکی تر**



PDF 4 KURD

کز کز ئەسووتێ.
زیکە زیکی سیسرکی ناو،
کێڵگە و وەرد و شیو
بارە بار و،
حیلەی ئەسپ و loوورە لووری
سەگی لۆز بەرامبەر مانگ هەڵبڕیو..
ئەو دەنگانەن لەگەڵ غەڵبە و
هۆ بەهۆی ناو لەشکردا
لەدوورەوە ئەگەنە گوێ و،
وەك ژاوە ژاو
تێکەڵ ئەبن لەناو یەکتردا
★ ★ ★
ڕواڵەتە ئەم جوانییە،
دوور کوژەی سروشت.
دێوجامەیە..
بزەی مانگ و سەمای بەفروو
سیحری هەڵەمووت!.[8]
تا سەر نەکەیت بەماڵانی،
بن میچ نەویی
گوندی برسیدا
تێکەڵ نەبی لەگەڵ ناڵەی ڕەزو وباخ و
ژانی زەویدا.

تا گویّ نەگری لەدڵی شاخ
لەزامی داران
بەدەستی خۆت دەس نەخەیتە
سەر تەویڵی "تا"ڵیّ هاتووی
کەژووکۆساران
قەت ناگەیتە قوڵایی ناخ..
نایخوێنیتەوە..
لەتەنکاوا قەت مرواری دڵی مێژوو
نادۆزێتەوە.

* * *

شەو درەنگە وا خەریکە
ڕەشەبایەك هەڵبکا
"با " دەم تیژە و وژەی باڵی
لەشمشێری
وەشێنراوی ڕووت ئەکا.
شەو درەنگە لەبەردەم و،
لەلاشانی ڕاست و چەپی
"دەربەندە وشکا"[(9)]
پانزە ڕۆژە..
هۆبە..هۆبە،لەشکری شێخ
بنە و بارگەی خستووە.
پانزە ڕۆژە..

PDF 4 KURD

له تەختایی،بەردەلآنا
تا ژوور ئەژنۆ
سەنگەریان هەڵکەندووە.
ملەی شاخ و قوتکەی سەرە ڕێ
بەچوار دەورا گیراوە
هیچ دەرناچێ لەباڵندە بەولاوە!
* * *
پانزە ڕۆژە کوڕانی هۆز، یەکە یەکەی،
بەخۆ و کەڵەگەت
چاپوك سواروو کەللە ڕەق و سمێڵ بابڕ
موو ڕەش و موو زەرد
دەستیان لەسەر مشتووی خەنجەر
چاویش وەکوو چاوی بازی
نێچیر ڕاوکردوو،
پانزە ڕۆژە کوڕانی هۆز ئێشك گری
دەربەندن و
سەر و ڕیش هاتوو.
وەك پڵنگی درِك لەقاچ هەڵ چەقیوی
ناو بێشەو لانە
بێ ئارامن،دێن و دەچن،چیا ئەبڕن
ئەم دیو..ئەودیوی
بۆ دێ بەدێ بانگ ئەدەن و

هان ئەدەن و
وان لە پارێزدا.
هەر هەموویان
بەدوای شێخی،
سوارەی ماوزەڕ لەشانکردوودا
بەدوای شێخی شیر هەڵکێشاو
لەڕووی ئینگلیزدا
هەر هەموویان سوێند خۆرن و
دائەنەون..لەم خاك و خۆڵە،
پڕ بەمشتێ هەڵ ئەگرن و ماچی ئەکەن
بۆ ڕۆژی تۆڵە.

ـ 2 ـ

ئەم دەربەندی بازیانە
کە بەوێنەی ژمارە "7"
هەردوو دەستی بەرەو ئاسمان،
هەڵبڕیوە
لەدنیای کۆن و تازەدا
چاوانی ئەو چی نەدیوە؟!
ئەم دەربەندی بازیانە
تەنها دەروازەی بەردینی
ئەم مەڵبەندەی کوردستانە



PDF 4 KURD

ئەوەی زووتر..

چنگی گیر بوولەم گەرووە

ئەوەی زووتر..

ئەم دەروازەیەی پێوەدا

ئیتر شاخ و ئەم دیوی شاخ

بۆ خۆی بووە.

★ ★ ★

بۆ کڕوزی جەرگ و خاکی،

دوای شەڕ هێشتا،

بۆنی لەلووتا هەرمابوو،

ئەو وەختەی لاکی عوسمانی

لەنێوانی گورگەکاندا لەت لەت کرا

کوردستان و..

ئەم مەڵبەندەی سلێمانی

بەگورگە چاوشینی دوورگەی،

ئینگلیز بڕا،

گورگی چاوشین نەوت بۆنکەر

بە زەردەخەنەی ژەهراوی

جێی خۆ خۆشکەر،

گورگی چاوشین نیوەی ڕێویی

ماندووی هەورازەکەی شەڕ بوو

تا هیلاکی لەش دەرئەچێ

باحوكمدار لە مەڵبەندا
کەڵەکێوی هەر کێو خۆی بێ!
* * *
گورگی دوورگەی لمۆز درێژ،
تا هیندستان
وای ئەگەیان:
ئیدی گوایا شوانی مەڕوو
شوانی ماف بوو
هەر کە تاریکیش دائەهات
ئیدی گورگی لمۆز درێژ
تا هیندستان
کلکی خۆی ئەکرد بەگۆچان
بەگۆچانیش مەڕو وماف و
کلووروو نەختینەی دنیای
بۆ خۆی ئەفڕان.
* * *
حوکمڕانی کەڵ بانگی دا:
گورگ هەر گورگە
شوانی هەڤەو..
حەقیش پارووی دوورگەی doorە!
چاوشینە یاخود چاو زەردە
گورگ هەر گورگە



PDF 4 KURD

لەندەنییە و ئەستەموولی

گوێچکەی خوارە یاخود قوتە

گورگ هەر گورگە

ئەم مەڵبەندە

بۆ ڕاست.. ڕاستە

بۆمەند.. مەندە

بۆکێرد.. کێردە

حوکمداری کەڵ بانگی دا:

ـ گوێزی پووچە،

بەڵێنی شای دوورگەی درۆ.

میوەجاتێکی گلارن

گفتەکانی مستەر "ویلسن"

پێکەنینەکەی "مێجەرسۆن"،

شمشێرێکە و دەم بە خەندە،

ژەهرە و شیرین.

ئاگاداربن

ئەو وەختەی دەستتان ئەگوشن

هەر لە پەنجەکانتان پواز،

دائەتاشن.

هەتا ئێستە

ئارامیی ئێمە گۆیژە بوو

گۆیژەش "ئەیوب"



PDF 4 KURD

ئەوا ئەیوب کراسەکەی،
خۆی دائەدڕێ.
هەتا ئێستە:
دڵمان جامێکی گەورە بوو
گەورە بە قەد
گوومەزەکەی سەر "کاك ئەحمەد"
ئەوا جامیش لێی ئەڕژێ.
قولاپ.. قولاپ
ئەو ئەزانێ ماسی لە چ،
گۆمێکدایە
خەنجەر.. خەنجەر
ئەو ئەزانێ حەقی خوراو
لە گیرفانی کام کەس دایە!
⋆ ⋆ ⋆
شەو درەنگە
ڕەشەبا نووست.
ئەم مەڵبەندە
لە ناوەڕاستی شاخاندا
ئاسکی دەشتێکە گیر خواردوو
هەر بارەی دێ
بۆ بژوێنی هەژارانی
ئەم مەڵبەندە

چاو ئەگێڕێ.
هەژارانی ئەم مەڵبەندە
وەك زەعفەران
ڕەنگیان زەردە
قاچ و قۆڵیان باریك باریك
وەکوو قامیش
دەست و پلیان وەك زەوی دێم
قڵیش..قڵیش
لەسنگی داچەقاوەوە
مەمکی ژنان
وەکوو کۆترە شینەکەی مردوو
تەکەیان دێ..
مندالأنی ئەم مەڵبەندە
زۆر کەمیان لێ گەورە ئەبێ.
ئەم مەڵبەندە
کە بارانی پەڵەی تێر ئاو ئەخواتەوە
کە دەغڵ و دان و مەرەزە بالاّ ئەکەن
کەروێشکەی "با" لەناویاندا
قونە قون ئەکەن..ڕانەکەن
دنیایەکی بەبرِشتە
بەلاّم.. بەرهەم
بۆکەم.. زۆرە



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بۆ زۆر..کەمە
تەنها یەك ژەم
بۆ چەندان.. دەم
بۆ یەك دەمیش
دە دوانزە ژەم!.

ـ 3 ـ

شەو درەنگە
ڕەشەبا نووست.
وەك بترسێ هەور هەڵات.
ئیتر مانگیش
زێڕە تریفەی خاوی خۆی
لەسەر بەفری گەردنی شاخ
بەمشت هەڵڕشت.
شەو درەنگە
لە هۆبەیەکی لەشکرا
لەسەر پەڕا
لەژێر دەوارێکی سپی
کەنار گرا
وەك شێری تووڕە "شێخ مەحموود"
دێت و ئەچێ..

PDF 4 KURD

دەستی ڕاست لەبەر پشتێنا
پەنجەی نەسرەوتی دەستی چەپ،
دەنکی تەزبیحێکی ئەبلەق،
دێنێ و دەبا.
ناو بەناویش..
لەبەر ستوونی دەوارا ڕا ئەوەستێ
لەکلاّوی پیرەمەگروون
تریفە چن
ڕائەمێنێ
لەدڵیا خۆی بەخۆی ئەڵێ:
"کە سەربەست و حوڕ نەژیام
جەننەتیش بێ وێرانەیە
سەروەت و ماڵ، دەشت و چیام
موڵکی سرفی بێگانەیە. "
وەك شێری تووڕە "شێخ مەحموود"
بەسەر لبادێکی سپی و ڕەشدا
دێت و ئەچێ
بالاّی وەك قەدی دارگوێزی،
تۆکمە و پتەو.
جۆشی پیاوەتی وەك جۆش و گوڕەی بەهار.
سەروو پێچ، مشکی و جامانەی
تێکەڵ کراو

PDF 4 KURD

قۆڵ فەقیانەی،
تێوە پێچراو.
باڵە پەڕەسێلکەی سمێڵ
تۆزێ ئەستوور
ڕەش قەترانی.
دوو برۆی مانگرتوو لەسەر
جووتێ چاوی بریسکەدار
وەکووپشکۆ.
بەرگی بەری مراخانی.
پشتێنیش هەر مشکییەکی
ڕەش، خەت سپی.
خەنجەری قەد، دەبانێکی
مشتو مەیلەو زەردێکی کاڵ
لەشاخی بەران داتاشراو.
فیشەکدانی
ڕاست و چەپی
سەر سنگی پان
خانەی پڕ لە فیشەك کراو.
کلاّشی پێ هەورامانی!
* * *
شەوە درەنگە، بەلاّم بازی ئەم مەڵبەندە
بەشەو چاوی ناچێتە خەو

ئەو.. دێ و ئەچێ
لەم لاشەوە
"تایەری فەرخە "و" سەی حەسەن "
ڕاوەستاون
دوو ستوونن جووڵە ناکەن.
دوو سەر سامن
هەر وەك لە "بەمۆ"ڕامابن.
سەی حەسەنی کورتە بنە
مامی شێخ خۆی.
ڕیش تۆپزی
دەم و چاوی شەڕەنگێزیی
ئازای کون لە جەرگا نەبوو
هەر دەڕوانێ و چاوەڕوانە.
تایەری فەرخەی موو زەردی
چەناگە چاڵ
لووت بەرانی و برۆ ئەستوور
کوڕی قۆشمەی سلێمانی
هەر دەڕوانێ و چاوەڕوانە.
لەدوای ئیستێ
شێخ وەرچەرخا و
ڕووی تێ کردن:
ـ لەپاش هەڵمەتی "تاسڵووجەو"

شەڕەکانی بەسەر پێرێی
لای "شیوە سوور"
کە هەیبەتی "میجەرسۆن"مان
وەك جەڕەی کۆن
تێدا شکان
لووتی بەرزیمان دا لەعەرد
فیزی زلیمان دا لەبەرد
هەواڵ وایە لەموسڵەوە
هێزی هەژدەمی "فرایزەر"
کەڵەشێری لە خۆبایی
"جەنەڕاڵ"ی
چقە دەرکردووی سەر سپی
بەرەو مەڵبەند کەوتۆتە ڕێ
دەربەند بگرێ
هەر بۆ ئەوە بانگم کردن
ئەم هەواڵە بەلەشکرو
دێهاتەکان ڕاگەیەنن.
سەی حەسەن وەك:
لەسەر ئاگر ڕاوەستابێ
بێ ئارام بوو

هەڵێدایە:



PDF 4 KURD

ـ قوربان!گەرووی ئەم دەربەندە
بەدیواری لەشی خۆمان هەڵ ئەچنین
قوربان! کوڕەی لەشکر
دەستەی شەستتیر تەقینەکان
سوارەی "دزڵی"
ئامادە بۆ:
شەڕی دەستەو یەخەی مەیدان!
تایەری فەرخەش لەسەرخۆ
بەدەنگێکی نزم وتی:
ـ قوربان!ئەگەرچی "فرایزەر"
سەری لەناو کەرکووکدا بێ و
کلکی لە پردێ تۆز ئەکا
پیادەی "سیك و گورگە"ی ڕەشمار
لەشارە مێروولە ئەچن
لە چاو لەشکری ئێمەدا
سەد بەهەزار.
بەلاّم دەربەند گەروویەکی هێندە قووڵە
زۆر فرایزەری قووت داوە
گەلێ چقەی پیرەلۆکەی وەکوو ئەوی
تیا خنکاوە!
ـ 4 ـ
بەقەلاّی "چەمچەماڵ"ەوە

PDF 4 KURD

قشڵەی بەردینی
چوار قوللەی
ئێسك گران
وەك بەرازی لمۆز بۆری
شفرە سپی
ددانی جیڕ ئەكاتەوە و
ئەڕوانێتە ڕێی بازیان.
سەر قەڵاو دامێنی قەڵا
جمەیان دێ.
لەشكری هەژدەی فرایزەر وەك بارگیری،
لەناو خۆڵەمێشدا گەوزاو
لەموسڵەوە بەڕێ كەوتووی
لەتەپو تۆزدا نوقم بووی
چاو دیار نەماو
لە دوای چەند شەو و چەند ڕۆژێ
گەیشتە جێ.

* * *

لە قشڵەدا
لە هۆدەیەكی گەورەدا:
تەختی خشت ڕێژی مەیلەو سوور
كەوانی تاقی پەنجەرە
برۆ پەیوەست

سەر یەکانگیر.
دیوار سپی وەك چوڕەی شیر
قەنەفەی قەبەی بەرگ قەیفەی
ئەم بەرو ئەوبەر ڕیز بەستوو:
مێزی لەدار گوێز کراوی،
سەروو گرتوو.
شووشەی گرنج،
خانە خانەی مەرەکەب دان.
لەسەر ڕەفەش،
دوو سێ گوڵدان.
لەسەر کورسی ئەو دیوی مێز
"جەنەڕاڵ"ی سەر دانەویو،
زۆر قووڵ، ورد ورد
ئەڕوانێتە نەخشەی مەڵبەند.
لەسەر کورسی ئەم دیوی مێز
"موشیری حەمەی سلێمان "
بەگزادەیەکی هەمەوەند
چاوانی زیت..
زۆرقنج وقیت
دانیشتووە و
بەپێشەوە
لەمابێندا

PDF 4 KURD

لیڤیەکی کورد، زمانزان
ڕاوەستاوە و
بووە بە پردی نێوانیان
⋆ ⋆ ⋆
فرایزەر پیاوێکە درێژ
ڕەقەڵەیە وەکوو تانجی.
قاچەکانی وەکوو قاچی
شینە شاهۆ.
قژی..خوری.
ڕەنگی پێستیش سوور و سپی
⋆ ⋆ ⋆
پێش مووسڵ
فرایزەر ڕمێکی باریکی
نووك تیژ بوو
لەمەمکی ڕەشتاڵەی بێ شیری
هیندستان چەقی بوو
پێش چەند ساڵ
فرایزەر لە بەنگاڵ

گورگێکی ڕەقەڵەی سوورفل بوو
ئەچووە سەر سەربانی
ماڵانی بێ دیوار ئەی لووران

ئەچووە سەر ڕێ و بانی
ئاوایی و..
منداڵی "دێ "ی ئەفڕان.
پێش چەند ساڵ فرایزەر
لاوێکی ئەفسەری بچووك بوو
ئەو وەختە گەورە بوو
ساڵ بەساڵ
کە بەسەر پلیکەی سەرانی
بڕڕاوی زنجیدا سەر ئەکەوت
تابووە
"جەنەراڵ "
پێش ئێرە کوللە بوو
چاوانی گەنم و جۆی
زۆر خاکی دەرهێنا.
پێش ئێرە سیسارکە کەچەڵەی
ئاسمانی بێ هەور و باران بوو
باڵندەی سەر بەستیی
ڕاو ئەنا.

ـ 5 ـ

دوای ئەوەی تایەری لاوازو
حەسەنی گردەڵە



PDF 4 KURD

ئیزنیان خواست لەشێخ و لەدەوار هاتنە دەر.

ئەو..حەلە

تازە خۆر

بەکاوخۆ بەشانی گۆیژەدا سەر ئەکەوت

تازە خۆر پەنجەرەی زێڕینی نێونیگای

هەڵ ئەبڕی.

تازە مەل لە ئاسۆی ڕۆژێکی تازەدا

هەڵ ئەفڕی

پێ دەشتیش شۆخێ بوو

پێست زیوین ڕاکشاو

پاو پوزی خستبووە ناو جۆگەی بەر هەتاو.

ئیدی هەر بێ وەستان بەپەلە

سوار بوون و هەر یەکەی بۆ قۆڵێ

ئاو زەنگی تێ تەقێن

ئەسپەکان باڵیان گرت

دوو کۆمەڵ..

تایەریان جڵەوی بەرەو ژوور وەرگێڕا

حەسەنیش بەرە و خوار وەرچەرخا

ئەڕۆن و بانگی شێخ

وەك تۆوی دەغڵ و دان

لە دڵی دێ بەدێی

مەڵبەندا ئەچێنن



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئەڕۆن و بانگی شێخ
وەك شەتڵی گوڵە باخ
لەسنگی شەقاری مەڵبەندا
ئەڕوێنن.

★ ★ ★

ئەو دەمە
وەك چاڵی خەڵووزان
وەك کووچە و ناو چوخمی شەوگاران.
تاریك و نووتەك بوو بیروهۆش
زۆر کەم بوون
چراوگی دەس وشەی
ڕێگە و بان.
بیری کۆن وەك قفڵی ژەنگ گرتوو
لەسەر دڵ درابوو
خەیاڵی پڕ و پووچ وەك ڕەشمار
بەقەف قەف
لە ملی کوردستان ئالاّ بوو.
هەژاران ڕیشۆڵەی بێ دان و
تەزیوی بەر سەرما و
ناو داوی ڕاوکەر بوون
جوتیاران کەروێشکی ترساوی
ناوکێڵگەی

PDF 4 KURD

لەلانە بەدەر بوون
ئەو دەمە
لانەی شێخ
لای چەپی لای ڕاستی
چوار دەوری
بەورچی دەف ژەن و
مەیموونی سەماکەر گیرابوون.
هەرا بوو
ئیدی هەر ورچ بوو
ئەهات و فووی ئەکرد
لەمۆمی تاك تاكی مەڵبەندی داگیرساو
ئیدی هەر مەیموون بوو ئەهات و
مێزەری قازێتی ئەبەست و
ئەبوو بە:
سەر پشکی حەق خوراو!

★ ★ ★

باڵای شێخ لەو چوخمە
تاریك و نووتەکەی ئەوسادا
درەختی پەل و پۆ گرگرتووی
ڕێ وبانی خاکی بوو
ئەڕۆیشت و ئەسووتا
دەنگی شێخ، چریکەی

PDF 4 KURD

له مێژووی خامۆشی ئەوسادا
نزاری له خەوی کەنار چەم..ڕاچڵەکان
دەستی برد کاکۆڵی چیای گرت..ڕای تەکان.
دەستی برد لاشانی هەردی گرت..ڕای وەشان
دەنگی شێخ، چریکەی:
چووە بن پەناگوێی فورات و
ڕای پەڕان.

ـ 6 ـ

"موشیر" بەر لەیەك دوو ساڵێ
لەپایزێکی درەنگدا بە سەردانێ
وەك چەقەڵێکی زراوچووی‌گوێچکە تەپیو
بۆ پاکانە چوو بۆ لای شێخ
دیوەخانی شێخ ئەو ساتە
پوورە هەنگ بوو،جمەی ئەهات
لەدوای ئەوەی چەقەڵ دەستی
شێخی ماچ کرد
شێخ ڕووی تێ کرد
ـ موشیر! من، تۆ و کولله و زەروو
تۆ و گورگی بۆر، تۆ و دالاش و کونە پەپوو
وەکوو یەك تەماشا ئەکەم!
بەدەست تۆوە نان و ئاوی برسی و تینووی

ئەو ناوچەیە هەمووی ئەگرین!
کاروانی ئەو ڕێگە و بانە
بە دەست تۆوە
وەکوو درەختی ڕنراویان
لێ هاتووە
بەدەست تۆوە هەر نامووسە و
ئەزریکێنێ و زەوتی ئەکەی
ئەی ملەی پیس!
تۆ چی ناکەی؟!

⋆ ⋆ ⋆

ئیتر لەو ڕۆژەوە کە شێخ
لەبەر چاوی سەرەك هۆزو
سەر خێڵەکان
موشیر ئاغای ئاوا شکان
لەو ڕۆژەوە
ئەویش ڕقێکی لێ هەڵ گرت
گەورە بەقەد:
شاخی دەربەندی بازیان.

⋆ ⋆ ⋆

دەمەو عەسرە
هێشتا هەواڵی چەمچەماڵ
ئەڵێی هەناسەی ئاگرە.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئاسمان ڕەنگی:
خۆڵە مێشییەکی تێرە.
تا چاو بڕکا گردۆڵکەی زۆر
ڕەنگ سوور و بۆر
وەکوو قارچکی هەڵتۆقیو
نزیك نزیك..بلاو بلاو
لەپێ دەشتا،دێنە بەرچاو.
لەقشڵەدا
لەژێر سێبەری دار مێو و
دار تووی هەڵچووی گوێ حەوزەکەی
ناو حەوشەدا
جەنەراڵ و چەند ئەفسەرێ
دەستیان خستۆتە پشت قنگیان
وەك کۆمەڵێ طاوسی گیف
تێل[10] ڕەنگاو ڕەنگ
پیاسە ئەکەن،دێن و ئەچن
ناو بەناو ئەیکەن بەغەڵبەو
ناو بە ناویش کڕو بێدەنگ
بەهەشت نۆ هەنگاو لە دواوە
کوڵە نانی..
لە ژێر کەوای قۆڵ فشۆڵدا
پشتێنی پانی بەستووە

PDF 4 KURD

**موشیره و دوایان کەوتووه**

**موشیر چاوی وەکوو ڕێویی**

**زەرد و زیته.**

**کابرایەکە چەناگەی کولْ**

**گوێچکەی ڕەپە، قنج و قیته.**

**پەڕەی لووتی تۆزێ خوار و.**

**تەوێڵ قۆقز**

**دەنگێکی گڕ تۆزێ نووساو.**

**جەنەڕالْ دیاره خەیاڵی**

**بۆ ئەودیو دەربەند ڕۆیشتووه**

**نەخشەی ناوچەی**

**لوول لەدەستا هەلگرتووه**

**له ناکاودا**

**گورگه چاوشین ئیستێك ئەکا**

**بەپەنجه بانگی موشیری**

**گوێ قوت ئەکا..**

**بەتەکانێ ئەگاته لای**

**فرایزەر هێواش لەسەرخۆ**

**هەر لەسەر لێواری سەکۆ**

**نەخشەی مەڵبەند ئەکاتەوه**

**موشیر خۆی دائەنەوێنێ**

**سەیرێ ئەکا**

لێی تێ ئەگا و لێی تێ ناگا
فرایزەر پەنجە ئەخاتە
سەر ڕێی شوێنێ
ناوی بە گوێی سووکی مشکا
ئەچرپێنێ
موشیر سەری ئەلەقێنێ
جەنەڕاڵیش پێ ئەکەنێ.
ئاوڕێکی سەرکەوتوانە
لە ئەفسەری دەورو پشتی ئەداتەوە.
دوای چنینی تۆڕی تەگبیر
دەست ئەبات و
دەمانچە پەڕەبێلەکەی
لەقەدی خۆی ئەکاتەوە
پێشکەشی ئەکا بەموشیر
ئینجا ئەڵێ:
ـ هەتا ئێستەش
"شێخ مەحموود" وەکوو دڕندەی
کێویی وایە
تورە و سرکە
ئەمانەوێ ماڵی بکەین ماڵیی نابێ
ئێمە تێ ناگەین چی ئەوێ؟!
بووین بە پردو

PDF 4 KURD

لە زەریاوە شارستانیمان گەیاندە
دەیان وڵات
هەرگیز..هەرگیز ڕێگە نادەین
ئەو ئاژاوە بەرپا بکات!!

ـ 7 ـ

لەشکری هەژدەی فرایزەر
وەك مێروولەی ڕەش و سووری
دەشتی تینوو
بەدوای یەکدا ڕێچکە بەستوو.
تەقە تەقی
ئەسپی عەرەبانە کێشکەر.
پڕمەی وڵاخی بارە بەر.
ڤڕە ڤڕی وەڕسکەری،
پاسی تەختەی
تۆپ لە دواوە پێوە بەستراو
شەستتیری لەسەر دامەزراو
تاك..تاك هۆڕنی قەمەرە
سندووقی تەختەی فیشەکی
سەرمۆر کراو
زۆر هەڵ چنراو.

PDF 4 KURD

چەك و جبەخانەی فرە..
پیادەی قڕە،
هەناسەسوار، بۆڵەبۆڵكەر
دووسێ فڕۆكەی باڵ درێژ
پەیتا..پەیتا
بەسەر هێزدا هات و چۆكەر.
هاواری ئەفسەری سوارەی
ئەمر دەركەر.
گڕەی تەنووری حوزەیران
لەش سوتێنەر.
هەورازە ڕێی پڕووكێنەر:
لەشكری هەژدەی فرایزەر
قۆناغ..قۆناغ
ڕێگە ئەبڕێ و دێتەپێشێ.
ئەم نەهەنگە تۆزاوییە
كلك درێژە
دەمی گەورەی داپچڕیوە
وا هاتووە
شاخ قووت بداو
دەربەند بگرێ!

★ ★ ★

پێش گەردوگۆڵی بەیان بوو

PDF 4 KURD

پێش کازیوە
تاریکی زیاتر لە ڕوونی
ڕەش لەسپی.
لە ئەستێرەی
قوبەی چاو خەواڵوو زیاتر.
لەسەر زەوی
نەچاوی باڵندەی نامۆ
نەهی لووتکە
نەهی چرۆ
هێشتاکە هەڵنەهاتبوون
هێشتا بژوێن ودارستان
هەر لە خەوی سەوزیانا بوون
هەڵنەسابوون.
هێشتا زەوی
لێو قڵێشاو
خەوی بەئاوەوە ئەدی
هەڵنەسابوو.
لەو کاتەدا
بە شاخی ئەودیو دەربەندا
بەسەر ملەی ڕەوەزێکدا
کە هەر بزنە کێوی و بەران
هەر باڵندە گۆشت خۆرەکان

پێی ئەزانن و نازانن.
ڕێیەك: كە چیای دایك خۆی
لێی ون ئەبێ و
شەماڵ ناچێتەوە سەری
ڕێیەك: لووتكە سەروو بنی
لەیەكتر جوێ ناكاتەوە
هەور نایەتەوە بیری.
ڕێیەك:چاوان بزر ئەكا.
وەك قومقومۆكە ڕەنگی خۆی
تێكەڵ بە ڕەنگی وەرز ئەكا
ڕێیەك:بەفر بەخەیاڵیا
نەهاتووە
هەتاو كەم ڕێی تێ كەوتووە
وائێستاكە بەو ڕێیەدا
موشیر وەك پشیلە كێوی
دان ڕیچ
لەش جیڕ
چنگ گیر ئەكاو
هەڵ ئەگەڕێ و هەڵ ئەگەڕێ
لەدواشەوە
ڕێچكە كوللەی
"سیك و گورگە" (11)



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

جێ پێی پشیله هەڵ ئەگرن
وردە وردە سەر ئەکەون
وەختێ موشیر
گەیشتە سەر
دوند [12] و قوتکە
ئەوسا وەکوو قەلە ڕەشکە
باڵەکانی خۆی کردەوە
پڕ بەسنگی
هەوای ڕقێکی هەڵمژی.
کە داگەڕاو چووە خوارێ
تازە هەتاو
پەنجەی گزنگی خۆی ئەدا
لەقژی بەفری سپی و خاو

ـ 8 ـ

هۆ بە هۆیە. قرمە قرمە.
گرمە گرمە. قریوەیە.
لەشکری شێخ
وا لەناو داوی ئاسنی فرایزەرا
لەشکری شێخ
وا لەنێوان دوو دارستانی ئاگرا
پیاوەکانی ئەم لەشکرە گیرخواردووە

PDF 4 KURD

ئەسپەکانی ئەم لەشکرە ڕام نەبووە
وەکوو دەیان ماسی گچکە و گەورە گەورە
کەوتوونە ناو تۆڕی فێڵی
ئاڵقە وردی موشیرەوە
تۆڕ بەسەر شاخدا کشاوە
تۆڕ بە زەویدا خشاوە
پان و پۆڕ و مل درێژە
تۆڕ سەرێکی لەو دیو دەربەند
ئەوی تری لە تاسڵووجە
تەپە تەپە. ناڵە ناڵە.
پرمە پرمە. شریخەیە.
ئەم لەشکرە پڵنگێکە و لەتاوانا
چۆتە سەر کلك
بەدەوری خۆیدا خول ئەخوا
ئەزریکێنێ و زریکەکەی
دار و بەردی ئەم دەربەندە ئەلەرزێنێ
ئەزریکێنێ و شالاو ئەباو هەردوو چاوی
گڕ پرژێنی
ڕقی سوور دائەگیرسێنێ.
لەتۆڕایە و ئەودیوی تۆڕ ئەتۆقێنێ!

* * *

وەکوو نیوەڕۆی حوزەیران

شەڕیش گەرمە.
مەتەرێزی ئەملاو ئەولای
شانی چیا
قرمەژنیان گوێی دەربەندی
کەڕ کردووە.
شەستتیرەکان لەبێژنگی
دەشت و دەرا
کوژراوەکان ئەبێژنەوە.
جانبێزار و پێنج تیرەکان
بەگوللەی تاك
هەر کە دەرکەوت
کاسەی سەریان هەڵگرتووە.
یەك لەسەر یەك
گوللەتۆپی لەو دیو دەربەندەوە هاتووی
لەناکاو گرمە کردوودا
گێژەڵووکەی دووکەڵ و گڕ
بەچوار دەورا دروست ئەکا:
دەستی ئەسپێ
قاچی ناو دەمەر قۆپانێ[13]
ملێ، سەری
وەك خڕکە بەرد،یان بنچکێ
پەیتا..پەیتا



PDF 4 KURD

لەگەڵ خۆیدا
ئەبا و ئەبا.
★ ★ ★
تاوی غارە. تەپ و تۆزە
حیلەی ئەسپ.. سوارگلانە.
تەپڵی بازە و لێدراوە
شێخ هەستاوە
ئەوەتا لەسەر خوانی زین
چرایەکی بەر ڕەشەبای داگیرساوە.
چەپۆکانی ئەسپەڕەشی
تەوێڵ مارۆی کەفەڵ پانی
لەسەر کلکە و
سنگی بەکلێپەوە ناوە.
ئەوەتا لەسەر خوانی زین
هۆرەیەتی
هۆرە ئەبێ بەسۆزی خاك
بەکڕووزەی سلەیمانی
بەهەناسەی شیعری "ناری " (14)
هۆرە ئەبێ بەزامەکانی "شێخ سەعی" و
ئەسپەڕەشەیش هەر تاو ئەدا.
یاڵی درێژ و خاو ئەفڕێ
کەدێتەوە ئەمجارەیان شەپۆل ئەدا



PDF 4 KURD

ئەفرێتەوە و ئەمجارەیان
لکی فەقیانە ماچ ئەکا
تەپڵی بازە (15) و لێدراوە
شێر کەوتۆتە ناو تۆڕەوەو حەپەساوە
بەلاّم هێشتا ئەنەڕێنیٚ
بەلاّم هێشتا
گورگی چاوشینی ئەودیو تۆڕ
ئەتۆقێنیٚ!.

★ ★ ★

"سیك و گورگە "ی باریك باریك
ڕەنگە تیژ وەکوو دەلووبیبەر
دەم و چاویان تاریك تاریك
وەك شەوەزەنگ
وەکوو لەقلەق
قاچ ڕووت..قاچ ڕووت.
بەرپشتێنیان پڕ لە قەمە
پڕ قەدارە
وەگوو ژیژك.
بەڕیز هەردێن، بەڕیز هەر دێن
ئەکەون و بەلادا دێن
ڕیز چۆلّ ئەبیٚ
دیسانەوە ڕیزێکی تر

PDF 4 KURD

**وەكوو ڕمی ڕەش و درێژ**

**ئەیكەنەوە:**

**بەهەڵ بەزین و دابەزین،**

**بەلووره لورێ وەك وەڕین**

**شمشێری تیژ یەك قولانج پان**

**بەدەستەوە قورس و گران**

**هەڵكێشراوە**

**لەبەر هەتاوا بریسكەی وشك كەری ئاوی چاوە.**

★ ★ ★

**نیوە ڕۆیەكی درەنگی حوزەیرانە**

**وەك كزەبا**

**تەقە كزە.**

**ناو بەناوە**

**یانزەتیر و حسكە و ماوزەڕ** (16)

**لەسەنگەرا**

**توێشووی گریان پێ نەماوە.**

**ئەوا ئیتر:**

**تێك ڕژانە، هەڵپژانە،هەڵدێرانە**

**سوار ئەگلێ،سوار،ئەپەڕێ**

**تەپ و تۆزی خاكی تووڕە**

**ئاسمانی بێ ڕەنگ دائەگرێ**

PDF 4 KURD

حیلە حیل و نالە نالّ و گرمە گرم و
وشەی کوردی و وشەی هیندی
تێکەلّ بەژاوەژاوێکی.
گەورە ئەبێ
نێزە سەر ئەکا بەسکا
خەنجەر بۆ ناو دلّ ڕائەکا
فیچقەی خوێنی فوارە بەستوو
لەدەم و چاو، لەقەدارە [17]
لەزین و یالّ
لە ئاوزەنگی لە مەتارە
هەلّ ئەپڕژێ
دار سوور بووە
بەرد سوور بووە
لالّ و پالّە
ئەو لەسەر پشت
ئەم لەسەر دەم
قاچی بێ سەر
سەری بێ قاچە و کەوتووە.
* * *
هەر لەلاشانی دەربەندا
سوارەی ئەسپی ڕەش تاو ئەدا
هەلّمەتە یان ڕەشەبایە؟
یاخود شێرێکی بالّدارە؟

بروسکەیە یاخود غارە؟
ئەوە لکی فەقیانەیە
یاخود بەفری هەڵفڕیوی
سەر چیایە؟!
ئەوە پڕمەی ئەسپەڕەشە
یاهەناسەی گەرمی سینەی
گردەکانی سەر ڕێگایە؟
ئەوە هۆرەیە و قەتارە؟
یاخود چریکەی هۆمایە؟
هەر لەلاشانی دەربەندا
لەهەڵمەتا
"کاجنیس"ێکی نەوەی مەغۆل
خۆ مت کردوو
لە پاڵ قەدی دار توویەکدا
ئەسپەڕەشی
لەگەڵ جاسوسی تفەنگدا
تەواو جووت کرد
کە پەنجەی نا
بەپەلە پیتکەدا ئیتر
ئەسپ گلا!
گلا!!
گلا!!



PDF 4 KURD

گلا!!

★ ★ ★

ئەسپەڕەش لەدوای حیلەیە
یاڵ بڕو کەفەڵ خۆلاٚوی
هەڵسایەوە
وەك بزانیٚ
ئاوڕێکی
لەسواری گلاو دایەوە
نزیك گابەردێکی بن بۆش
شێر لەسەر تەنیشت کەوتبوو.
لە دوو لاوە باز زامدارە
لەدوو لاوە دوو کانیی خوێن
هەڵ ئەقوڵێن.
لە دوو لاوە دوو خونچەی سوور
وا ئەپشکوێن
لەدوو لاوە دوو زاری سوور
لەگەڵ ئەسپە ڕەشدا ئەدوێن
نزیك گابەردێکی بن بۆش
سوارێك و ئەسپەکەی تەنیا
سوار زامدارە و
جڵەوی ئەسپیش بەرەڵلاٚ
نزیك گابەردێکی بن بۆش



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بەجلەوی شۆڕی ئەسپا
سوارەی زامدار خۆی هەڵواسی
لەسەر سك و بەخشە خش
ئەسپ ئەیبا.
تابەردەمی گابەرد ئەیبا

* * *

ئێستە ئەسپەڕەش بەتەنیا،
هەرخۆیەتی
کورڕژن ئەکا و سوار دیار نییە.
چاوانی وەکوو دوو گوڵە
ژاڵەی تەڕی بەر بارانە
کورڕژن ئەکا و شێخ دیار نییە
گوێچکەکانی
ئێستە وەکوو
دووگەڵا چناری سیسی،
هەڵوەریوی پایزانە.
ئێستە یاڵ و ئێستە کلکی
بوونە توتڕك و دڕکەزی
حوزەیرانی ئەم دەشتانە.
کورڕژن ئەکا و شێخ دیار نییە.
ئێستە ئەسپەڕەش بەتەنیا،
هەر خۆیەتی

نامۆی لەوەرگەی خۆیەتی
وێڵی وڵاتی خۆیەتی
کورژن ئەکا و شێخ دیار نییە.
★ ★ ★
ئەوا حەمەی یاوەری شێخ
شان خوێناوی
وەکوو بەرانێکی پێکراو
هەناسە سوار
وەك هەناسەی
سنگی پۆرێکی بریندار.
چاوی ترساو
وەك دوو هەڵماتی قاوەیی
شەوق پێ نەماو
بەهەر چوار لادا ئەگێڕێ.
بن بەرد بن بەرد بەپێ دزکێ
لەئەسپەڕەش دێتە پێشێ
وائەزانێ شێخ نەماوە
ئاخێکی قوڵ پڕ بەسینەی،
خۆی و سینەی
ئەسپی بێ سوار هەڵ ئەکێشێ.
لەئەسپەڕەش دێتە پێشێ.
جڵەوەکەی ڕائەکێشێ.

تا ئەیباتە پەنا بەردێ
هەر چۆنێك بێ
سواری ئەبێ و
بۆی دەرئەچێ!

- 9 -

ئێستە دەربەند، دەشتی دەربەند
ژنێکی قژ دوکەلأوی
سك سووتاوی ڕاکشاوە
چەتری ڕەشی گەواڵەهەوری نەباری
لەسەر سەری خۆی هەڵداوە
ئێستە مەیدان، مەیدانی شەڕ
بۆ کڕووزی جەرگی کوردستانی لێ دێ
ئێستە ئاسمانەکەی مەڵبەند،
هەر مانگی خوێنی تیا هەڵدێ
تەماشاکە:
کوڕی جوانە مەرگی شاخ و
ئەم پێ دەشتانە ببینە.
لەم عەردەدا پەنجا دار سنەوبەر نووستوون
لەم دەشتەدا پەنجا ئەستێرە پاڵ کەوتوون.
پەنجا گۆرانیی وەریون



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

پەنجا گوڵە گەنم مردوون
پەنجا جۆگەی سوور مەییون
لەناویاندا
تایەری فەرخە و سەی حەسەن
بەرامبەر یەك
وەك ڕەزی سووتاوی دووشاخ
درێژ بوون و
هەر تەماشای یەكتر ئەكەن.

ـ 10 ـ

لە تانكێكدا
فرایزەری چاو بەدووربین پێ ئەكەنێ و
دەستی ڕاست ئەدا بە پشتی
موشیرئاغای هەمەوەندا.
تانك هات و هات
كە گەیشتە گەرووی دەربەند
دووربینی لە چاو كردەوە
بەسنگیا شۆڕی كردەوە لەتانكەوە
سەرێكی كێشایە دەرێ
وا ئێستاكە گورگی چاو شین
چاو بەشاخی

دەست هەڵبڕیوی یەخسیر و
تەختی تەوێڵی شکاوی،
پێ دەشتەکاندا ئەگێڕێ.
ئینجا ڕووی کردە موشیر و
وتی:
ـ شێخم ئەوێ!
تانك هات و هات
وەختێ لەدەربەند ئاوا بوو
بەم دیودا هات
جەنەڕاڵی پیرە دالاش
بەسەر هاتێکی دێرینەی
لەناو هەوری خەیاڵەوە،
بەبیردا هات:
" هێشتا مەسیح
وەك گوڵی سپی دار هەرمێ
نەپشکووتوو بوو، چاوانی.
لەو دەمەدا خاکی یۆنان
دایکێ بوو سەری لە هەوراو
چرای دەستی
هۆش هەڵکردووی
بەسەر دنیادا ئەیڕوانی
کوڕی وەکوو "لەئونیداس"ی بەشیری



PDF 4 KURD

مەمكی پڕی گۆش كردبوو.
كوڕەكانی تەڕلانی دەوری سەری بوون
ئەویش هێلانەی ناو دڵان
كوڕەكانی دیوارەشاخی دەوری بوون
ئەویش خەرمان
ئەو ڕۆژانە
خونكار نەبوو دەستی بگاتە دامێنی
كراسە سەوزەكەی یۆنان
یان كێ هەبوو كە بوێرێ
تەنها گوڵێ بكاتەوە
لەقژی خاوی ناو باخان.
هێشتا مەسیح
وەك گەواڵەهەوری سپی
نەچوو بووە ناو ئاسمانەوە
ئەو بەفرێكی نەباریو بوو.
كە لەشكری
لۆز ڕەشی پارسی ئێران
وەك بەرازێكی یەكانە
بەئاراراتا وەرچەرخاوە
ڕووی شفرەی خۆی،
كردە یۆنان
لەمەڵبەندی "تەساليا" ی،



PDF 4 KURD

كاكۆڵ سپی گۆنا ئاڵدا
بەراز گەیشتە بەردەرگای
داخراوی دەربەندەکەی " تەرمۆپیل" [18]
"لەئونیداس "پشتی پانی
نا بەدەرگای دەربەندەوە
"لەئونیاس"ئەچووە چاوی بەرازەوە
هەڕەشەی مەرگی لێ ئەکرد
شاخی بەسەردا ئەڕووخان.
هەر ئەوەندە و ئیتر بەراز
وەك کەوتبێتە زەلکاوی
خەم خۆرکێکی [19] قوت دەرەوە
چەقی و هەر سەری با ئەدا
بەلاّم "ئەفیاڵت"..
بەلاّم "ئەفیاڵت"ی سپارتی
کوڕی رەشی "تەسالیا"ی
چیا...فرۆش
باران...فرۆش
هەتاو..فرۆش
ڕێوی مەڵبەند. بەڵەدی ڕێ
نەویی لە گوێچکەی بەراز و
دەری هێنا
کەوتە پێش و بە ڕێیەکدا

PDF 4 KURD

کەخوای "ئۆڵمپ"یش نەیزانێ
کردنی بەودیو دەربەندا.
جەنەڕاڵی پیرە قاژوو
لەو بیری خەیاڵە قووڵەی تێی کەوتبوو
کەهاتە دەر
یەکسەر سەیرێکی "فیاڵت "ی
کوڕی ڕەشی کوردانی کرد
ئەوسا ئیتر
بزەیەکی زەرد وەك چزووی
زەردەزیڕە
بزەیەکی ناخ هەڵکەنە،
ڕەش وەکوو مێش
وەکوو گەنە
لەلێوی نیشت.
ئینجا دوور بینی سەرسنگی هەڵگرتەوە
نای بە چاویەوە و وتیەوە:
ـ شێخم ئەوێ.

* * *

ئەوا ئێستە
سەرقاپی تانك هەڵبڕاوە
دەمی تەندووری ئاسنین بەرەڵڵایە
سووك سووك ئەڕوا

PDF 4 KURD

لەم ساتەدا
چەند بالآیەکی کەم نەبێ
هەموو شتێ بۆ فرایزەر لەسەر چۆکە
لەم ساتەدا
چەند لاقێکی زۆر کەم نەبێ
هەموو شتێ لەبەر دەمی فرایزەردا
قاچ لەرزۆکە!
تانك هەر ئەڕوا
سووك سووك ئەڕوا
ئەوا ئێستا
تانك ڕاوەستا
سەریان لە تەندوور دەرهێنا
هاتنە خوارێ
لەبەر دەستە ڕاستەوە
بۆ چرووکی دەشت و لەش و
قژ و یالّ و خوێن تێکەڵە.
لەپێشەوە
موشیر ئەڕوات و بۆن ئەکا
خاوەن تەڵە
کوڕی ڕەشی ئەم دەربەندە
بەبۆن جێ پێی شێخ هەلّ ئەگرێ
لووت لەسەر زەوی هەڵنابڕێ

PDF 4 KURD

**هەتا ئەگاتە بن گابەرد**
**لەپڕێکدا دا ئەچڵەکێ**
**چەند هەنگاوێ**
**دێتە دواوە و ئەقیژێنێ و**
**دەست بۆ فرایزەر هەڵ ئەبڕێ**
**ئینجا ئەڵێ**
**ـ شێخت ئەوێ؟!!**

ـ 11 ـ

**بۆ سبەینێ، بۆ بەیانی**
**هەر کە یەکەم چەپکە گزنگ**
**لەکەلەوە**
**هەڵفڕی و خۆی هەڵدایە ناو،**
**سیروانەوە.**
**"بەمۆ" خۆی بینی لە ئاوا.**
**لەو کاتەدا**
**بە کەناری داوێن تەڕا**
**وەك پەڵە هەورێکی سپی**
**شوانێك و ڕانە مەڕەکەی**
**بەرەو بژوێن دائەگەڕان**
**لە دوو ئاوان**

PDF 4 KURD

شوانەی عاشق لەسەر بەردێ
ڕوو لەهەتاو
تێی چریکان
لەبەیتێکی تێچریکان
تا ئەوساتە
بەرگوێی سیروان
بەرگوێی بەمۆ نەکەوتبوو
هەر کەبیستیان
ڕەوەز شێت بوو
کەژان خۆیان ڕائەوەشان
بەیت بوو..بەیتی بازیان
بۆ شێخی بەردە قارەمان
⋆ ⋆ ⋆
بۆ سبەینێ، بۆ بەیانی
هەر کە یەکەم شەقژنی مەل
گەلأیان خەبەر کردەوە
نزم..نزم هەڵفڕین و
باڵیان وەردا لە "زرێبار"
لە کێڵگەکەی ئەو بەرەوە
خاڵەی جوتیار
خۆ هەڵکردووی دەس قوڕاوی
سەری بۆ "شاهۆ" هەڵبڕی

PDF 4 KURD

له هۆرەیەك تێی چریكان

تا ئەوساتە

نە زرێبار و نە شاهۆ

بەر گوێی سووكیان نەكەوتبوو

هەر كە بیستیان

شەپۆل لای دایە بەستێن و

دەمی خوڕەی خۆی توند گرت و

هاژەی بڕی

شاهۆش درەختی باوەشی،

ڕائەژەنی

هۆرە بوو هۆرەی سۆزتكێن

بۆ بازیان

بۆ شێخی بەردە قارەمان

* * *

بۆ سبەینێ، بۆ بەیانی

هەر كە یەكەم پەڵە هەوری

وێڵ و نامۆ

گۆزەی خاڵیی خستە سەر شان

چوو بۆ باران

وەختێ گەیشتە سەر سەری

گۆمەكەی "وان".

بۆ بەلەمێك تاق و تەنیا

چەتری سێبەری خۆی هەڵدا.

ماسیگری گوپ قووپاوی

شەڕواڵ دڕاو

وەختێ تۆڕەکەی کردەوە و

بەهەردوو دەست

توند حەوای دا

بۆ ناو ئاو و

بۆ ئەو بەختەی کە ئەو ئەیویست

ئیدی لەپڕ

لە لاوکێ تێی چریکان

تا ئەو ساتە

نەهەوری سەر،

نەماسی بن،

بەر گوێی هیچیان نەکەوتبوو

هەر کە بیستیان

لەتاوانا هەوری نامۆ

گۆزەی پڕی لەدەست بەربوو

فرمێسکی هاوینەی دارِشت

پۆلە ماسی جووت جووت هاتن

ناو تۆڕی لەدەنگ نزیکیان،

کرد بە مۆڵگە بۆ گوێ گرتن

لاوك بۆ لاوكی جۆشدان



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**بۆ بازیان**

**بۆ شێخی بەردە قارەمان.**

## ـ 12 ـ

**لە دوای پتریش لە شەست ساڵ**

**لە شارێکی باڵا سووری**

**بەفر لەتەوێڵ نیشتووا**

**لە شارێکی دووسەد ساڵەی نەنووستووا**

**لەگەڕەکێکی دەست و قاچ قڵێشاوا**

**لە خانوویەکی سەرپەڕی کورتە باڵای**

**بێ هەناوا**

**لەناو ژوورێکی یەك چاوا**

**لەشەوێکی قژ سپیدا**

**شاعیرێکی ئەم سەردەمە**

**بەچوار مشقی دانیشتووە و بالیفەکەی**

**لەسەر ڕانی خۆی داناوە**

**لەگەڵ وشەدا ڕێ ئەگرێ**

**لەگەڵ وشەدا ڕێ ئەبڕێ**

**بۆ بازیان**

**بۆ شێخی بەردە قارەمان**

**داستانێکی نوێ ئەنووسێ**

نیسانی 1983

سلێمانی

## پەراوێزەکان:

1–صەمەدی بیهرەنگی:نووسەری ئازادیخوازی ئازەربایجانی ئێرانی. زۆربەی بەرهەمەکانی بۆ هۆشیار کردنەوەی منداڵان تەرخان کردبوو. بەشێوەیەکی تراژیدیانەو لە زروفێکی نادیاردا کۆتایی بەژیانی هات. ئەم چیرۆکە شیعرە بۆ یەکەم جار لە ژمارە "31"ی مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی "1979"ی ڕۆژنامەی "عێراق "ی کوردیدا بڵاو کرایەوە. بۆ دوا جار لە چەند شوێنێکدا دەستکارییەکی کەمی شێوازەکەی کراوەتەوە.

2–موعینی: سلێمانی موعینی: لەڕابەرە ئازادیخوازەکانی کوردستانی ئێران بوو. شەهیدێکی قارەمانی نەتەوەکەمانە.

3–خەسرەو:خوسرەوی روزبە سەرکردەیەکی تێکۆشەر و ڕابەرێکی سیاسی بەناوبانگی ئێرانە. لە سەردەمی ڕژێمی شای ئێراندا لە سێدارە درا.

4–مامەیارە: داستانی ئازایەتی و ورە بەرنەدانی مامە یارەی قارەمان لەساڵانی دوای حوکمدارانی بابانەکاندا لەگەرمەی جەنگیندا دژی داگیرکەرە عوسمانییەکان لەو نیشانە هەرە دیار و گەشانەیە کە لە مێژووی گەلەکەماندا بیر ناچێتەوە و جێی شانازیی نەوە لەدوای نەوەمانە.

ئەمە وەك حەقیقەتێکی مێژوویی و کارەساتێکی تراژیدیانەی ڕاستەقینە. بەڵام بەداخەوە ئەوەی لەم بارەیەوە هەتا ئێستە نووسراوە و خراوەتە بەردەست لەچەند لاپەڕەیەك تێ ناپەڕن و گەلێ پرسیاری بێ وەرامیش لەدوای خۆیانەوە جێ ئەهێڵێ. منیش هەر لە ئەنجامی خوێندنەوەی ئەو چەند لاپەڕەیەوە ئەم چیرۆکە شیعرەم نووسی..دەقی تەواوی ئەم بەرهەمە بۆ یەکەم جار لە گۆڤاری "ڕۆژی کوردستان " دا ژمارەی تایبەتی بە شانۆ و چیرۆك بڵاوکراوەتەوە.

5–بەیتی ئاگر: ڕووداوەکانی ناو ئەم چیرۆکە شیعرییەو بەسەرهاتەکانی لەزادەی خەیاڵ و بیری شاعیرن..دەقی ئەم چیرۆکە شیعرییە بۆ یەکەم جار لە ژمارە "579"ی ڕۆژنامەی هاوکاری ژمارەی تایبەتی نەورۆزی 1981 دا بلاو کرایەوە. دوای ئەوە بۆ جاری دووەم بەتەواوی لە گۆڤاری نووسەری کوردا لەژمارەی "8" ی خولی دووەمی حوزەیرانی1982دا بڵاوکرایەوە.

6–ئەنگۆرە:سەرەتای تاریکی شەو.

7–داسـتانی بـەردەقارەمان: سەرچـاوەی ئـەم چـیرۆکە شـیعرییەو ئـەو کارەسـاتانەی لەشـەڕی دەربەندی بازیاندا ڕوویانداوە و کراون بەهەوێنی ئەم بەرهەمـە لـە "یادداشـت"ەکـانی مامۆسـتای نـەمر ڕەفیق حیلمییەوە وەرگیراون. دەقی تـەواوی ئـەم چـیرۆکە شـیعرییە بۆیەکـەم جـار لـەژمارە "11"ی گۆڤاری "کاروان" دا بلاو کراوەتەوە.

8–هەڵەمووت:شاخی هەزار بە هەزار و پلەی سەختی نێو کێوان

9–دەربەندەوشك: ناوی کۆنی دەربەندی بازیان.

10–تێل ڕەنگاو ڕەنگ:پەڕی طاوس.

11–سیك و گورگە و کاجنیس:ئەو سـەربازە بـەکرێ گیراوانـە بـوون کـە داگیرکـەرە ئینگلیزەکـان بەزۆری لە هندستانەوە بەرە و ڕۆژهەلأت هێنابوونی.

12– دوند: لوتکە

13–دەمەرقۆپان: شەڕواڵی مەیدانی جەنگ.

14–ناری: ناری شاعیر.

15–تەپڵی باز:تەپڵی مەیدانی شەڕ

16–یانزەتیرو حسك و ماوزەڕ: ئەوتفەنگانەی لەو سەردەمەدا بەکار ئەهێنران.

17–قەدارە: قەمەی بچووکی بەر قەدوپشتێن.

18–تەرموپێل:دەربەندی تەرموپێل لەتەسالیای یۆنان.

19–خم خۆرك: زەوی بەزەلکاوی قووتدەر.

PDF 4 KURD

"عاشوور حەمدان " لەولاّتی لم و عوجاجەوە هات و
ئێستە دانیشتووی ولاّتی گوێز و بەفرە
بەر لە ئێستە

**ـ صەریفەیەك ـ كە وەك دانی كلۆر وابوو**

**حەسیر ڕزیو، وەك تەڵەی مشك**

**تەنگەبەر و درێژكۆلە**

**ماڵی ئەوبوو، ماڵ ڕووتەڵە**

**دە ساڵ پێشتر..**

**عاشوور پۆلیسی بادیەی ڕۆژئاوا بوو**

**وەك دەشتی كاكی بەكاكی**

**تەپوتۆز عومری قوتدابوو،**

**دە ساڵ پێشتر..**

**تەڵەی "عەفلەق" لەوێ لەناو**

**قوللەی مەخفەرێكدا گرتی**

**عاشوور بوو بە پێچكەی موسەلەحەی ڕژێم**

**بەبەر چاوی فوراتەوە..**

**گەلێ قەتێی خۆشەویستی بیابانی**

**لەژێر خۆیدا پان كردەوە..**

**بۆ بەغدای تۆڕ**

**بوو بە بازی دەستەمۆی "شێخ" ی ڕژێم و**

**گەلێ باڵندەی هەڵاتووی ژێر زەمینی**

**لەسەر سنور ئەگرتەوە..**

**ڕۆژ لەدوای ڕۆژ**

**ئیتر عاشوور بوو بەدەسكێش**

**بوو بە كیفی درۆی دوو دەم**



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

بوو بە کێرد و خەڵکیش نێچیر
بوو بە "نەصیر"
بوو بە "عاگول"
بوو بە چاوی تەوری ئەمن
بوو بە "ڕەفیق"
بوو بە گوێچکەی دارو دیواروو بوو بەمار.

⋆ ⋆ ⋆

لەمەقەڕی دالآشێکی نێو شارەوە
هاوینێکیان دەمەو عەسرێ
دنیا مەنجەڵە ڤیرێ بوو
ئەکولاو یەڤی ئەدایەوە..
زۆر بەپەلە هەواڵێکی پێخاوسی خۆهەڵکردوو
وەك ڕەشەبا
لەبەر ماڵەکەی عاشووردا
لی لوول داو
وتی: ڕەفیق تۆیان ئەوێ

⋆ ⋆ ⋆

هۆڵە دالی پۆشتەی ناو شار
بەچەند تاقمێ موبێلەی، ڕەنگینی نەرم و نۆڵەوە
بێ لەعاشوور،پێنج شەش دالآشی قەڵەوی
لەدەوری مێزی شوشەبەند کۆکردەوە..
گەورە دالآشی بیابان سەرکەچەڵە

PDF 4 KURD

یەکەم داڵ بوو هاتە قسە:

ـ ڕەفیق عاشوور!

پەیامی ئێمە و شمشێری باپیرانمان هەر یەك شتە

هەر یەك ئالاّ و هەر یەك مشتە

مشتی نەمر!پەیام هەڵگر

هەوا لە کوێ بێ لەوێیە

دەشت لە کوێ بێ ئەو لەوێیە

شاخ لەکوێ بێ ئەو لەوێیە

ئەم جیهانە هەویرێ بوو عەرەب شێلای

کردی بەنان..

خۆر کوێر ئەبوو ئەگەر ئێمە نەبووینایە

ئاو ئەکوژرا ئەگەر ئێمە نەبووینایە

ڕەفیق عاشوور!

ئەسپی پەیام نزیك و دوور

بۆ هەرلایەك ئێمە بەرێ

ئێمە سوارین! ڕەفیق عاشوور.

لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵاتی

ئەم خەریتەی شمشێرەدا

لەگوێچکەی بەحری سوورەوە

هەتا قوڕگی شاخی پشتکۆ

گوڵە گەنمێ لە کوێ ڕوا

ڕکاعەتێ لە کوێ کرا

کڵۆ بەفرێ لە کێ باری
ساوایەك لە کوێ ناو نرا
لەم خەریتەی شمشێرەدا
هەر بە تەنها عەرەب هەیە و
کەسی تر نا!
ڕەفیق عاشوور!
شیمال.. سەرە.
دەمێ ساڵە لەم سەرەدا
ڕشك گەرای خۆی خستووە
پیلانێ پەپکەی خواردووە
کوڕی شمشێر
کوڕی قوڕئان..ئەبێ بڕوا
بچێتەوە سەر بەردەنوێژی باپیران
بچێتەوە لای گیانی "أبا عبیدە"
بڕواتەوە و سەر لەڕشك پاکاتەوە
بڕواتەوە و لەوێ بژی.
ڕەفیق عاشوور!
لەشیمالی خۆشەویستدا
بووکی سپی شارۆچکەیەك چاوەڕێتە
لەمڕۆ بەدواوە باوەشی ئەو بووکەمان
شوێن و جێتە
حیزب شمشێرەو تۆ دەستی



PDF 4 KURD

بابزانین ئەو شمشێرە
لە چەند لاوە ئەوەشێنی.
ڕەفیق عاشوور!
ئەمە دەنگی فرمانێکە شمشێرئاسا
کە لەکیف هاتە دەرەوە
ناچێتەوە ناو کیف هەتا
خۆی سوور نەکا!
لەو ساتەدا
عاشوور بوتڵێکی خاڵیی بوو
کەوتبووە ناو گێژاوەوە
لەمابێنی سارد و گەرما
بەرز و نزما
سەر و بندا
ئەهات..ئەچوو
هەڵچوون بۆ بەرەو ژوور ئەیبرد
داچوون وەکوو بەربوونەوە
خەیاڵی کەرت و پەرت ئەکرد
ئەویان بە پەیژەی تکریتا بۆناو کۆشکی بلورینی
پلەو پایە سەری ئەخست
ئەمیان سامی شاخ و داخ بوو
لەناو دەروونێکی ساردا
خلبوونەوەی تاشە بەردی

PDF 4 KURD

ڕووەو ناخ بوو.
عاشور دوای ئەوەی کە قوڕگی
لەبەڵغی ترس پاككردنەوە
ئینجا وتی:
ـ لەبەر دەمی ئەم فەرمانی شمشێرەدا
گۆچانین و کەمەی ملمان
تەواو کەچە
لەبەر دەمی ئەم فرمانی شمشێرەدا
کێ ئەتوانێ کڕنووش نەبا
بەڵێ! ئەڕۆم
هەر هەفتەیەك مۆڵەتم بەن
تا ئەگەمە ئەو بووکەی خۆم.
داڵێکی تری چاو زەردیان
لەگەڵ قاقایەکی بەرزا هەڵیدایە
- ڕەفیق عاشوور!
ئەڵێن ژنی ئەو شاخانە گەرچی بەفرن
بەڵام بەفری گەرم و نەرمن.
ڕەفیق عاشوور!
وا تۆ ئەچی
شیمال سێ شتی شیرینە
هەنگوین و گوێز و ئافرەتی!!
قاقای بەرزی درێژخایەن

PDF 4 KURD

پلیكانەی دەنگدانەوەی یەك لەسەر یەكی ناو هۆڵ بوو
داڵ بەكەیف و دەور و بەریش
وەك دەروونی ئەو وڵاتە
كش و مات و چۆڵ و هۆڵ بوو.
كاتی هەستان
داڵە گەورەی سەركەچەڵە
چەكمەجەی مێزی ڕاكێشا و
فایلێكی لێ دەرهێنا
بەخەتێكی درشتی سوور
لێی نووسرا بوو!
كاری تازەی "عاشوور حمدان"

★ ★ ★

مانگێك ئەبوو عاشووری مێشە سەگانە
گەیشتبووە ناو شارۆچكەی چاو بەگریان
مانگێك ئەبوو گەنەی بەعسی
بەلاملی ئەو كەوەوە نیشتبۆوە
كاتێ یەكەم نامەی نووسی:
هاوڕێیان!
ماچ و سەلام
من ئێستاكە
لەباوەشی بەهەشتێكی بچكۆلە دام
بەڵام ئەوەی وەكوو قەوزە

وەکوو خڵتە..
ئەم ماوەیە دڵی گرتووم
تاشە بەردی..
ئەم زمانە ڕەق و تەق و نەگریسەیە
زمانێکە جیوەی وشەی
لەناو گەروودا بەنگ نابێ و
ڕستەی خێرای ئەڵێی لەشی مارمێلکەیە،.
مەسعودی باشی بۆ چووە
ئەمە قسەی مرۆیە یان
جووکە جووکی بەچکە دێو وجنۆکەیە
هاوڕێیان!
پێویستە بەم نەخشەیەدا بچینەوە
وەکوو سەری گوندی یاخی
بەشمشێری زمانی خوا،..
ئەم زمانەش ببڕینەوە!
هاوڕێیان!
دوێنێ ددانی زۆر ناوی
لەق و کلۆری ناو دەمی
ئەم ناوچەیەمان هەڵکێشا
لەشوێن ئەوان..
تاقمی نوێمان بۆ کردن.
وەکوو منداڵی تازە بوو

دیسانەوە ناومان لێ نان: ـ
گەڕەکێکمان دا بە "سەعد"
یەکێکی تر بە "قوتەیبە"
مەیدانێکمان کردە بەری حەوتی نیسان
ڕاستە شەقامی شارۆچکە
شمشێرێکی دەسك سەوز بوو
دامانە دەس کوڕی "شیبان"
بۆسوارە گەورەکەی یەرموك.
باخچەیەکمان بۆ کرد بەبووك.
هاوڕێیان!
هەردوێنێش بوو لانەی چەتەی
بیست گوندی تر..
بوون بەخۆراکی نیوەڕۆی
سکی ئاگر..
لە شاخەوە لە دەربەندی عاسییەوە
بۆ بەرەوخوار دامان گرتن
ئاژەڵ بوون و..
میوەی گەنیوی ڕەز بوون و..
چەندین زیلمان لێ پڕکردن.
هاوڕێیان
ئێستە شەوە لەبەر پەنجەرەی ژوورەوە
ڕاوەستاوم

PDF 4 KURD

سەرنج ئەدەم لەم دنیایە
ئاگری ئێمەش لە دوورەوە
ئەسوتێت و ئەجریوێنێ و
ئەڵێی ملوانکەی فسفۆڕی
گەردن و سنگی چیایە.

* * *

کە عاشوور هات
لەحوشترێکی لەڕ ئەچوو
ملی درێژ
لاقی باریك
چاوەکانی بەقولاٌچوو..
کەعاشوور هات باری سووکی
سەر دووگی خست
تا چەند ڕۆژێ ماڵی نەبوو
لە مەقەڕی دالاٌش ئەنووست
دوای هەفتەیەك بردیانە سەر
ماڵێکی دەرگا داخراو
ماڵێکی دەرگا مۆرکراو
ماڵی ـ ئازاد ـ
کوڕی کێوی دەردەست نەکراو..
وەختێ دەرگای ماڵیان شکان
عاشوور بۆخۆی ڕاوەستابوو

بەچوار دەورا وەك ئەڵقەیەك
ڕمی چەقیو..
چەك بەدەستی چاو گۆمی خوێن
دەوریان دابوو..
وەختێ دەرگای ماڵیان شكان
عاشوور بۆخۆی چووە ژوورێ
سەرنجی دا
ماڵ حازرە
ماڵ پۆشتەیە
وەك ئەو وەختە جێ هێڵرابێ
جگە لەتۆز و گەردێكی لەڕوو نیشتووی
ڕەنگ خەماویی
سەرشت و مەك
هەموو شتێ لەبەر دەستاو ئامادەیە
هەموو شتێ..هەموو شتێ
فەرش. پەتوو. سەرین. دۆشەك
كەنتۆر. دۆلاب. قاپ و قاچاغ
هەموو شتێ..هەموو شتێ
بووكە شوشەی بزە گرتووی
چاوشینی سەر قەنەفەیەك..
عەسكەرێكی ڕەشاش بەدەس
سەر و سیما گرژ كردوو



PDF 4 KURD

قاچی ڕاستی بۆ پێشەوە..هێرش بردوو..
بەرگی بەری بەڵەك بەڵەك..
عاشوور ئەڕوا و چاو ئەگێڕێ
ئەمجارەیان لەبەر دیواری ژوورێکدا
ئیستێك ئەکا و ڕائەوەستێ
وێنەیەکی جام تێ گیراو
چوار چێوە شین
وێنەی ئازاد و ژنەکەی
عاشوور تۆزێ خۆی هەڵ ئەبڕێ
لەئاستی دەم و چاویاندا..بە لەپی دەست
تۆز و گەردی سەر جام ئەسڕێ
ئازاد ڕوونتر دەرئەکەوێ
ژن شەرمنۆك
بەڵام ئازاد چاوگەش چاوگەش
پێ ئەکەنێ..
عاشوور کەمێ ڕائەمێنێ
لەو ساتەدا،
واهەست ئەکا،
ترسێکی دوور..تارماییەك لەئازاد چوو
ڕاوی ئەنێ..
لەپڕێکدا دەست ئەداتە وێنەی دیوار
دای ئەگرێت و ئەیشکێنێ



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**لەو ژوورەیان دێتە دەرێ**

**ئەڕوا لەسەر کورسی دالأن**

**دائەنیشێ..**

**دەم و لووتی ئەبنە بۆڕیی**

**دووکەڵ کێش و..**

**جگەرەی بیستەم ئەکێشێ..**

**ئەمجارەیان دەست ئەداتە**

**عەسکەرەکە و**

**قوڕمیشەکەی بائەدات و بائەدات و**

**بەرامبەر بووکە شووشەکە قنج دای ئەنێ**

**ڕەشاش چوار پێنج ڕیز ئەکات و**

**بووکە شووشە چاو شینەکە ئەکەوێت و**

**ئەوسا عاشوور پێ ئەکەنێ و**

**ماڵ جێ دێڵێ.**

⋆ ⋆ ⋆

**ئێستە عاشوور حوشترێکە قەڵەو و ورگن**

**بەرازێکە شفرە ئاسن**

**ئێستە عاشوور لەم مەڵبەندەی کوردستاندا**

**قولاپی شادی گرتنە**

**لەناو گۆمی سەعاتەکانی ڕۆژگاردا**

**لەناو گۆمی سەعاتەکانی شەوگاردا**

**ماسی ڕۆحی زەردو سووری خەڵك ئەگرێ**

PDF 4 KURD

ئێستە عاشوور لەم مەڵبەندەی کوردستاندا
بەقەد گوڵە ژاڵەی زامی لەشی "یافا"
لەناو بانقی خوێنی مندا پارەی هەیە
هەزار جار هێندەی بەیداخی "فەلەستین"و
فۆتەی سەری دایکانی ماڵە شەهیدی
گەڕەکێکی ڕەشپۆشی قودس
مەترە زەوی و عەردی هەیە
بەقەد هەر شەش
گۆشەی ئەستێرەکەی داوود
مەدالیاو نۆتەی کوردکوشتنی هەیە.
ئێستە عاشوور
"وەحدە"ی دەمی قیمە کێشی سەر جەستەمە
"حوریە"ی چەقۆی شۆفلە و پێچکەی مەرگی بلدۆزەرە
ئیشتراکیەت لای عاشوور..دابەش کردنی هەژاری و
برینی جەور و ستەمە.
ئەمڕۆ عاشوور هاوڕێی عاشوور حیزبی عاشوور
شەوان درەنگ کە پەتی سێدارە ئەنوێ
لەسەردابی ئەشکەنجەما کۆ ئەبنەوە..
چەکمەجەی عومری زیندانیم ڕائەکێشن
تەسکەرەی منداڵ و گەورەم دەرئەهێنن
گەورە گچکە ئەکەنەوە
گچکە گەورە ئەکەنەوە

PDF 4 KURD

سیانزه بۆ بیست

هەشتا بۆ چل..

تا، بەیانیی کە ڕۆژ بۆوە

بەپلیکانەی قانوندا

سەریان خەن و

پەتی مەرگیان بکەنە مل.

★ ★ ★

تا چەك سەری هەڵنەبڕیبوو

هەتا خاك ڕانەپەڕیبوو

تا قەندیل هەڵۆی نەدیبوو

وشە گوللەی نەناسیبوو

شمشێرەکەی دەستی عاشوور وەك ڕەشەبا

بێ ترس و تەنیا ئەگەڕا

شمشێرەکەی دەستی عاشوور

لەکام شوێندا بیویستایە

شەقام بووایە

ڕووناك بووایە

تاریك بووایە

دائەگەڕاو هەڵ ئەگەڕا

وژەی ئەهات..

هەڵ ئەسووڕا.

عاشوور کەڵەگای ڕۆژگار بوو

لێرە و لەوێ هەر سوار ئەبوو
سواری سەرو سواری مل و
سواری شار و سواری گوند و
سواری چیاو ڕووبار ئەبوو.
تا ئەو وەختەی ئیتر تفەنگ
چاوی گلۆفت
جولاو هەستاو کەوتە سەر پێ
چیا ملی قوت کردەوە
شەقام دەستی ڕاوەشان و
قەڵەم وشەی کۆکردەوە..
ئەوسا ئیتر بەرە بەرە
شمشێرەکەی دەستی عاشوور
بوو بە ڕەقە
کە شەو ئەهات
ملی ئەبردەوە دواوە بۆ ناو قاوغ
بە ڕۆژ ئەهاتەوە دەرێ
تاوای لێ هات
شمشێرەکەی دەستی عاشوور
لەسێبەری کیفەکەی خۆیشی بترسێ.

⋆ ⋆ ⋆

شەوە شەوی چاو چاو نەبین
تەپ و نمی باران بارین



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**هاژەی ناو دۆڵ و کەف چڕین**

**خوڕەی شەتاو**

**بواری چەمی زۆر هەستاو..**

**شەوە شەوی چاوچاو نەبین**

**مەفرەزەیەك..یەك لە دوای یەك**

**بەهەنگاوێ یان دوو هەنگاو**

**سەری لووت و پەڕەی گوێچکە**

**سڕ و تەزیو..**

**مەفرەزەیەك..هەرئێوارە بەڕێ کەوتوو**

**تیایاندایە شێو نەکردوو**

**یەك لەدوای یەك**

**بە هەنگاوێ یان دوو هەنگاو**

**بەمشەمما چەك داپۆشراو.**

**ناو بەناوێ**

**شەوقی خێرای لایتی دەست**

**بۆ بەردەم و بۆ ڕاست و چەپ**

**کە تیشکی تیژی ئەهاوێ**

**لەئاوێنەی شەوقی تەڕا**

**لاسکی بارانی ڕەنگ زیوین**

**چەند ڕێزێکی دەرئەکەوێ.**

**بەرگی بەر تەڕ شلێپەیان دێ.**

**لەگەڵ دووان و قسەدا**

پچڕ پچڕ
وەکو لوولەی کتری کولاّو
دەم هەلاّوی لێ هەڵ ئەسێ
پێلاّوی لاستیك گرژ بوو
ئاو تێی ئەچێ و
شلّقە شلّق
سەری پەنجەی تیا ئەتەزێ.
قوڕی دەشتی سپی باوی
لەکەتیرە و لەسرێش چوو
وەکوو بنێشت هەنگاو ئەگرێ
جار بەجاریش تۆ ئەڕۆیت و
لە دواتەوە،.
تاکێ پێلاّو جێ ئەمێنێ.
شەڕواڵ دەرلنگ قوڕاویی
دەس گۆ ناکا و
هەناسەی سنگی نوقمبووش
چۆلەکەیەکە خنکاو و دەم داپچڕیو
سەر دەردێنێ..
لەناکاویش لەبەر دەمتا
هەورازێکی کووڕی رووتەن دەرئەکەوێ
ئای لەو وەختەدا گوێت لێ بێ..
هەر ئەشرۆن و لەبەر خۆوە

PDF 4 KURD

جنێوی چۆن بە زستان و قوڕ و لیتە و
دایکی پێڵاوی لاستیك و
عاشوور ئەدرێ!
شەوە شەوی چاو چاو نەبین
مەفرەزەی کەنەفت ئەگاتە
شوێنی مەبەست..
بلاو..بلاو..دوو سێ کەمین دائەمەزرێ
دەنگی بەرز و لایت لێدان
وەکوو کێشانی جگەرە
لەناویەکدا
هەڕەشەیان زۆر لێ ئەکرێ.
* * *
شارۆچکەی گلۆپ هەڵکراو
لەو بەرزەوە کە ئەبینرێ
ئەڵێی ئەستێرکی پڕشنگە
یان مرواری هەڵڕژاوە
بریسکەی دێ.
ئێستە زۆری وەکوو ئازاد
کە چەناگەی خەیاڵی مەنگ
ئەخەنە سەر لوولەی تفەنگ
لەو دوورەوە هەناسە بۆ
شار و ماڵ و یادگاری تالان کراو

هەڵ ئەکێشن..
ئەزانن چۆن تۆزێکی تر..
ئەبن بە گەرداوی ئاگر دائەگەڕێن
ئەزانن چۆن تۆزێکی تر..
لە شاری شەقام کوژراوا ئەوەستن و
میلی تۆڵە ڕائەکێشن.
شەوە شەوی چاوچاو نەبین
لەم ساتەدا شۆڕش ڕەنگی نارنجییە
گوللەی گڕدار وا ئەنووسێ.
لەم کاتەدا بەرگی بەری شۆڕش ئاڵە
برینی لەشی پێشمەرگە وا ئەنووسێ.
لەم ساتەدا شۆڕش تەوقەی مزگێنییە
هەڵاتنی داڵ وا ئەڵێ..
لەم ساتەدا شۆڕش تاریکیی ڕاونانە
دیلکردنی شمشێرەکەی دەستی عاشووریش
وائەڵێ:
سەری کۆڵان ئەتوت دەمی پرێمزە و داگیرساوە..
دەوری فولکە کەمینێکی کون بڕ..مەحکەم..
وەکوو پشتێنی ئاسنین دەوری داوە..
خوارتر بۆسەیەکی چەپەك
وەك نانەچەورەی ناو تەڵە
هەر بۆ ڕاکێشانی نێچیر دانراوە..



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دەست ڕێژ. گیزە. ترپە ترپ. گرمە گرم
ئینجا سامێکی بێ دەنگیی
لە پڕێکدا کوژانەوەی گڵۆپ هەموو
تاریکیەك بەسەردا دێ
تاریکترە لە تاریکیی
وەکوو خۆیان تەقەی شڵەژاوی دوژمن
سەر ئەکەن و خوار ئەکەن و گوللەی وێڵن
وا لە ژێڵڵاوە.. پیکابێ
لووت بەرز ڕەنگ زەردی مەغاویر
دوو ڕیزی پشت لە یەکتری
عەسکەری ڕەش ڕەش وەکوو قیر
دانیشتوون و لوولەی چەکیان
بۆ ڕاست و چەپ ڕوو لە دەرێ
پیکاب وەکوو تیسکەی تفەنگ
دەرئەچێت و ڕوو لەسەرێ
لەدوایشەوە لاندرۆڤەرێ
نەء بوون بە دووان
نەء بوون بە سیان
گیزەیەك و تێ ئەپەڕن..ناو سیخناخ و تێك ترنجاو..
لەتیژیدا سەرنج فریایان ناکەوێ
پیکاب دێت و دێت و دێت و
بۆسەی یەکەم کڕ ئەبێت و

دووەم بە ئەنقەست ئەنوێت و
سێهەم هەرچی ناڵە و گرمەی مەفرەزەیە
بەجولاّنی چەند پەنجەیە،.
شالاّوێکن ڕوو ئەکەنە ئەو جێگەیە و
ئیتر پیکاب
وەکوو شەقام بە قاچی خۆی
تێی هەڵدات و بەحەوادا فڕێی دات و
دێوی باڵداری ئاگری تێ بەر بدات
هەڵ ئەگیرسێ و
هەڵ ئەقرچێ و
هەڵ ئەبەزێ و
دائەبەزێ و
لووتی شکاو وەرئەگێرێ و
دووکەڵ ئەیخوات..
پیکاب هێشتا بەحەواوە
ئەزریکێنێ..
کە لەدواوە ئەوانی تر
هەویری لەشی یەکتریان
لەناو بۆدیا شێلاوە،.
بەنزین و خوێن و گریس و گۆشت و لاستیك
ئێسك و ئاسن
بوون بە شتێ



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

شتەیش ناوی لێ نەنراوە.
لەم شەقامەو لەم شەوەدا
لەم شارۆچکە بچووکەدا
ئێستە ڕژێم ماڵۆسێکی سەر بڕڕاوە.
ئێستە شمشێرە کولەکەی دەستی عاشوور
تەختەیەکی قڵێشاوە
بانگی کشانەوەی ئێمەش ئیستە
وەختێتی و هیچی نەماوە.
* * *
بەیانی بوو سەری سەعات
بێ سیمی ناو کونە ئەشکەوت
بێ سیمی ناو دارستان و هەردوو پێ دەشت
زمان و گوێ ی سەنگەر بوون و
ئەیانبیست و دەنگیان ئەهات
وەکوو نانی گەرمی تەنوور
هەواڵی تازەی نەبەردیان
بۆ یەك ئەنارد
بەیانی بوو سەری سەعات
بێ سیمەکان بەزیکە زیك
بە پەلەپەل
زەمانیان کورت ئەکردەوە
وەکوو ئاریەڵ

ڕێگای دووریش بەڕێی نزیك
بەیانی بوو سەری سەعات:
دنیا سارد سارد
ـ شەپۆل. شەپۆل. هەڵۆ!
وەكوو هاواری بنی بیر
دەنگ زۆر كزە
ـ شەپۆل. شەپۆل.هەڵۆ!
دوو دابەزە.
ـ هەڵۆ. هەڵۆ. شەپۆل!
ـ ئێستە باشە
ـ دەی چیت هەیە؟!
ـ بروسكەیەكی پەلەیە..
ـ من ئامادەم
بەردەوام بە
ـ دەبنوسە.
ئیتر برووسكەكەی هەڵۆ وەكوو گوڵاو لەسێبەرەوە بۆ هەتاو
هەرچی هەنگی دور و نزیكی بێ سیمی ناو شۆڕشە..
بە گیزە گیز دەوری ئەدەن
بە ژاوە ژاو گێژی ئەدەن
سەرە ڕێی خەتی لێ ئەگرن
هەندێ تەواو
هەندێكی تریش ناتەواو

گۆی هەواڵی تازە ئەمژن

ئیتر بروسکەکەی هەڵۆ لەناو شەش حەوت دێڕی شاشا

ژووری هەواڵ دروست ئەکا..

ژوورێ بۆ زیانی دوژمن

کوژراو. زامدار

ژوورێ بۆ دیل

ناویان ئەبات..

دەرگایان لەسەر دائەخات.

ژووری دەسکەوت. چەك و فیشەك

چەکی گەورە برا گەورەن

لەپێشەوە ناویان ئەبات..

ئەمجارەیان لەناو ژووری

دیلەکاندا..

داڵی گیراوی کزو مات

ـ عاشوور حەمدان ـ

نێچیرێکی قەڵەویانە

بۆیە بێ سیم

پەیتا..پەیتا

ناوی ئەبات.

هەواڵ ژوور بە ژوور ئەگەڕێ

هەتا دوا ژووری برووسکە

ژوورێکی ڕەنگ ئەرخەوانیی



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**دەرگای والاّ و**

**پەنجەرەی دانەخستووە**

**ئەو ژوورەی چاوی شەهیدی**

**تازەمانی**

**تیا نووستووە**

**ـ هەلۆ. هەلۆ. شەپۆل!**

**ـ شەپۆل. شەپۆل. هەلۆ!**

**ـ بەردەوام بە**

**کاکە لای منەوە تەواو**

**سەری سەعات سەر بەرەوە**

**ئەگەر هەواڵی تازە هات**

**ئامادە بە.**

**ـ ئەریَ جەو لای ئێوە چۆنە؟!**

**ـ لە شەوێوە بەفر ئەباریَ**

**هەتا ئێستە**

**سیَ جار سەربانمان ماڵیوە..**

**ـ ئەی لای ئێوە..**

**حاڵی ئێوە و پیرە زستان؟!**

**ـ هەر بارانە و بەلاّم لافاو**

**ڕێی ئێمە و گوندی بڕیوە..**

**ئیشیَ..کاریَ؟!**

**ـ هەر خۆشیتان**

ـ خوا حافیزبێ.

بەفرە و باران. لەوێ بەفرە و لێرە باران. لەولا گڕە.

لەملا کزە. لەناو نەخشەی پێشمەرگەدا. سەرما و گەرما،

تەرزە و پشکۆ، سەریان ناوە بەیەکەوە، وەرز ئەگۆڕن ـ

ساڵ ئەگۆڕن. دنیای کۆن هەڵ ئەگێڕنەوە. لەناو بەفرا

خوێن ئەڕوێنن، لەناو خوێنا، تەرزە و بەفر ئەتوێننەوە

کێڵگەی برسێتی ئەکێڵن. دەغڵی ئازاری یەك بە دە ئەدروونەوە

بەفرەو باران، بەفریش پێشمەرگەی سروشتە.

پێشمەرگەی شۆڕش‌و

سروشت لەم وەرزەدا قۆڵیان لەقۆڵدا و پێکەوە ڕێگەکانی

داڵ ئەبەستن چنگەکانیان لەگۆ ئەخەن

باڵەکانیان ئەبەستنەوە.

بەفرەو باران.ئەوەتا واعاشوور حەمدان

داڵاشی ڕەشی باڵ شکاو

بووە بە فاقەی پێشمەرگە و سروشتەوە دەردەست کراو.

شمشێرەکەی زەلیل زەلیل. پاڕانەوەی داماو داماو.داڵی گیراو

داڵی ناوسك پڕ لە بێچوە چۆلەکەی کورد پێش خراوە و ڕەت

ئەبات‌و هەنگاو هەنگاو ئەژنۆی ئەشکێ

ئێستە عاشوور پەیامێکە

کەسیرە بوو. دروشمێکە قاچ‌و قول‌و دەست‌و پەنجە سەرمابردوو.

مەگەر هەر تەنها بینی ئاو لەم کاتەدا وەکووعاشوور

لەترساندا هەڵبلەرزێ.

ڕێ درێژە. وەكوو مێژووی پڕ ئەشكەنجە. ڕێ درێژە.
چەقەنە بەرد. هەڵەت هەڵەت. هەرشەقاوێك داڵ ئەڕوات و
شەقاوێكی تر ئەكەوێ بۆ بەرەو ژوور. دوا پلەی دوند،
چاوی كوژاوە هەڵ ئەبڕێ. لەپشتەوە لوولەی تفەنگەكەی
ئازاد ئەكاتەوە سەر قەپرغەی هەڵی ئەبڕێ،ئەیخاتەوە سەر
تووله ڕێ. وەكوو ئاوێنەی تەم گرتوو چاوی عاشوور تارمایی
ئازاد ئەبینێ. ئازاد ئەچێتە بەردەمی هەڵ ئەتروشكێ،
ئەمجارەیان كە پشوودان بەلەپی دەست ئاوێنەی
چاوی تەم گرتووی
عاشوور ئەسڕێ ئەوسا ئیتر نەك وێنەكەی، بەڵكو ئازاد،
خوێنی،گۆشتی،خۆی ئەبینێ،دەنگی ئازاد.
قاقای پێكەنینی ئازاد،
خۆی ئەبیسێ ئەمجارەیان داڵ ئەتاسێ و
تارمایی مەرگ دەس
بەخەنجەر لەسەر سەری ڕائەوەستێ
پاش چەند ڕۆژێ داڵ ڕیش
هاتووە. پانتۆڵ دڕاو. وەك گیسكێكی لەڕو لاواز ئەگاتە جێ.

★ ★ ★

شەوی كڵپە و هەڵمەتەكە. عاشوور خۆی كرد
بەنەخۆش و نەچووە دەرێ.
شمشێری لە كون خزاوبوو. لەكەنتۆردا پشیلە بوو
خۆی مات دابوو.

PDF 4 KURD

کۆمەڵێ جاش ڕەنگ پێ نەماو، هەناسە سوار،
چوونەماڵی وتیان
ڕەفیق وەرە دەرێ فریا کەوە،وا مەقەڕ و وێنەی
سوڵتان و شارۆچکە بەیەکەوە گڕ ئەسێنێ.
داڵی ناچار هاتە دەرێ
دوا لاندرۆڤەر ڕاوەستاوەو سواری ئەبێ. دەس لەسەر دڵ ئەکەونە ڕێ
وەختێ عاشوور دۆزەخی پێش خۆی ئەبینێ
زارەتریك ئەحەپەسێ
هەر بە پەنجە فرمان ئەدا و شۆفێر بەرەو
دوا سوکانی وەرئەگێڕێ
بۆسەی یەکەم ئامادەیە و دەرئەپەڕێ و
وەك نێچیری چاو بە وەنەوز ئەیانگرێ.

* * *

هەر ئەو شەوەی چنگی هەڵۆی خۆ کزو کرد
داڵی فڕان..
لەدۆڵێکی قەراغ شاردا. کڕنەپندی
کەمەفرەزە خڕ بوونەوە..
گیرفان..گیرفان
جلی بەری عاشوور و دیلەکان گەڕان
یەکە بەیەکە و جیا بەجیا
چییان تیا بوو بەدەست نیشان
بەژماردن دەریانهێنان

لەسەر مێزی تاشە بەردێ
وەکوو بڵێی
بۆ ئەوان دروست کرا بێ
دایان ئەنان
لەودەمەدا باران خۆشی کردبۆوە
لەوە ئەچوو ئەمجارەیان بای بەفر بێ
هەر بەپێوە
لەبەر شەوقی ئەم لاو ئەولای چەند لایتێ
ئازاد لە شتی ناو گیرفان ورد ئەبۆوە
تا سەر ئەنجام،
لەبەر باخەڵی عاشوور دا
ڕۆژ ژمێرێکی بچکۆلەی قادسیەو
هەندێ کاغەزیان دەرهێنا
حەسحەسی تیشکی ڕووناکیی
بەسەر ڕیز بەڕیزدا گەڕا
ناو بەناوێ سەرنج زیاتر
لەسەر هەندێ دێڕ ئەوەستا
ئەوسا ئازاد لەبەر خۆوە
ورتە ورتێکی لێ ئەهات
دەم و چاوی گرژ ئەکرد و
سەرێکیشی بۆ بائەدا
لەدواییدا



PDF 4 KURD

ئەوانەی گلیان دانەوە
پێناسەکان،ڕۆژ ژمێرێ،چەند کاغەزێ و
چوار دەستکێش بوون
وێنە و نامەی زۆر تایبەتیش
بۆ گیرفانی دیلی هێشتا هەر وڕ و کاس
گەڕانەوە.

* * *

لەیاداشتە نەهێنییەکەی بەرباخەڵی عاشووردا
وەکوو لاشەی سەر ئاو کەوتووی دوای تاوان.
ئێستە تەرمی شیعری بزر. زامی گیراو ئەبینینەوە.
ئێستە گۆڕی وەرزی کوژراو.دەنگی خنکاو ئەدۆزینەوە
ئێستە دەرکەوت ژێر زەمینی
ڕۆژ ژمێرەکەی عاشوور.
کام پیلانی پەپکەخواردووی لەخۆیدا حەشارداوە.
ئێستە دەرکەوت کە قەنارەی نەهێنیی
لە یاداشتی بەرباخەڵی عاشووردا
بۆ چەند تیشکی سەوزی هیوای پاشەڕۆژ هەڵخراوە.
لەیاداشتی بەرباخەڵی عاشووردا.
زۆڵە یاسای ئۆتۆنۆمی ئەم حوکمە
ئافرەتێکە بۆ کامێرای تەلەفیزیۆنی درۆ
داوێن پاکە و سپی پۆشە و فریشتە
دوای کامێراش هەرزان هەرزان

ئەیفرۆشێ ئابڕوی تکاو. ئەو لەشە.
لەسەردابە نەهێنییەکەی
بەرباخەڵی عاشووردا
چەند ڕۆژێکمان
لە گیرفانی ئەو یادداشتە دەرهێنا: ـ
*بەپێی بەڵێنێکی زووترکەپێی دابووم
پێش هەفتەیەك ژنەکەی (ن)
کاسێتێکی مێردەکەی خۆی لەناو سنگیا شاردبۆوە و
بۆی هێنابووم
وەختێ گوێم گرت لەوە ئەچوو
وەختی مەست بوون قسە بکات
لەشوێنێکدا (ن) وا ئەڵێ:
ئەم شەڕە بۆ؟!
ئەم شەڕە وەك گۆشتی مردووی
بۆگەن کردووی لێ هاتووە
ئەم شەڕە بۆ؟!
لەبەر کورسی و لەبەر چاوی
تاقە کەسێ!؟
حەوت ساڵ ئەبێ،.
(ن) هاوڕێی ئەم سەفەرە درێژەیە
دوێنێ (ن) مان هەر بەدەستی
ژنەکەی خۆی دەرمان خوارد کرد



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئەمڕۆش بە مارشی عەسکەری و
کۆڕەوێکی زۆر گەورەوە
تاقەراغ شار،،تەرمەکەیمان
بەرەو "حلە"
ڕەوانە کرد!
⋆چەند ڕاپۆرتێکی نزیکی ئەم لاو ئەولای
بوون بە چرای
تاقیب کەرمان
زۆردەمێك بوو لە کوڕەکەی
وەستا حەسەن بە گومان بووین
ئەمڕۆ لە جەژنی سوپادا
قەزاو قەدەر
زیلێك شێلای!
⋆ئەمیشیان قسەی نەستەقە
سەگ هەر سەگە
کورد هەر کوردە
"فرسان "ە یان "موخەریب"ە
⋆ئەمڕۆ نامەم بۆ (ص)ی ئامۆزام نووسی
(ص) لەبەسرەیە و عەسکەرە
بۆم نووسیوە: فریاکەوە
خۆزگەیەکت ئەهێنمەدی
ئەڵێی بەهەشتی ناو خەوە

PDF 4 KURD

پارچەیەك عەرد..چوار سەد مەتری
باوەشت بۆ ئەگرێتەوە..
دە هەزاریش پارەی بەخشیش
ئەو هاتووە بە پیرتەوە
فریاکەوە..
ئای بۆ عەرەبێ کە خێرا
بێت و لەجێی ماڵە کوردێ
لە شاری گەوهەری ڕەشدا
خانووی تازە بنیات بنێ!
٭ئاخ! ئاخ!
هەر ئەمجارە
هەر لەم شەڕە ببینەوە
شەرتە ناوی بەفر لەبیر
ئەم شاخانە بەرینەوە
ئاخ..ئاخ!هەر ئەمجارە.
٭دوێنێ شەوێ
چوار موخەریب بە چوار چەك و
دووی زیادەوە
خۆیان دایە دەست مەخفەرێ
خۆم چووم دیمن
ئەتوت گەماڵی چڵکنن
بەڵام سەیرە

بۆچی هەتا لای ئەوانن
کۆ لەمەرگ ناکەنەوە
کەچی کە دێنە لای ئێمە
ئەڵێی تانجی ترسنۆکن!!
٭ ئەمڕۆ ماندووین
لە شەبەقەوە خەریکی
ڕاگوێزانی چوار پێنج گوندین
من و ناصر
حەوت سەعات ئەبێ بەپێوەین
زۆر شەکەتین
هەتا ئێستەش وڕ و کاسی
تەقینەوەی دینامێتین
٭ ئەمڕۆ (ا) و (س) مان بانگ کرد
ئەم دوو قەلەباچکە کوردە
تەمەنی ماڵی کردنیان
ئێستە لەچوار ساڵ زیاترە..
پێمان وتن: قەلەباچکە بەڕێزەکان
ئێوە ئەبنە زمان و گوێی گەلی کوردمان
بۆ ئەم دەورەی داهاتووە
ئەبێ خۆتان هەڵبژێرن
لەمڕۆیشەوە وا بزانن
دوو ئەندامی ئەنجومەنن.

*لەبەغداوە ئەمڕۆ لاشەی
دوو موخەڕیبی گیراویان
هێنایەوە بۆ شارۆچکە
لەبازاڕدا چپە چپە
ئابلۆقەی ماڵەکانمان دان
باوکی هەردووکیانمان بانگ کرد
پێمان وتن..باش گوێ بگرن
ئەوەی لەگەڵ ئێمە نییە
گەر وا بمرێ پرسەی نییە
دەرگا داخەن!
گریانیشتان قەدەغەیە.
*وەك دیبوویان:
موخەڕیبێکی خڕیلەی دەماغ کردوو
ئەمڕۆ سەعات سێی عەسر بوو
لەمەیدانی گەورەی شاردا
ڕەفیق (ناصر سلیمان ) ی
دایە بەر ڕیزی دەمانچە و
یەکسەر کوشتی
وەکو موروی غەیب وەهابوو
کەس نەیزانی بۆکوێش دەرچوو!
*دوێ نیوە شەو
بەپێی نەخشە و تۆڕێکی ورد

PDF 4 KURD

کەس و کاری نزیکەی بیست موخەڕیبمان
وەکوو مریشك و جووجەڵە
لەخەودا گرت.
*ئەمڕۆ ست "شەرمن"م بانگ کرد
شەرمن بەرپرسی یەکێتی ئافرەتانە
پێم وت: بۆ خۆشی ئەفسەرە ئازاکانی
ئەم عێراقە
لە ئەندامان وەك گوڵ بژێر
بۆ ئاهەنگی قادسییەی سووری ئەمشەو
چەپکێ کچی ڕەنگاو ڕەنگی زۆر ناسکمان
لە گوڵدانی یەکێتیدا بۆ بنێرێ!!
* * *
داڵ غەڕڕابوو. وەختێ ئەفڕی
وەختێ هەندێ پەڵە هەوری نزمی لەژێر
پێیدا ئەدی. وای ئەزانی هەموو لووتکە و
هەموو هەورێ سەر دائەخا و بەچۆکدا دێ
لەبەر قیڕەی لەخۆبایی..
داڵ غەڕڕابوو ئاسمانی گەورەی نەئەدی
وای ئەزانی زەمان ئەپێچێتە باڵی
هەتاکوو سەر..لەسەر ڕۆژان کڕ ئەکەوێ
هەتاکوو سەر.. بڵند ئەفڕێ و
سەر بەرەو خوار نابێتەوە بەرەو دۆڵی

PDF 4 KURD

نزم و نەوی..

★ ★ ★

بەر لەدایك بوونی عیسا
ڕەنگە هەر لەم دەربەندەدا بووبێ
حەوت شەو..حەوت ڕۆژ
ترس چاوی " گەزنەفون" و
سوارەی یۆنانی قوتدابێ.
ڕەنگە هەر لەم دەربەندەدا بووبێ.
حەوت شەو حەوت ڕۆژ
تیری درێژی ڕم ئاسا
بەر لە دایك بوونی عیسا
ئەم دیو ئەو دیو
زرێ پۆشی كون كردبێ و
وەك نیشانەی مێژووی ئێمە
لەسەر دڵی ستەمی كۆن هەڵچەقیبێ.
لەو ڕەوەز و لەو دوندەوە
بەفر كوژیان هەڵدێرابێ
ڕەنگە هەر لەم دەربەندەدا بووبێ.
لەئەشكەوتێكی ئێرەدا
لەو ئاستەدا..لەم ئاستەدا
بەپۆل داڵی باڵ شكاویان
بەند كردبێ!

ڕەنگە هەر لەم دەربەندەدا بووبێ.

* * *

ئێستە سەعات دەی بەیانی
ڕۆژی هەینی..هەشتی هەشتی
هەشتاو شەشە
لەژێر کەپرەکەی خۆمەوە
لەنێوان لقی دارگوێزی گوێ چەمەوە
هەر لە هەمان دەربەندەوە
لەسەرەوە..
بەتوولە ڕێی ئەوبەرەوە
ڕێچکەیەك داڵی گیراوی چەماوەی ژێر
کۆڵە خۆڵ و خشت ئەبینم..
عاشووریشیان لە پێشەوە
ڕێچکەیەك داڵ
تەنها بازێك لەپشتەوە
گڵ..ئەکێشن..بەرد ئەکێشن
دار..ئەکێشن
بۆ خەستەخانەی ئەو هەڵۆ زامدارانەی
بەباڵی خوێناوی شۆڕش
شیعرێکی نوێم بۆ ئەنووسن.

بەرگەڵو
1986 / 8 / 8



PDF 4 KURD

هەموو ڕۆژێ لە تاو هیجرانی ئەمساڵ
تەمەنای مردنی پێراره بێ تۆ!

نالیی

غەریبیی غوربەتی کردم بە ئەوطان
سەراپا ئەرزی لێکردوومە زیندان!

حاجی قادری کۆیی

دوور جە قامەتت قیامەت خێزان
هیجرەت شەرارەی جەهەنەم بێزان!

مەولانە خالیدی نەقشبەندی

PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

I

**دلۆپ، دلۆپ باران: گوڵ ئەنووسێتەوەو**

**نمە نمەیش چاوانم تۆ!.**

**چ سالاوێکی[1] نامۆیی و چ ژانێکی بەخشندەیە**

---

[1] سالاو: ساڵێك ئاوی زۆربێ.

PDF 4 KURD

وا لەسەرخۆ
بەرد بە بەردی
کێوی سەرم ئەپشکوێنن
لق بە لق و چڵ بە چڵی
دەست و پەنجەی وشکەڵاتووم
شین ئەکەن و وەك باویلکە[2]
ئەمدەن بە دەم بارێزەکەی ئەوینتەوەو
لەشەختە بەندانی گیانتا: ئەمرسکێنن.

گڤە، گڤە "با" پێدەشتت ئەخوێنێتەوەو
نەفەس نەفەس هەناسەیشم: باڵاکەی تۆ
چ گەردەلوولێکی سەوزەو
چ ئەسپێکی ئەفسانەیی باڵدارە وا
لەم کۆتایی دنیایەوە
بە پرتاو دێ و هەڵم ئەگرێ و ئەمفرێنێ و
دوور دوور ئەمبا
بەرەو هۆبەی ئارانی[3] تۆ.

کلوو، کلوو بەفر گوێ بۆ چیا ڕائەدێرێ و
وشە وشەیش هۆنراوەی من بۆ سۆزی تۆ

---

[2] باویلکە: گیایەکی تووك سپییە لە پایزاندا با بڵاوی ئەکاتەوە.
[3] ئاران: جێی زستانەی کۆچەران.

PDF 4 KURD

چ بەفرانبارێكی زەردە و

چ كرێوەی حیكایەتێ بەم ناوەختەو

لە ئاویلكەی[4] ئەم ڕۆژەدا

وەك عەشقەكەی "برایمۆك"

پێدەشت پێدەشت و كۆ بە كۆ

بە ڕێگەی مەرگی سپیدا

ئەمخاتە ڕێ بەرەو لای تۆ



سەفەرە

سەفەرە

سەفەر.

سەفەری ئازاری زگماك و سەفەری

درەختی بێ داڵدە و بێرێتەی[5] زامانی گەڕیدەو

تەدارەك ڕێك ئەخەم!.

ساواقە[6]

ساواقە

ساواق!.

ساواقی ساڵانەی بەهاری بێوڵەت

ساواقی بورجی "مارت".

---

[4] ئاویلكە: وەختی گیانداران.

[5] بێرێتە: سەمای بەكۆمەڵ.

[6] ساواق: سەرماو سۆڵەی سەختی دژوار.

PDF 4 KURD

**شەپۆڕی باهۆزە و شیوەنی گوڵانەو**

**تەدارەك ڕێك ئەخەم**

**تەدارەك: لە ئەسپی کەللە سەر گڕگرتوی ڕەوەندم**

**ئەو وەختەی ژان لەسەر بەرد ئەڕوێ.**

**تەدارەك لە حیلەی برووسکەی ئەم هەورە سوورانە**

**ئەو دەمەی کە باران شیعرێکی سەوزتر ئەنووسێ..**

**لە جوانووی ئەم خەمە بزێوە سپیانە**

**ئەو وەختەی کە لانکە و بنچك و**

**دەوەنیش غار ئەکەن.**

**تەدارەك لە تەختی کەژاوەی زریکەی فەریادی**

**ئەم هەموو فریشتە ڕەندانە**

**ئەو وەختەی خوا ئەوقەو**

**مردنیش سەرسامە!.**

**لەگوارە و پڵپڵەو سڵسڵەی زایەڵەم**

**ئەو دەمەی کە شایی گریانە.**

**تەدارەك لە تارای ئەم شیعرەو**

**گەردانەی ئەم تەمە**

**ئەو وەختەی کە مەرگم بووکمە و**

**کەژەهریش شاباشی جیهانە!.**

**ئێوارە.. دوای بانگی برینتان من ئەگەم.. ئێوارە.**

**ئێوارە.. دوای شێوی گریاوتان لاتانم.. ئێوارە.**

PDF 4 KURD

**که هاتم**

**مۆمێکم له قوللەی حەزرەتی "نالیی"دا بۆ هەڵکەن**

**با ملی داری بێ**

**یان پەنجەی نێرگزێ**

**یان قژی وەنەوشە.**

**زامێکم له دوندی "کەکۆن"[7]ی "حاجی"دا بۆ پێکەن**

**با سەری بڕڕاوی شیعرێ بێ**

**یان مەمکی "وەسانان"[8]**

**یان باڵای هەڵەبجە.**

**دوای بانگی برینتان من ئەگەم**

**که هاتم**

**له بەردەم دەروازەی هەناسەی ساردتانا**

**تاقێکم بۆ لێدەن**

**شیاوی شای خەم بێ و ئەم تاجی غوربەته**

**شیاوی ڕیشەکەی "خەندان"[9] و**

**شیاوی هەیبەتی "جەلادەت"[10].**

**تاقێکم بۆ لێدەن:**

**بەخونچەی ئەو هەموو فرمێسکەی هەتانه.**

**به گەڵای ئەو هەموو ئاخانەی لاتانه.**

---

[7] **کەکۆن: گردێکه له ڕۆژئاوای ڕاسته کۆیەی جاران.**

[8] **وەسانان: گوندی "شێخ وەسانان"ی هەرێمی هەولێر لەلایەن ڕژێمی عێراقەوه ژەهرباران کرا.**

[9] **خەندان: (شەریف پاشا سەعید خەندان) نوێنەری کورد له کۆنگرەی ئاشتی له پاریس ساڵی 1919ز.**

[10] **جەلادەت: جەلادەت بەدرخان و ڕۆژنامەنووس و ڕووناکبیری بەناوبانگی کورد.**

PDF 4 KURD

بەژاڵەی ئەو هەموو کسپانەی پێتانە.
تاقێکم بۆ لێدەن
بە نەخشی باڵندەی ئەو قوڕە سوورانەی هەتانە و
لە گڵکۆی ئازیزان بە ئاوی نێو نیگا شێلاتان.
تاقێکم بۆ لێدەن
بەخشتی ئازاری چوار گۆشەی
ئەو هەموو پرسانەی دای ئەنێن.
تاقێ بێ لە شێوەی مێزەری "مەولەوی"
تۆزێ قووچ.
تاقێ بێ وەك پشتی کۆماوەی
خەڵوەتی "مەولانە"[11]

تاکوو دێم، ئەو گوڵە سپیانە مەنێژن
بوەستن! بەلانکەی مێژوویان مەسپێرن
با لەسەر سەوزەگیای لەشی هەرد
لەسەر پشت پاڵکەون
با لەسەر باسکی ئاو ڕاکشێن.
با لەسەر شانی "با" هەڵکورمێن.
ئاسمانی چاویشیان دامەخەن
هیچ پەڵە هەورێکی سەرشاخیان

[11] مەولانە: "مەولانە خالیدی شارەزووریی نەقشبەندی" 1773–1826، ڕێبەرێکی گەورەی تەریقەتی نەقشبەندی لە کوردستاندا.

پیا مەدەن، هەتا دێم
مەیکەنە تارومار
خۆزگەمە بۆ دواجار
تەماشام بە پرژەی گوڵاویان تەڕ بکەم.
خۆزگەمە بۆ دواجار
شنەیان بگرمە باوەشم.
یەك بە یەك دەم خەمە ناو دەمی حەسرەتیان
ناکامیی سینەیان هەڵمژم
وەك دایك و
باران و
شەمامە
بۆنیان کەم.
یەك بە یەك دەست بێنم
بە تیشك و تیرێژی قژیانداو
موو بە موو ماچیان کەم.
تاکوو دێم، ئەو "مانگ"ە زەردانە مەنێژن
بوەستن! هەتاکوو تریفەی غەریبیی خۆم دێنم
ڕاوەستن! هەتاکوو ئەگەم و
خەرمانەی هەڵبەستم
ئەکەمە پشتێنی ناو قەدیان.
خۆزگەمە بۆ دواجار
دەست کەمە قەڵبەزەی گەردنی هەموویان



PDF 4 KURD

یەك بە یەك خەمانیان ڕاژەنم
یەك بە یەك بە بەژنی دار لیمۆی ژەهراویی
مارتیاندا هەڵژنێم
یەك بە یەك سەرخەمە ناو سنگ و بەرۆكی بەفرینیان
یەك بە یەك كرِنووشیان بۆ بەرم
یەك بە یەك فوو بكەم
بە كونی زامیاندا و
شمشاڵی باڵایان لێ بدەم:
(حەیران.. حەیرانە.. ئەوە "سەحەر"ە
ئەوە چاوی هەڵوەریوی سەحەرە.
ئەوە خەزانی باڵای سەحەرە.
ئەوە دەنكە ملوانكەی خەونەكانی سەحەرە.
ئەوە دەست و ئەوە پەنجە و ئەوە مەمكی
بەجێماوی سەحەرە.
ئەوە قیژەی ڕواوی سەحەرە
ئەوە خۆڵەمێشی ماڵە بابی سەحەرە
حەیران حەیرانەو
خەنە بەندانەو
ئامان ئامانەو
باڵا ڕێزانە..)

لا وەكە! تەماشا!

ئەم مێرگی غوربەتە ئازاری چەند سەوزە
چەند تەڕ و پاراوە ئالوزی[12] گوڵ گوڵیی
ئەم مێژووی وڵاتی حەسرەتە.
لا وەکە! بڕوانە!

دوندی ئاخ لە سینەی بوولێڵی ئێمەدا
هەڵکشاو، سەر بە گوڵ، چەند بەرزە
ئاوڕێ.. تەماشا!
سەقەمی[13] کۆچنامەی دڵداران
لە گیانی عاشقدا: گڕەیە.
گینگڵیان: ئارام و
وێڵ بوونیان: ڕێگەیە.
تەماشا! ڕیزە ژان
زنجیرە سەماکی[14] کۆتەڵمان
یەك بە یەك چۆن بەسەر پێدەشتی
سۆزماندا
ئەڕوانن!
بڕوانە! سووتانیان: سەمایە و فڕینەو
پەل و پۆی گریانیان: شۆڕابەی[15] بەستەیە.

---

[12] ئالوز: خەم، حەسرەت، ئەشکەنجە.
[13] سەقەم: تۆف و کڕێوەو سەرمای تووش.
[14] سەماك: ئێجگار بڵندو بەرز.
[15] شۆڕابە: لقی شۆڕی درەخت تازەوی.



PDF 4 KURD

ئەوەیان: فەنەری گەردنی "نالیی"یە لە شەوی
"بسفۆر"دا[16] ئەسووتێ و جەستەی ئاو ئاڵ ئەکات.
بە باڵای قەسیدە قوڵایی ئەپێوێ و لە بنی گێژاودا
چارۆگەی خەیاڵی هەڵئەدا. لە سامی گێژەندا و
لەوێدا بۆ ساتێ پەیتووکەی[17] گومانی ئەسرەوێ. لەوێدا
ئەم گەرای ڕەنگاڵە بۆ ماسیی باڵداری شیعری خۆی
دائەنێ. لەوێدا ئەم خەونی زەرد و سوور بە چاوی
خاکەوە ئەبینێ. ئەخنکێ و ناخنکێ و لەوێدا دەست ئەباو
مرواریی دڵی خوا دەردێنێ. ئەخنکێ و ناخنکێ و
لەوێدا ئەم تۆوی هەتاو و هۆنراوە ئەچێنێ. هەر خۆی و
گەمیەکەی. هەر خۆی و سەفەری ئاوی ڕەش.
هەر خۆی و سەوڵەکەی قەڵەمی و هەر خۆی و خەمی
گەش. پێشەنگە و پێش هۆرەی شەپۆلی بێ وڵات
کەوتووە. پێش وشەی سەرگەردان کەوتووە.
نامۆیی سەراپای تەڕ بووە.
بەلەمی بێ کەنار
تەنیایی ئەئاژوێ و
باخی ئاو
گوڵ قژی "حەبیبە"ی گرتووە.
بە پێلە[18] تینویەتی عەشقی ئەو، سەرئەکا!.

---

[16] بسفۆر: دەریای بسفۆڕ.
[17] پەیتووکە: چۆلەکەی بچووکی تیژباڵ و خێرا.
[18] بەپێل: شەپۆلدار.

بە شەوقە تاریکیی ڕێ و بانی وشەی ئەو، ڕێ ئەکا.
سەرپەڵە[19] پایزەی ئەم کۆچەی
ڕواوی سەر بەردی هەڵکەنراو
هەلاڵەی فرمێسکی گوێ "زەڵم"ەو
گۆرانیی بەفرێکی "شنروێ"ی[20] هەڵقرچاو.
ئاڤزینی[21] خولیاکەی ئەسپێکە سپی بۆر:
ئارامی: سمکۆڵەو
کورڕژنی: هێوریی و
دووریێتیی: نزیك و
قیبلەکەی: "خاك و خۆڵ"

"ئەستەموولٚ" ئەیبینێ و نازانێ چ گۆمێ
وا لە ژێر کلاوی ئەم پیاوە
ڕیش ڕەشە ڕێحانە و بەفرەدا.
هەموو ڕۆژ ئەیبینێ و نازانێ
چ بێشەو نزارێ وان لەناو
دەربەندی ئەو سینە تەنگەدا.
کۆتریی سەر قوببە و منارە ئەیبینن نازانن
چ باڵی فڕینێ وا لە ناو ئاسمانی

---

(19) سەرپەڵە: وەختی بارانی پاییزە.
(20) شنروێ: چیای شنروێ، ئەکەوێتە باکووری شاری هەڵەبجەوە.
(21) ئاڤزین: بڵندایی نێرینەی ئاو.

ئەو گیانە شینەدا.
کەلەپۆی[22] خۆرنشین ئەیبینێ و نازانێ
چ پشکۆ و ژیلەمۆ و ئاگرێ وان لەناو
ئاتەشگەی ئەم شیعرە ئاوارە و وێڵەدا.
باران و ڕەهێڵە ئەیگاتێ و نازانێ،
چ ناڵەو چ ژان و ژمژیە[23] و گرمەیەك
وان لەناو ئەو هەوری دەروونە قووڵەدا
هەژاران ئەیبینن نازانن
چ نووزەی نانێك و چ لاڵەی ئاوێك و
چ سەرمای تەمەنێ وان لە ناو
کوختەکەی هەناوی
ئەم مامە پیرەدا!.
عاشقان بەلایدا ئەڕۆن و نازانن
چ لەنجەی خەمێك و
چ کانیی نیگایەك
وان لەناو کازیوەی ئەو چاوە تیژەدا
ئەوەیشیان: "مەولانە"ی هەتاوی نیوەڕۆی شەوانە.
تاڤگەی بێ دەنگی دڵی خوا و کۆڵ کێشی گریانە.
بە هاوین بارانی "هیندستان" لە چاویا دائەکاو، بە زستان
لە ڕۆحیا قرچە قرچ "شارەزوور" سووتانە. هەموو ڕۆژ

---

[22] کەلەپۆ: ئەو کەلەی خۆری لێ ئاوا ئەبێ.
[23] ژمژیە: جوڵان و بزوتنەوە.

شەبەقیی "بەرەدا"ی[24] موریدی کاکۆڵ سەوز،
بە دزیی منارەی ئەمەوییی شامەوە، لە دەفری[25]
سۆزێکدا شەپۆلی نوورێکی یەزدانیی هەڵ ئەگرێ و
ئەیبا بۆ: "سیروان"ی مەولانە.
شەوانە، شۆڕەبی کەناری گۆمی خواو
ڕۆژانە، نانێکی ناوچەوان سوتاوی ڕەنج دانە.
ئەم.. بەڕووی شاخێکە هەموو ڕۆژ بەپێی خۆی
ئەچێتە ناو ژووری پەنگر و کڵپەوە
هەتاکوو بسووتێ و هەڵقرچێ
پڕوپۆی[26] "وەجد"ەکەی چڕترە.
ئەم.. کێوی بەفرێکە خۆی بۆ خۆی
ئەچێتە بەردەمی خۆری هەق
هەتاکوو دڵۆپی توانەوەی زۆرتربێ
ئەستێرکی ئەوینی ئاسمانی پڕترە.
شەوانە، تا دۆزەخ بۆ لەشی دابخاو
بپڕوکێ و هەڵوەرێ و دووکەڵ کات
ڕۆژانە، بەرچاوی ئەم زامە ڕوونتر و
بەهەشتی گیانی ئەم شەنگترە.
"مەولانە"ی سەمەندەر[27]

---

[24] بەرەدا: ڕووباری بەرەدای شام.
[25] دەفر: قاپ، حاجەت.
[26] پڕۆپۆ: لقوپۆپ.
[27] سەمەندەر: باڵندەی ئەفسانەیی.

PDF 4 KURD

ئەو قوڕەی لە مشکیی لەشی خۆی
بەردەوام ئەیشێلێ
هەموو ڕۆژ ئەیکاتە گوڵدانێ
بۆ گوڵی عەشقی خوا و
لەتاقی پرشنگی ژوور سەردا دای ئەنێ.

(سێ وتەی پیرۆزی نێو ڕۆژژمێرێکی نەبینراوی "مەولانە")

**یەکەم:**

عاشقێ خرایە ئاگرەوە
بەڵام تا
گیانی پاك گەیشتە ئاسمان و دڵی خوا
ئەو بە ژێی بڵێسە بەردەوام
هەر "تار"ی ئەوینی لێ ئەدا!.

**دووەم:**

ئەتوانیت ڕوانینت بڕوێنی و سەوزیش بێ
بەو مەرجەی کە درەخت
ببێتە دڵدارت!.

**سێیەم:**

دەرچوونم بۆ نەبوو
عەشقی تۆ دەوری دام
من ئیستا لە نەخشەی تازەتا
دوورگەی تۆم!.

ئەوەیشیان: "حاجی" یەکەی درەختی زەنگ بە دەست.
شمشاڵی لالێوی مێژووی شاخ. شەوو ڕۆژ بە گوڵە
حاجیلەی، دیدەی خۆی، گلۆنکەی کوڵوانەی
یادێکی نارنجی بۆ "کۆیە" ئەچنێ و باڕژنی کاژۆڵەی
موو ڕەشی خەمیشی هەر لەلای "کەکۆن" و لە دەوری
ڕەشماڵە. ئەم: شیعری کردووە بە: هەتوان.
بە: کلیل. بە: خەنجەر. هونەری کردووە،
بە: دەغلێ و بە: بانگدان.
ئەم.. وشەو گوڵاو و هاوار و گزنگی ئاوێتەی
یەکتری کردووە. کردوونی بە شتێ نەبینراو. نەبیستراو.
بۆن نەکراو.
ئەم.. شیعری کردۆتە پڵنگ و لەم بێشەی ترسەدا،
بە چڕنووك لە قەدی تاریکیی ئەنووسێ.
ئەوەتا نیشتمان لە چاویا بریسکەی دڵۆپی
ئەلف و بێی بێ ئەنوا[28] و بێ ماڵە.
نیشتمان لە "سەر"یا هەر بەردە مۆرەکەی،
گیرفانی شوانێکی عاشقی "خەجێ"یە. نیشتمان
لە دەنگیا خوێندنی کەوێك و تریقەی دوو کیژی
دیلانێی مابێنی دوو داری ناو دێیە.
نیشتمان لە گوێیدا زرنگەی پاوانەی

---

[28] بێ ئەنوا: بێ جێگا، بێ دەرەتان.

**جوانێکی ئەوێیە!.**
**بە بەردە ئەستیەکەی سەری خۆی هەموو شەو**
**لە هۆدەی گریاودا، یادێکی پەمەیی و شیعرێکی**
**زەردی خۆی پێکەوە هەڵئەکات. ئاوی چاو**
**وەك ئاوی شەربەکەی "حیجاز"ی، ژەکێکە**
**هەموو ڕۆژ غەریبیی ئەینۆشێ. ڕۆژانە لە حیجاز**
**هەڵمێکە و شەوانە لە وڵات گۆمێکە و ئەیبەستێ.**

**لەوێڕا گەر سەری بەردێکی**
**"چنارۆك" بشکێنن،**
**لێرەڕا ئەم دەستی کسپەیەك**
**هەڵئەبڕێ بۆ سەری.**
**لەوێڕا گەر چەوێ لە بینی کانییەك بگیرێ**
**لێرەڕا ئەم شیعری قرخەیەك ئەکات و**
**دەست ئەبا بۆ قوڕگی.**
**لەوێڕا گەر بەچکە ئاوازێ هەڵفڕێ**
**لێرەڕا ئەم ئەبێ بە ئاسمان.**
**لەوێڕا گەر ئەوین**
**سەعاتی ژوانی دیاری کرد**
**لێرەڕا ئەم ئەبێ**
**بەدار و سێبەر و پەناگەی جێ ژوان.**
**لەوساوە، ئەوەتەی کە ڕیشی پەپوولە پایزەی**

PDF 4 KURD

لەبنە توترکی غەریببی ئالآوە
ئەوەتەی ئەستەموولٚ نسێیە و هەتاوی نیشتمان
لەم شیعرەی نەداوە،
ئەوەتەی شەپۆلی ئەم ئاوە باڵ شینە فڕیوە
باخەکان بە دوایدا ئەگەڕێن.
ئەوەتەی ئەم هەورە ڕۆیشتووە
شاخەکان بە دوایدا ئەگەڕێن.
ئەوەتەی ئەم "هەیبەت سوڵتان"ە[29] کۆچەرە
کوردستان شپرزە و چاو لەڕێ و هەر ئەڵێ،
ئاخۆ کەی ئەم خۆرەم دێتەوە؟!

(پەندە شیعرێکی بڵاونەکراوەی "حاجی" وەختی خۆی
لە ئەستەموولٚ لە پیرە بەردێکی ڕیش سەوزم وەرگرت)

ئەم بەردە گەر بازووی ئەوەندە ئەستوور و
دڵیشی ئەوەندە سەخت و ڕەق نەبوایە
تا ئیستا ڕەشەبا هەزار جار تلاوتل بردبووی.
ئەو بەردەیش گەر دڵی زۆر ناسك نەبوایە
ئاخر چۆن بە تۆوی دەم "با"یەك
ئەقڵیشا سەرسنگی؟!

[29] هەیبەت سوڵتان: ڕیزە چیایەکە لە ڕۆژهەڵاتی شاری کۆیە.

## II

به تیری عەشقی بەرد
زامدارە و گرفتار
ئەم مێژووە عاشقەم.
بۆ خاتری چاوی بەرد
هەموو جار خۆرنشین ئەپۆشێ و
بەکەوڵی سوورەوە
ئەگاتە بەردەمی قاپیی مەرگ.

لەخێڵی ئاوەوە پشتاو پشت
زاووزێی ئەم نەوەی ڕووبارە و چەمانە
هاتوون و، تا سەر من، تا ئیستەیش
تینویەتی سەرچاوەی عەشقیانە.
ئەز چیتان بۆ باسکەم؟
کام خوێنتان بۆ باسکەم؟
کام ئاختان نیشاندەم؟
لە کوێوە بێمە ناو زریکەو قیژەوە؟
لە ڕیزی وەریندا لە پێشدا چ ڕەنگێ پێش بخەم؟
لەم چرای دەنگانە لە پێشدا چ دەنگێ هەڵبکەم؟

درێژە دووکەڵی ئەم بێشە غەمناکە
وەك بەژنی نەخشەکەم.
درێژە فرمێسکی ئەم شاخ و داخانە



PDF 4 KURD

لە دیجلە و فوراتیش درێژتر.
درێژە کرووزەی پەلکە گیا
تا چاوی برینم بڕ ئەکا.
درێژە هاواری کۆڵان و شەقامی ئەم لەشە
تا لای خوا.
درێژە ئازاری ئەلف و بێم
لێرەوە هەتاکوو لای "خانیی".
درێژە، درێژە، درێژە.. غەریبیم
لە هێڵی ئاسنی ئەوروپا درێژتر.
نازانم ئەز چیتان بۆ باسکەم؟
نازانم ئەزچیتان
نازانم ئەز
نازانم
نا.

وا دیسان خەنجەرە و بە "با"وە ئەبارێ.
ڕەهێڵەی نەشتەرە.
شادەمار لە ملی ئەم کێوە زلەدا
کون بووەو خوێن لەبەر
ئەشکەوتی برینی بەرد ئەڕوا.
وا دیسان چەقۆیە و بە "با"وە ئەبارێ
"با" سەرم ئەبات و



PDF 4 KURD

گیانیشم بە دوایدا ئەگەڕێ.
-پێویست بوو، شاخ بێتە، دەشتایی گیانتەوە.
پێویست بوو کلاوی هەوری ئەو لە سەرکەیت.
ئەبوایە تان و پۆی پەنجەی تۆ و لاسکی گژوگیا و
فەقیانەی دایکت و تەناف سێدارە تێك ئالێن.
پێویست بوو بە قەڵەم سەنگەریش لە شیعرا هەڵکەنی.
ئەبوایە خوێ و برین وەك عەشقی وەلی و شەم،
وەك سەری مەسیح و تاجی دڕك، پێکەوە ڕابێنێ.
پێویست بوو ئەو کاتەی شڵپەی خوێن لە ڕۆخی
لەشەوە، ئەگەیشتە گوێی مێژوو، لەو زەریا
سوورەدا، ئەبوایە چارۆگەی بەلەمی دەنگی خۆت
هەڵبکەی. چی ئەکەی؟ ئەو کاتەی کە مردن
سەربازی دەوڵەت بێ و تۆیش لە کێو، درەختی
قەڵەم بی؟ چی ئەکەی ئەو وەختەی کە شانۆت
پەنگربێ و گوێ گرت تفەنگ بێ؟
ـ هەر ئەبوو، وابکەی، هۆنراوە
بە نووکی بڵێسە بنووسی و
دۆزەخیش بۆ ترس و بێ دەنگیت دابخەی!
ـ بەردەوام هەر تەورە و بە "با"وە ئەبارێ.
بەردەوام لافاوی شمشێرە و هێرشی بیابان.

★

ـ ئەمە پرچی بەجێماوی قەسیدەیە؟

PDF 4 KURD

یان کاکۆڵی خەونی گوندێ؟
ئەمە ئاوێنەی شکاوی هەتاوێکە
یان هی کچێ؟
ئەی ئەم ڕووبارە کوژراوە
یاری دەشت بوو یان هی کوڕێ؟
ئەی ئەم قیژە هەڵوەریوە
قیژەی دایکمە یان درەختێ؟
ئەی ئەمەیان گۆی مەمکە یان دەنکە گێلاس؟
ئەمە پشیلەی سووتاوە یان ساواکەم؟
ئەی ئەمەیان سەری باوکمە یان گولبێنەی تەندوورەکە؟
ئەمانە باڵی وەریووی پەریەکانن یان کۆترەکان؟
ئەی ئەمانە گلێنەمن یان دەنکە زەیتوون و ترێ؟
نازانم ئەز چۆنیان لە یەکتر جیاوەکەم؟
نازانم ئەز چۆنیان لە یەکتر
نازانم ئەز چۆنیان..
نازانم ئەز..
نازانم..
نا..

★

ـ وا مێژوو جۆلانەی شەهیدە.
هەموو شەو بە هێشوو "مانگ"ی سەوز
لە بەفری ناو سەرتا هەڵدێن و

PDF 4 KURD

له پڕیش لەو دیوی گوڵاڵەی خەونەوە
ون ئەبن.
ون ئەبن بۆ ئەوەی بێنەوە
وێڵ ئەبن بۆ ئەوەی بگەنە دڵی خواو
لەوێدا بڕوێن و بشنەوێن.

-هەموو ڕۆژ چاوێکم ئەکشێ.
هەموو ڕۆژ دەستێکم کۆچ ئەکا و جێم دێڵێ.
هەموو شەو من عەردی خەمێکی بەیارم و
ڕۆژانەیش تینویەتی شەهیدێ ئەمکێڵێ.

هاتووم "با" فێرم کات،
چۆن ڕووبار ڕاژەنم.
هاتووم بەرد فێرم کات
لەسەر ئەو چۆن بڕوێم.
هاتووم ڕەگ فێرم کات
لەکوێوە بگەمە دڵی خاك.
هاتووم گوڵ فێرم کات
شیعر چۆن جوان ئەبێ.
هاتووم مەل فێرم کات
تەماشام چۆن بفڕێ؟
من هاتووم بۆ ئەوەی ئەم ئاگرە گەورەیەی

PDF 4 KURD

ئەوینی نیشتمان تێم بەربێ.
من لێرە، لەناو ئەم، ئەوینە چڕەدا
دڵنیام وەك ڕاستیی.
من لێرە، لەناو ئەم، دەربەندی دووکەڵ و ترسەدا
ئاسوودەم وەك سەمای ئازادیی.

هەموو جار بێ ئەوەی لە دەرگای وشەم بات
هەورێ دێ
خۆی ئەکا بە ژوورما و گۆرانیی قژ تەڕم بۆ دێنێ
بێ ژوان
بەبێ پرس
هەموو ڕۆژ
شەپۆلێ، دووان و سیان،
بە هەگبەی پرشنگ و گوڵەوە
ئەگەنە سێبەری بەرگێلەم[30]
نارۆن تا من نەکەن بە مێرگی هۆنراوەو
بە گۆمی ئەستێرەیش ژوورەکەم.
دار بەڕوو دێ بۆ لام
ڕەگی خۆی ئەبەستێ بە ڕەگی قاچمەوە.
گابەرد دێ و هێزی خۆی
بەدیاریی بۆ پشتم ئەهێنێ.

---

[30] بەرگێلە: هەیوانی بەردەم شاخ و ڕەوەزو ئەشکەوت.

PDF 4 KURD

لوتکە دێ و باڵای خۆی
ئەخاتە سەر باڵام.
ئاشنامن فرمێسکە پایزەی غەریبان
ئەوانیش بە سواری کزەبای
ئێواران دێن بۆ لام.

لێرەم و بای خەونم
زەمانێ تۆو ئەکات
کە هێشتا زەمینی لەدایك نەبووە.
لێرەم و ڕوانینم
کەناری دوا ڕۆژێ سەوز ئەکات
کە هێشتا بارانی لەدایك نەبووە.
ئەم خەونە
پەنجەرەی ئایندەی مێژووە.
من چاوم:
پێش تیشکی ئەمڕۆکە و
بیستنم:
پێش دەنگی ئیستاکە کەوتووە.
دۆزەخی ئەندێشەم
گوڵی وای تیا ئەڕوێ
کە هێشتا ئەم عەردە
بە چاوان نەیدیوە.

PDF 4 KURD

من دیدەی پێغەمبەر
ئەوەتا لە دیدەی هەڵبەستما
هەر بۆیە نەهێنیی دڵی خوا و
گەردوونم بینیوە!
-شاخ لە شاخێتیی ئەکەوێ
ئەگەر ڕەنگێك دابینیکاو
یان بە زریانێك بسرەوێ.
ئاو لە ئاوێتیی ئەکەوێ
گەر گێژەنێ دابینیکاو
یان بە گەرداوێك بسرەوێ.
دار لە دارێتیی ئەکەوێ
ئەگەر وەرزێ دابینیکا و
یان بە بارانێك بسرەوێ
من ئەو هەڵبەستەم خۆش ئەوێ
نە قۆناغێك
نەسنوورێك
نەجێگەیەك
خەونەکانی دابین نەکاو
ئازاریشی قەت نەسرەوێ!.

ـ ئەی "شاخ"م!
ئەی پەندی بەردینیی پێشینان!

ئەی ملی پڵنگی بە خوێنم خەت خەت و
بە عیشقم داگیرساو!
داستانی سروشتی هەموو کات
بەرامبەر ژوورەکەم خرۆشاو.
لێرەم و ئەمەوێ وەك ڕکت[31]
تێکەڵی بناری مێژووت و ناو هەستی جۆشخواردووی
بەندەن و بەردت بم.
لێرەم و ئەمەوێ وەکو "با"ی یاخی بووت
بمخەیتە سەرشانی ڕەوەزت و، وەك پەلکی
درەختی هیوایشت بمدەیتە دەست هەتاو!.
قوتابی ئاسۆتم
هەمیشە خوێندنەوەی فەرهەنگی
گژوگیای سینەی تۆم
کردووە بە ڕێگا بۆ چاوم.
ئەشکەوتت بە ژووری خوێندنی کێویم و
لوتکەیشت بە وانە و مامۆستام.
ئەمجارە من لەبەر نەینووکی[32] ئاگرت و دیواری دووکەڵتا
زێی زریان ئەنووسم نەك شیعر
ئەمجارە من لەبەر ڕەهێڵەی ئەستێرەی کوژراو و
بارێزەی پشکۆتا

---

[31] ڕك: ڕەگ، بنج، دەماری شاخ.
[32] نەینوك: ئاوێنە.



PDF 4 KURD

**مەرگی سوور بە خوێنی گابەرد و کاوانت ئەنووسم**
**نەك چیرۆك.**
**ئەم وەرزە من سەرم کارێزی مەراقی**
**چەند سەدەی گیراوە و ئەتەقێ.**
**گەردنم فوارەیە، فوارەی "با"ی ڕەنگاوڕەنگ**
**فوارەی خۆڵ، فوارەی نوێی زایەڵە**
**هی زوڵمی شەیتان و فریشتە و، فوارەیەك**
**بە بەرزی باڵای خوایش**
**لووزەوی[33] هاواری هەڵبچێ!.**
**هەر لێرەم. دەمێك بوو ئەو گوندە**
**تا پشت مل قوڕاویی و کوڵنجە شڕانە.**
**ئەو خەمە دەست و پل زبرانەی وڵاتم**
**بازۆڵەی ئازادیی و، بۆ هەزار، هەزاران**
**سروودی ڕاکردووی شەقامی شارانم لانکەبوون.**
**دەمێك بوو چۆڕچووڕەی ئارەقی لاملی**
**گەنم و جۆی ماندوویان**
**بۆ ڕێچکە ئەستێرەی سەر هەوراز، دەوران دەور،**
**بۆ ڕەوە برینی خۆ خۆریش، ئەوان هەر**
**نیگایان پلوسکی بەفراوی کاوان و**
**ئارامییان کاسە دۆی ئەوینی سەر ڕێ بوو.**
**دەوران دەور، دەمێك بوو، ئەوانە هەر هەڵمی**

---

[33] بەلووزەو: بەهوروژم. بە گوڕو پڕولێشاو.

PDF 4 KURD

گولاوی ڕەنج بوون و ژەم بە ژەم؛
لە گونکی هەژاریی خۆیانیان بۆ کردین بە نان و
لە شەوی کون کونی خۆیانیان پیاداین و
بەڕیزە درەختی بالایان سێبەریان بۆ کردین.
ئەو گوندە دەم و چاو خۆڵاویی و پێپەتی و ڕووتانە
باوەشیان کادان بوو
قسەیان باسووق و
منداڵیان ڕێواس و
گەورەیان پەل و پۆی دار شاتووی ناو دێ بوون.
دەوران دەور
ئەوانە هەر پرمەی ئێستری سەر پلەی
ژێر باری تفەنگی ئێمە بوون.
دەوران دەور
ئەوان هەر: هێلکە بوون، کەشکبوون.
پێوازبوون بۆ ژیان
ئەوان هەر: خرخاڵ و بازن بوون بۆ شیعر و
چیرۆك بوون بۆ کوانووی نیشتمان!.

*

دەریاچەی ڕۆژگاری سەردەمێ
وەك سەرمان لیخن بوو.
سیاسەت: گایەکی بەلەسەی چاو سووری تووڕەبوو
هەمووومان —مێژوو-مان بە کەللە و قۆچیەوە بەستبوو.

زریکەی کەروێشکی شیعرمان لە بێشەی تفەنگدا
وەك خوێنمان لە چڕیی تاوان و تۆڵەدا ون ئەبوو.
ڕێگەکان هەر خۆیان
پردی سەر خۆیان و
قۆناغی بەردەمیان سەربڕی!
سەرچاوە:
ڕووباری
خۆی ڕاوکرد.
دارستان:
داری خۆی
بە پەنگ کردا!.
دیواری نەفرەت بووین لە کینەی خم خۆرکدا[34]
ڕۆ ئەچووین
گوڵ گوڵی ئەکوشت و
شاخ شاخی ئەکوشت و
هەموویشمان لەوێ بووین!.
ـ لە بیرتە؟ ئەو ساڵە نەزۆکە
بە بزنە ڕێیەکی بێ ئاوی نیوەڕۆی هاویندا ئەڕۆیشتی
تفەنگی سەرشانت سێبەری تینویەتی و
تابووتی مەرگێکی گەڕۆك بوو.
بۆ ئێوە، بۆ ئەوان، هەمووشت تارمایی

[34] خم خۆرك: زەوی قووتدەر.

PDF 4 KURD

ترسێکی هەمیشە ئامادەی درێژ و، بەرین بوو.
داروبەرد، ئاژەڵ و باڵدار  و، هەتاکوو
بریسکەی چاوانی پشیلەیش لە شەودا، بۆ هەموو،
نیشانەی بانگدانی مردن و نێو فاقەی کەمین بوو.
بەشاخی ماندوودا داگەڕای.

چوویتە ناو برینی گوندەوە:
ئەو، کە هات دار هەرمێی سەرتاپا ڕەشپۆش بوو.
ئەو، بۆنی مەرگێکی زۆر تازەی لێ ئەهات.
ژنێ بوو لە مێژووی زامداری شاخ ئەچوو.
ئەو، سەری مێردەکەی لە سنگیا نیشاندای
ئەو، شیری گریاوی ساواکەی بۆ هێنای
پێی وتی:
ـ بۆ هاتووی؟
چی ماوە تا بۆی بێن؟ بێژنگی لاشەمان؟!
یان نانی خوێناویی؟!
چی ماوە بۆ هاتووی؟!
تفەنگتان بۆ خۆتان!
شۆڕشتان بۆ خۆتان!
کوردستان بۆ خۆتان!!
چی ماوە بۆ هاتووی؟!
شەڵاڵی شەرمێکی گەرم بووی. ئەو وەختەی وەرچەرخای

مردبووی!، بە هەمان بزنە ڕێی تینوودا
بە هەمان سەرشاخی ماندوودا سەرکەوتی
لە ملەی پێشتەوە
باگژەی[35]، ڕڤاوی، بە هەڵپەی تەپ و تۆز هەڵیکرد
تەندوورەی گەردەلوول گەیشتە بەردەمت و
تیا ون بووی!.

★

هەر لێرەیش بوولێڵی[36] دوێنێ بوو
من خۆم دیم "بە پەلە مێژوو هات، بە خۆی و
چەند ڕەوە ئەسپەوە —وەك بڵێی ساڵێکی
ون بووبێ و بە دوایدا بگەڕێ —من خۆم دیم
پەشۆکاو. داستان هات، بە خۆی و چەند ڕەوە برووسکە و
هەورەوە- وەك بڵێی هەواڵی کوژرانی "ئەنکیدۆ"
یان کاوەی بیستبێ. ئەو وەختەی خۆیان کرد بە دەرگای
زیوینی دەربەندا، هەر هەموو ئەسپەکان، سوارەکان،
سەرتاپا هەڵمێکی زەرکەفتیی لە لەشیان هەڵ ئەستا.
چیایان شڵەژان، درەخت و تاڤگە و ڕووباریان سەرسام کرد.
تاریکی نزاریان شڵەقان. سوارەکان: ڕم بوون و،
تا ناو قەد تلەتڵ[37] ئەسووتان، بەگوێی خۆم گوێم لێبوو،

---

[35] باگژە: نێوان ڕەشەباو کزەبا.
[36] بولێڵ: سەرەتای شەو. تاریکایی دوای ئێوارە.
[37] تلەتڵ: گڕو بڵێسەی ئاگر.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

لوتکەکان بەیەك دەنگ بانگیان کرد "وا شێخ هات".[38]
ئەم چرا یاخیانە، سەروپڕیش پرشنگی ئاڵۆزکاو، بازوویان
ڕووبار و تەوێڵیان ئاوێنەی بناری بەرهەتاو.
خۆم بینیم بەم هەردوو چاوانە: لە دەفەی شانیاندا
قوڵە قوڵ ئازادیی هەڵئەقوڵیی، خۆم بینیم: لە وەردو
نواڵەی سنگیاندا گوڵاڵە ڕواوە، خۆم بینیم بەم هەردوو
چاوانە: هەریەکە و ڕۆحی خۆی کردووە بە چەپك و،
چەپکیشیان هەر لەسەر قەڵپۆزی زینەکان داناوە.
خۆم بینیم: هەر یەکە و دوا قومی مەتارەی سوێندێکی
قرمزیی لەگەڵ خۆی هێناوە.
ئەسپەکان: ڕەنگاوڕەنگ سپی و ڕەش، بۆر سپی،
قاوەیی، ئەسپێکیان باڵدار بوو ڕەنگی شین.
گۆمێ بوو ئەیحیلان. ئەم ئەسپە شینەیان،
کە باڵی لێك ئەدا بە جارێ ڕەوە ئەسپ کوڕژنیان ئەکرد و
ڕەوەزیش ئەکەوتنە سمکۆڵان. ئەو وەختەی باڵیشی
جووت ئەکرد، زریانیش وەك شەختە ئەمەیی.
پێشوازیی لەشکری باوبۆران، پێشوازیی ئەم خێڵی
ئاگر و کڵپەیە، تا درەنگ خایاندی، نیوەشەو لە بەردەم
ئەشکەوتی (جاسەنە)[39] دابەزین. جڵەوی شۆڕشمان
لێگرتن. ماچ. گوڵ و پەپوولە و گەنم بوون ئەبارین.

---

[38] واشێخ هات: مەبەست شێخ مەحمودی نەمرە.

[39] جاسەنە: گوندی جاسەنەو ئەشکەوتی جاسەنە لە ناوچەی سورداشی سەر هەرێمی سلێمانی.

هەردوولا وەك دوو چەم تێكەڵ بووین. هەموومان
هەر هەمان دەم و چاو. هەمووومان ناومان (لاس)
هەمووومان هەر بە شوێن گوڵەكەی خەزاڵدا ئەگەڕاین.
زەمانمان گۆڕیەوە هەریەك بووین،
خەفەتمان گۆڕیەوەو هەریەك بووین.
هەر تەنها پۆشاكی برینمان یەك نەبوو.
لەو هەراو زۆنگەدا، خولیام بوو، من "حیلمی"[40] ببینم.
پرسم كرد. شیعرێ هات: ستونیی، ئاماژەی بۆ كردم
دوور بە دوور كەپرەكەی نیشاندام. چووم بۆ لای،
كە من چووم خەریكی نووسینی هاواری ئازارو خەمێكی
درێژبوو، بۆ یەكەم لاپەڕەی "بانگی هەق"،[41] دانیشتم.
خەمەكەی دامە دەست، لێم وەرگرت، سەیرم كرد
هەر هەمان هاوارە، هەر هەمان ئازارە، كە ئێمەیش
هەر ئەمڕۆ دابوومان بە ڕادیۆی ئەم شاخە —ئازاری
لای ئێمە كوردیەكەی پەتی تر نووسیبوو-. پاش تۆزێ
بردمی چاپخانەی ئاوات و برینی نیشاندام. كە بینیم
پێكەنیم —چاپەكە پیرێ بوو دەست شكاو پەككەوتە.

من پێم وت:
مامۆستا! ببورە لای ئێمەیش

---

[40] حیلمی: ڕەفیق حیلمی، ڕووناكبیرو مێژوونوسی سیاسی ناوداری كورد.

[41] بانگی هەق: ڕۆژنامەی (بانگی هەق)ی شۆڕشی شێخ مەحمودی نەمر. ماوەیەك ئەم ڕۆژنامەیە لە ئەشكەوتی جاسەنە دەرئەكرا.



PDF 4 KURD

هەر هەمان ئاوات و برینە
ئەوەندە، چاپەکەی لای ئێمە تازەیە و
ڕەنگاوڕەنگ ئۆفسێتە!!

★

ئەمە چ کۆڕی سۆزێکی دەروێشانی گڵ و ئاوە
دەڤ سەرم لێ ئەدەن و
ئەمکەن بە تەکیەی ئەم عەشقە هەڵقرچاوە.
ئەمە چ باوبۆرانی ساڵێکی شێتگیرە وا
ڕۆژگاری خۆی تێك ئەشکێنێ و شمشێر ئەدا
لە گەردنی ئەم هەتاوە!

ـ من قووڵیت بە ڕەگم ئەپێوم
بۆیە وا هەموو جار
ئەگەمە ناو ناخت و
هەوێنی مێژووت و
ئەڵماسی ناسۆرت دەردێنم.
من بەرزیت بە کڵپەم ئەپێوم
بۆیە وا هەموو جار
ئەگەمە لوتکەت و
چاوی خۆم لەو باخی بەفرەدا ئەڕوێنم.
شیعر و من عاشقەو ماشقەی
لەیەکتر ئاڵاوی قەدی تۆین.

PDF 4 KURD

دوو گوڵە ئەستێرەین

هەردووکمان هەر لەسەر بەرماڵی یەك ئەوین

بەرماڵی یەك ئاسۆ

بەرماڵی یەك هەور

ئەم نوێژە بارانە پیرۆزەت بۆ ئەکەین.

تەورێ هات، تەورێ ڕۆی

بەڵام تۆ هەر سامی ئەم مێژووە چڕە بوویت.

مەرگێ هات، مەرگێ ڕۆی

بەڵام تۆ هەر هاژە و هەر لرفەی

ئەم ئاو و ئاگرە بووی.

ئەم سۆزەی تۆ ئاوە.

ئەم دەنگەی تۆ ڕەگە.

ئەم عەشقەی تۆ بەردە!.

ـ ئەو وەرزەی لەوێ بووی تێکەڵی بەرد بووبووی.

چووبوویتە بینایی خاکەوە

بە عیشقا ڕۆچووبووی.

ئەو وەختە پەنجەت و گۆپکەی دار یەك شت بوون.

تاڵە مووی کاکۆڵت و گژوگیا یەك شت بوون.

ئەو وەختەی تۆ لەناو هەناوی چیادا

بنج بوویت و ئەتنووسی،

سکڵ بووی ئەتنووسی،

ئەو دەمە کارێز و شیعری تۆ یەك شت بوون.
گڕکان و ناخی تۆ یەك شت بوون.
ئەو وەختەی کە وڵات، بە تەنها
سەرینی بەردێکی ژێر سەری عەشقت بوو،
شینایی ئارام و سەوزایی ئەم هەموو دنیایە
لەو قولکەی چیایە
لە دەنگتا ڕوابوون.
ئەو دەمە تۆ گیانت دەریاچەو
ئەوانیش دار شیعری سەرچۆپی و سەما بوون.

ـ ئەو وەرزە من تاجی گوڵ هێرۆی
هۆنراوەی سپی خۆم.
کردە سەر چەند خوێنی بە شەوقی
ئەم شاخ و داخانە
"مەبەستم خوێنێکە
سەرچاوەی ئەوینمان یەك بووبێ"
ئەو وەرزە.. من ساتێ هەڵمەتی ئەو خوێنەم بینیوەو هیچی تر.
ئەو وەرزە.. من ساتێ سووربوونی ئەم بەفری ناو دڵەم بینیوە و هیچی تر
ئەو وەرزە.. من ساتێ ئەوینی ئەو خەڵکە و ئەو خوێنەم بینیوە هیچی تر
وەك (شاملو) بۆ (روزبە)[42] خولیامە

[42] روزبە: تێکۆشەر و شەهیدی ناسراوی ئێرانی. (شاملوو) ئەحمەدی شاملوو، شاعیری بەناوبانگ. کە روزبە شەهیداکرا، شاملو شیعرێکی بۆ نووسی و بەڵام لەو ساڵانەی دواییدا وەختێ زانرا روزبە بەدەستی خۆی یەکێك لە هاوڕێکانی خۆی کوشتووە، ئەوسا شاملو لە شیعرەکەی خۆی پاشگەز بۆوە.



PDF 4 KURD

که ڕۆژێ، ئیستاکە، سبەینێ، هەتاوی حەقیقەت
گومانی تەماویی توانەوە
لەسەر کێو بۆی نووسین
"کە خوێنێ لەوانە پیاو کوژی خوێنێکی عاشقی تر بووە"
لەسەرم مەوەستن، دوودڵ نیم ئەوساکە
ئەو تاجەی داگرن و هەر لەگەڵ هەڵبەستما بینێژن!.

ـ لە نێوان وشەی تۆ و کانیدا جودایی نەماوە.
لەنێوان قەڵەمت و لاسکدا جودایی نەماوە.
لەنێوان دەروونت و ئاگرا جودایی نەماوە.
لەنێوان نەفەست و هەوادا جودایی نەماوە.
تۆ ئیستە، کەنیسمەی، سەرتاشە بەردێکی مێژوویت و
بە خوێندن بەژنی "با" سوور ئەکەیت. تۆ بەباڵ
ئەبینی و بە چاوت کیشوەری ئەم سۆزە تەی ئەکەیت
کە گەلاَ بکوژرێ ناتوانی دەنووکت کلیل بەی.
تۆ ملت ژێی خاکە و دەستی ئاو ئەتژەنێ.
کە ئاوێك کوێر بکرێ ناتوانی پەنجەرەی شەتاوت
دابخەی. تۆ یالّی ئەم ئەسپی کەژانەی. کە جوانووی
شەماڵێك سەربڕن ناتوانی قەت حیلەی سنجرت[43]
خەفەکەی.

دە هەگبەی بارانی هۆنراوەت بکە شان!

[43] سنجرت: بلێسەی ئاگر.

PDF 4 KURD

لە ڕێگەی گوڵەوە بچۆرە ناو خێڵی
ڕووناکی و دەستکەرە گەردنی دارستان.
دە هەگبەی گۆرانی و گولاڵەت هەڵگرەو
لە ڕێگەی ئاوەوە بچۆرە ناو دەنگی
خەڵکەوەو سەربدە لە وەرزی سووتان و هەڵقرچان.

هەموو جار بە خوڕڕەم دات ئەکرد
سەرتاپای کەژاوەی ئەو هەموو گوندانەت تەڕئەکردا.

ـ هەنووکە شەوو ڕۆژ گوێ ئەگرم لە لالێی
لەلالێی ئەستێرە و گوڵەباخ.
لەلالێی دەربەند و دارستان.
لە کپی و بێدەنگیی کاولاش و خۆڵەمێش.
هەنووکە من لەگەڵ مێژووی کەڕ ئەدوێم و
زمانم غەریبی فەرهەنگی خۆیەتی و
دەنگیشم مەلێکی گرمۆڵەی بێ ئاسمان.

چۆڵ و هۆڵ پێ دەشت و بناری ئەم لەشە دروێنە کراوە
چۆڵ و هۆڵ پایتەختی ئەم شیعرە خنکاوە.
چۆڵ و هۆڵ وڵاتی ئەم خەونە سووتاوە.
چۆڵ و هۆڵ، چۆڵ و هۆڵ
لەم سەری زامەوە هەتاکوو ئەو سەری.
لەم پەڕی کۆستەوە هەتاکوو ئەوپەڕی.

تۆ فریا نەکەوتی ئاوەکە بەیتە دەس "مەولەوی".
تۆ فریا نەکەوتی کەوشەکان بۆ "نالیی"ی دابنێی.
تۆ فریا نەکەوتی کەوچکێ دەرمان بەیت بە "گۆران"
تۆ فریا نەکەوتی و نەکەوتی و نەکەوتی.
لە جێی خۆت خەزان بووی، بێ ئەوەی هەڵوەرێی.
لەجێی خۆت هەڵقرچای. بێ ئەوەی بشێوێی.
لە جێی خۆت بووی بە مۆم. بێ ئەوەی بسوتێی.

(بروسکەیەك.. پەلەنییە.. شیعریش نییە.)

بەناوی هەڵەبجە و پێنج هەزار (مانگ)ەوە
بەناوی مەولەوی و پێنج هەزار گوڵەوە.
بەناوی گۆران و پێنج هەزار کۆترەوە،
بۆ زانا بلیمەتەکانی: وڵاتی پوشکین، وڵاتی جاك لندن.
وڵاتی بایرۆن، وڵاتی جان دارك، وڵاتی بسمارك.
وڵاتی گاریباڵدی، وڵاتی ڤان کوخ.. وڵاتی.. وڵاتی.. وڵاتی
سوپاس بۆ ئەو دیارییەی کە بە کۆمەڵ سەر لەبەیانی ڕۆژی 1988/3/16 لە ڕێگەی بەغداوە بۆ گوڵ و کۆتر و منداڵ و شیعری کوردستانتان ناردبوو.

★

ـ ئەم شەوە سوورانە "تارا"ن یان
بالیفی خوێناویی ژێر سەری کەژوکۆ؟
ئەم هەموو دووکەڵە

PDF 4 KURD

دووکەڵی یەك "مانگ"ی سووتاوە
یان مێژووی سەرزەمین هەر هەمووی پێکەوە ئەسووتێ

ـ سەرەتای نیسان بوو، ژنێکی لادێی
گوندەکەی بە گڕوکڵپەوە خستبووە ناو دڵی و ڕای ئەکرد
وەکوو دار، وەکوو بەرد، وەکوو ئاو
شێت بووبوو:
"دووکەڵ، دووکەڵ، دووکەڵ..
ڕەنگە خوا سووتابێ و ئەم هەموو دووکەڵە
لەو هەڵسێ!"
ڕای ئەکرد وای ئەوت.
"ئەی دووکەڵی بەژنی دایکم
لە وەختی نزاکردندا!.
ئەی دووکەڵی بەژنی مێژووم
لەوەختی هەتاو چاندندا!
تۆ ڕۆحی سەوزی گژوگیا و دارستان و
کێڵگە فرپیوەکانی ئێمەی بە دەوری
ئەم شاخانەدا خول ئەخۆی.
تۆ باخ و مەزرا باڵگرتووەکانی ئێمەی
سەرت ناوە بە بنمیچی تاریکیی کەشکەڵانەوە.
تۆ گیانی سپی بێشکە و پنە و بەرماڵ و
حیکایەتی گوێ ئاگردانی ئێمە بووی

PDF 4 KURD

ئەوا ئیستا بە ئاسمانەوە پەرت ئەبی.
تۆ گیانی سەرخۆشی ڕەزەکانی ئێمەی
واقاچت لە دوت نایەن و سەرسم ئەدەی.
ئەی دووکەڵی خەوەکانم!
تۆ ڕەنگە ڕۆحی قۆشمەی گۆچانەکەی مام "بایز"و
تەشیەکەی نەنە "ڕێحان"بی
وا لەسەر خۆ هەڵ ئەسووڕێیت و با ئەخۆی.
ئەی دووکەڵی ڕەنجەکانم!
لەسەر ناوچەوانی گرژی
ئەم ئاسمانە بێ باکە چیم بۆ ئەنووسیت؟!
من ئەتوانم فریای خوێندنەوەی چەند هیواو
بەهاری سووتاو بکەوم؟!
من کێ بکەم بە شایەتی
ئەم هەڵقرچانەی ژیانم؟!
ـ تۆ زەردەشتێکی سووتاوی
ئەوەتەی هەی گڕ ئەتخوات و هەر گڕ ئەگری
ئەوەتەی هەی ئەم جیهانەیش
ئاسمانێکی کوێروکەڕەو
تۆیش بەردەوام هەر دووکەڵی!.

هەر هەمان ئەشکەوتی چارەنووس
یەك زاری قریشکەی وێرانە،
هەر هەمان کەروێشکی خەونێکی ڕاونراو

PDF 4 KURD

یەك لانەی خەڵتانی شەوەزەنگ.

هەر هەمان نەقشی سەر

ئەم بەردی مێژووە

یەك پەیژەی حیكایەت.

هەر هەمان هەڵمی ژان

یەك گوڵی گۆرانیی.

ـ لەسەر ئەم تاوێری ئاواتە، وەستاوی.

ئەزانی جاربەجار ئەلەقیٚ و وەستاوی.

"بوەستە! هیوایەك بشلەقیٚ

لە قوللەی چەسپاوی تاریكیی چاكترە تیا بژیت"

ئەم پەندە

دووكەڵی شەرابیی

ئەو هەموو ڕەزانە بۆی نووسیت!.

هەموو جار من كێویٚ هاوار و زریكە

تلاوتل ئەبەم و ئەیخەمە ناو زەریای

بێدەنگی دنیاوە.. ناشلەقیٚ.

هەموو جار من سەری بڕاویساڵێكم، شارێكم

هەڵ ئەگرم ئەیبەمە بەردەمی

بۆ ئەوەی بپرسیٚ

ئەم سەرەت لە كوێوە هێناوە؟!

ناپرسیٚ

ـ "گاڵۆنیٚ لە دەنگم بشلەقیٚ

ئەم زەریای ویژدانی جیهانەیش
لەگەڵیا ئەشڵەقێ"
ئەم پەندە
بەرمیلە نەوتێکی سیاسی بۆی نووسیم!

ـ "هەر لەبەر نەزانیی سوار نییە
ئەم شاخە هەمووجار ئەگلێ.
دارخورمای خواستراوی "سوریا"
لە "بەردەقارەمان" سوارتربوو؟!
ئەم کێوە بە تەنها و بەسکی برسی هەر
ئەوەندە غار ئەکا!.
بۆ کەللەی "حەسارۆست"
لە "ئۆراس" پووت ترە؟!
خۆ مێشە سەگانەیش بە تەنها
لە ئەسپی ئەم کوردە ناوروکێ؟!
ئەم پەندەیش
گوڵێکی ژێر هەرەس بۆی نووسیم.

ـ چەندین جار بەو کاجی دەستانەت
تاریکیت شێلاوەو
کردوتە بە نانی ڕووناکیی
چەندین جار تینویەتی چاوانت کردووە بە کانیی.



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

چەندین جار لە پشتی مەحاڵ و خەونەوە
تۆ مانگ و ئەستێرەت بە پێرو[44] بۆ خەزاڵ هێناوە.
چەندین وەرز لە قوڕی شەوەزەنگ
تۆ خشتی هەتاوت بڕیوە و سەر لەنوێ
لە زەوی لە تینوان کوێربوودا
بنیاتی پرشنگی دووچاوی خۆت ناوە.

لە عومری شاخەوە مشاری زەمانێ نەماوە
سەرنەکا بە خوێنی مێژووتا
لە عومری شاخەوە پەیکانی سوڵتانێ نەماوە
بە نووکی خۆیەوە ئەم سەرە یاخیەت بانەدا
سوڵتان مرد.. بەرد نەمرد!
شمشێر مرد.. با نەمرد!
"منیش نیازمە، ئەم گۆزەیەی سەروملم تێك بەمەوە.
جارێکی دی بیشێلمەوە، لەبەر ئەوەی ماوەیەکە،
ئاوی خەیاڵی لێ ئەچێ. شیعرەکانم فێنك ناکاو،
وشەیشی پێوە ناوەستێ. منیش نیازمە، گردۆڵکەیەکی
چەپەکی ناو دەروونم، بکەم بە گۆڕستانی هەموو
بەرهەمە مردووەکانم. نیازم نییە گۆڕەکانیان
بۆ هەڵبەستم. یاخود لەسەر کێلەکانیان هیچ
بنووسم. نیازم وایە ئیتر ئەستێرەی یادگار، لە کلۆری

[44] پێرو: چەند ئەستێرەیەك، هێشووە ئەستێرە.

هیچ دارێکی زڕی خەڵکا نەشارمەوە. نیازم وایە،
من لە ساکۆی ئەم مەڕمەڕی ڕەشی شەوە، پەیژەی
هەتاو دابتاشم. نیازم وایە بۆ ئەم فڕینە تازانە،
ئاسمانی نوێ، شەقژنی نوێ، بدۆزمەوە.
نیازم وایە، هەرچی هەڵمی دەربەدەر و ئاوارەیە.
لە شەوێکی ئێجگار ساردا، لە ئاسمانی کوردستاندا
کۆکەمەوە. دواتر کوورەی هەناوی شیعری
نالی یان بۆ دابخەم. هەتا ئەبن بە شەستە
باران و تۆف و تێکەڵ بە دایکمان ئەبنەوە.
نیازم وایە خانوویەك بۆ:
شیعری سبەینێ و دواڕۆژم دروست بکەم. وێنەی نەبێ.
"بریتۆن"[45] بە خەو نەیدیبێ. خانوویەك بێ:
لەقەدپاڵی شەماڵێکی سەوزو سووردا.
بەسەر پێ دەشتی هەورێکی ئەرخەوانیدا بڕوانێ.
دیوارەکانی مەڕمەڕی تەم و مژبن.
دەرگاکانی لە دار ئەبەنووسی شەوبن.
هەموو پەنجەرەکانی لە:
ئەلەمنیۆمی هەتاوبن.
بە کۆنکرێتی ساماڵیش بنمیچەکەی داڕێژرابێ.
من ئەگەر بێ و لە خانوویەکی وادا بنووسم
بە زمانی خوایی پەتیی شیعر ئەنووسم

---

[45] بریتۆن: "ئەندریە بریتۆن" شاعیری سریالی بەناوبانگی فەڕەنسا.

PDF 4 KURD

پیتەکانم کلووی بەفر و تەرزە ئەبن.
وشەکانم گڤەی زریان.
قەڵەمم باڵی فریشتە و دەفتەریشم شەپۆل ئەبن.
من نیازم نییە لە ژێر ئەم ڕەشماڵی
شیعرانەدا خەیاڵ پیرکەم.
یان هەر لەژێر یەك سایەدا
گوڵەکانم پرچی سپی بهۆننەوە.
ڕەنگە دوای یەك چرکەی تر من
بگوێزمەوە و بڕۆم بچمە وڵاتێکی دیکەی جوانیی.
ڕەنگە بچمە ئەپارتمانی "ڕۆمان"ەوە
یان ناو کەشتیی شانۆیەك و
یاخود ئەستێرەی تابلۆیەك
یان هەر ببم، بە "ئاخ" ێکی ناو گۆرانی و
لە جۆلانەی ئەودا بمرم!"

★

ڕشتەیەك پەند و بەرد نووس و قسەی نەستەقی ئەمڕۆ کە سەرچاوەیان لە شاخ و خوێن و دووکەڵ و هەرەسەوە هەڵقوڵیوە:

**یەکەم:**

کە ڕەشەبا ڕێی پێ گرتی
ببە بە شاخ.
کە شەماڵ هات بە پیرتەوە
ببە بە باخ!

"ئەم قسەیەم لە ڕۆژنامەی
دار بەڕوویەکدا خوێندەوە"

**دووەم:**

لە ئەشکەوتدا
بەیانیەك کزە بایەکیان زنجیرکرد
بۆ ئێوارە لە دەربەندا
کزە با بووبوو بە زریان!.
"ئەم قسەیە لە تەوێڵی
کێوێکی ڕەش هەڵکۆڵرابوو"

**سێیەم:**

ئەوە.. پەڕەسێلکەیە وا ئەفڕێ؟
یاخود قیژەی،
ڕەش و سپی دایکم؟!
"ئەمەیش قسەی منداڵێکی هەڵەبجەیە
بە نیو دەقیقە پێش ئەوەی
کەرِوکوێر بێ"

**چوارەم:**

ئاخ خوایە ئاخ!
کەی سەرێکیش لە کوردستان ئەدەی؟
"ئەمەیش قسەی هەموو ڕۆژێکی دایکمە"



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

**پێنجەم:**

کە عاشق شێت ئەبێ
بە شیعرەوە ئەیگرێ.
کە شیعریش شێت ئەبێ
بە خواوە ئەیگرێ،
من عاشقم و من شیعریشم!
"ئەمە قسەی ڕووبارێکی سەرهەلگرتووی
هەندەران بوو"

**شەشەم:**

ـ چۆن ئەنوێ و
ئەو هەموو خەونانەی کوشتووە؟!
ـ ئەو ئەنوێ و قەت خەون نابینێ!.
"ئەمەیش گفتوگۆی نەهێنیی
نێوان دوو مەلی شارێکی کوردستان بوو"

**حەوتەم:**

کورد و خوا لێك ئەچن
هەردووکیان، بێ شەریك، بێ کەسن!
"ئەمەیش قسەی هەڵکۆڵراوی
سەر دیواری مزگەوتێ بوو"

PDF 4 KURD

**هەشتەم:**

کە میوانداریی بەفرت کرد
مەهێڵە گەرمای بێ
نەبادا ماڵەکەت ئاو بیبا!
"ئەم قسەیەم
لە ئاگرێکی پیرەمێرد بیست"

**نۆیەم:**

(3\1) ی ڕووبەری هۆنراوەکانم
لە دارستانی سێدارەو
پەت پێکهاتوون.
"ئەمەیش قسەی شاعیرێ بوو
زۆر کەم ژیا"

**دەیەم:**

من بۆ خۆم پاچێکم دا لە شاخ
تووڕەبوو، زریکەی گەیشتە عەرشی خوا
کەچی "ئەو" بۆ "سەنگەر"
بە بەرزیی باڵای چەك هەڵیکەند
گەش بۆوەو، پێکەنین لەگیانیا هەڵقولاٌ.
"ئەمەیش قسەی
شایەتێکی ڕاستگۆی وەختی
شەڕی نێوان مەزدەکان و ئەهریمەن بوو"

PDF 4 KURD

**یانزەهەم:**

ئەوەرێم یان ئەڕوێم؟
لە نێوان وەرین و ڕواندا
وەرزێکی دیکەی نوێم.
نە هەتاو نە سێبەر هیچیان نیم
خاکێکم تا ئیستە
بۆ شێوەو ڕەنگ و ڕووم ئەگەڕێم!
"ئەم قسەیە لەسەر دیواری ئەشکەوتی
"جاسەنە" بوو هەڵکەنرابوو"

**دوانزەهەم:**

من هەرگیز ناهێڵم "قەناعەت"
سەربکا بە هەوری شیعرمدا
بۆ ئەوەی گەر هەزار، کەڕەتیش ببارێم
وابزانم جارێکە باریوم!
"ئەم پەندە قەڵەمێ پێی وتم
تا مردن بارانی خەیاڵی لێ نەبڕا"

**سیانزەهەم:**

نەیاران!
نازانن من گۆمم؟
نازانن هەر بەردێ تێم ئەگرن
ئەوانیش لە بنما ئەبنەوە بە ژووری
پڕ گەرا بۆ شیعرم؟!

PDF 4 KURD

"ئەم قسەیەش" تەنها وەرامێکە کە من
بیدەمەوە و پێشکەشی ئەو.. بەردانەی کەم"

**چواردەهەم:**

ئەی نامۆکان!
ئێمە لە تەختەی سەر ئاوی "ئاموون" ئەچین
نوقم نابین و نایشخنکێین!
بەڵام مشاری شەپۆل و ئەم بڕبەندی کەنارانە
هێدی.. هێدی وردمان ئەکەن
ئەماندەنە دەس تاریکیی "ئۆقیانووس" و
تیا ون ئەبین.
"ئەم قسانەش لەسەر کێلی گۆڕ غەریبێ
هەڵکەندرابوون".

PDF 4 KURD

## III

لە ئیستە بە دواوە من ئیتر: هەڵەبجەم!.
لە ئیستە بە دواوە من دەنکە فرمێسکی هەناری
ئەو خەمە گەورەیەم.
لە ئیستە بە دواوە من باری ئەو سێوەم
کە ئیتر بارناکرێ بۆ ئەوێ.
لە ئیستە بە دواوە من تاڵێ لە ڕیشی
هۆرەکەی مەولەویم
لە ئیستە بە دواوە ئەو شەمی شەمانی
وڵاتمە و من وەلیم.

پێم بڵێن من چی بکەم بۆ ئەوەی گریانیی کافوریی
ئەم زەڵمەم لووزەوی کەم نەکات؟
پێم بڵێن من چی بکەم بۆ ئەوەی ئەم جوانووە
سەرکەشەی هەنیسکم ڕام نەبێت؟
دەبڵێن من چی بکەم، چی نەکەم؟ بۆ ئەوەی
خوا بێتە خوارەوە و هیچ نەبێ بۆ تاوێ
لە پرسەی ئەم "مانگ"ە جوانەدا
لەگەڵمان دانیشێ؟!
پێم بڵێن من چی بکەم؟
پێم بڵێن من

پێم بڵێن!..

پێم..

ـ لەم دەشتەدا، چۆن وا لە پڕ ئەم بنجکی زریکانە

گوڵیان کردوو بوون بە چوالە؟!

لەم دەشتەدا، چۆن وا لەپڕ ئەم گۆرانییە وەریوانە

ڕوانەوە و بوون بە لالە؟!

هەڵەبجە- هەنگێکم ئەچمەوە ناو خەونی منداڵیم

یادگار ئەمژم:

"زەردو سوور حەوت ساڵە خەیاڵم

هاوینە و لەسەربان، نەمامم پاڵ کەوتووم.

درەنگان خۆم ئەکەم بە شوانی ئەستێرە

فەرەنجیم تریفەو

تیزماڵکی[46] هەورێکیش گۆچانم.

مرواری ئەستێرە ئەژمێرم

حەز ئەکەم، خۆزگەمە، ئەو گەشەی سەرپەڕیان

بۆ ناو چیغ داگرم

وەك تۆپە شینەکەم بیخەمە باخەڵم!.

هەڵەبجە ئەمخاتە سەرشانی بەرزی خۆی

قاچێکم ئەلەرزێ، خەریکم بکەوم

بە دەستی چەپ خێرا

---

[46] تیزماڵك: بەشێکی باریك و درێژ لە هەر شتێ.

PDF 4 KURD

توند قژی "شنروێ" ئەگرم و

دەستی ڕاست هەڵئەبڕم،

ـ وەك بە ڕۆژ چۆن هەنار

هەناری "باخی میر"[47] ئەدزم ـ

ئەمشەویش ئاوەها ئەستێرەی سەرلقی

ئەم باخی سامالّە دائەگرم.

وا ئیستە لە چیغدا ئەستێرەم گرتۆتە باوەشم

لە دەنگی جریوە و جووکەی ئەو، باوکیشم هەڵ ئەسێ

دەست ئەبا و ئەستێرە هەڵئەگرێ

لە نێوان منداڵیی و شیعردا دای ئەنێ

لەم لاوە من ماچی ڕوومەتی زیوینیی ئەکەم و

باوکیشم لەولاوە

شیعرێکی لەبەردا ئەنووسێ!"

"16"ی مارت –"بەر لە نیوەشەوی ئەم ڕۆژە قرچۆکە

شازادە هەوایەکی مۆدێرنیزمی شێت

هەوایەکی دوو ڕەگ، لە نەسلی چەپ و ڕاستی

سیاسەتی ئەم دنیا بەستۆکە[48].

هەوایەکی کەتەی بەئۆکی[49] لەخۆبایی

بۆنی دەم سیراویی.

---

[47] باخی میر: باخی میری ناوداری شاری هەڵەبجە.

[48] بەستوکە: ژنی داوێن پیس.

[49] بەئۆك: ناشرین. ناقۆڵا. سامدار.

PDF 4 KURD

کوت و پڕ هات و کودەتایەکی زەردی
ئەلکترۆنی بەرپاکرد.
دەستی بەسەر تەخت و بەختی ئاسماندا گرت.
بوو بە تاقە فەرمان ڕەوای
ئەم مەملەکەتە بەرینەی بەهار.
ڕێ و بانەکانی هەناسەی نێوان
ئاسمان و زەوی بەست،
تەواوی دەرگاکانی بەهەشتی کلۆم کرد
بە دەنگی تێکەڵی ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوا
بەیاننامەی ژمارەیەکی خۆی خوێندەوە.
هەر ئەوەندەی لەرینەوەی گەڵایەك و کەمتر.
هەر ئەوەندەی ترووکەی چاوی ئاوێك و کەمتر،
هەر ئەوەندەی نووزەی کارژۆلەیەك و کەمتر.
چی فریشتە و حۆری و پەری و باڵدار و بێ باڵ هەبوو
کردنی بەمۆم بێ ئەوەی هەڵیان وەرێنێ.
کردنی بە شووشە بێ ئەوەی بیانشکێنێ
لە کەنار ئاوی ڕەشی ئەم ڕۆژە کپەدا
پۆل پۆل کۆترەکان سپی ئەچوونەوە-
هەر ئەوەبوو نەیان ئەگماند.
لە مەزرا و پاوانە سەوزەکانی ئەم ڕۆژە گێژوویژەدا
ئەسپەکان ڕەوە ڕەوە پاڵ کەوتبوون
هەر ئەوەبوو نەیان ئەحیلاند.

لەبەردەم ئەم هەوا شێتەدا
کێ ئەتوانێ بە پێوە بوەستێ؟
کێ دەستەوەستان نابێ؟
هەر لە "گاتا"کانی زەردەشتەوە
تا "سەرمایە"ی مارکس
تا شمشێرەکانی "ذوالفقار"
ڕشانەوە و بڵقیان کرد و خپ بوون.
ئازایەتی، جوامێریی، بیروباوەڕی ئاگرین
لە سەنگەرەکانی خۆیاندا مەیین
بێ ئەوەی فریای پەلەپیتکەی
تەقاندنی خۆیان بکەون!.
بۆ ڕۆژی دوایی لەیەکە بە یەکەی کۆڵان و شەقامی
ئەم سنگە خنکاوەی مندا
لە نێو ماڵانی ئەم سییە داڕزیوانەی مندا
فڕان فڕانی پەراسوەکانم بوو.
فڕان فڕانی گۆرانییەکانم بوو.
منارەکان دار ئەلەکتریکی ملیان هەڵ ئەکێشام.
هەندێ دەستی خۆیشم پەنجەکانی خۆمیان ئەدزی.
سەیر بوو، ئەو ڕۆژەم قەت قەت لەبیرناچێ:
لە تاقە ڕاستە شەقامی ئەم لەشە ساردوسڕەدا
چاوی زەقم بڕیبووە پاسدارێکی ڕیش نوورانیی
بەسەر منی هەڵەبجەوە ئەگریاو

PDF 4 KURD

کەچی خێرا خێرایش دەستی ئەکرد بە گیرفانیداو
لە دەنکە مێوژی گلێنەکانی سنەو سابلاخی ئەخوارد
ئەمە حیکایەتی شانزەی مارت بوو
ئەمە هاواری خنکاوی ئەم سنگەم بوو.

-وەرچەرخا تاریکیم
ئەم شەوە شەوێکی جیاترە.
وەرچەرخا ڕووناکیم
ئەم خۆرە خۆرێکی جیاترە.

ـ لەم دێڕە بەولاوە
ئاوەڕۆی وشەکان لە دەنگما ئەگۆڕم
لەم ڕەنگە بەولاوە
بافلێ[50] ڕەنگەکان لە چاوما ئەگۆڕم.
-فەرهەنگم تەنگە تەنگ، هەڵتەقی
لەبەری ئەشکەنجە و ژوار[51] دا
چوارچێوەی ئەم لەشە پابەندەم
بۆ ڕۆحی ڕافزییم دەست نادا!
ـ هەڵەبجەی "حەللاج"م چیت بینی؟!
ـ لەم بەری کەناری گیانمەوە:

[50] بافلێ: تاڤگە، قەڵبەزە.
[51] ژوار: ئازار، ژان، ئێش.

PDF 4 KURD

بەهاری ڕموون.

گوڵی دڕ.

خۆری کوێر.

بەفری ڕەش.

"با"ی خنکاو.

ڕووباری زۆر زبر.

بارانی وشك و ڕەق.

گڕی سارد.

خوێنی زەرد.

هاژەی کەڕ.

گرمەی لاڵ. چیم بینی؟!

کۆتری ڕق

غەدری هەق

تاوانی فریشتە

منارەی جەردە و دز.

ـ ئەی لەوبەر کەناری گیانتەوە؟

ـ بڵێسەی خۆڵەمێش.

شۆڕشی مردووەکان.

لافاوی وشکانیی.

هاواری بێ دەنگیی.

پڕشنگی تاریکیی.

هیوای نائومێدیی.

PDF 4 KURD

سەوزایی تینویەتی.
تێرێتی برسێتی و
فڕینی کێوانم من بینی!
-لەم دێرە بەولاوە ئاوەڕۆی وشەکان
لە دەنگما ئەگۆڕم.
لەم ڕەنگە بەولاوە بافڵی ڕەنگەکان
لە چاوما ئەگۆڕم.

★

هەنووکە دارسێوی شیعرێکم کۆچەریی
بنج و بێخ وەك پژی سەرلقم بەرەڵڵا
ئەڕۆم و زەویم وا لە پەڕەی دەفتەرما.
ئەڕۆم و ئاسمان و باڵندەم ئەوەتان
لەسەری بێ داڵدە و ناو جانتای سەفەرما.

هیچ پەناوپاسار و قوژبنی چاوێکم مەگەڕێن
بۆ گوڵە فرمێسکێ جێ مابێ لەو ناوە
هی خۆم و هی ئێوەیش هەموویم.. هەر هەمووی
بە باخ و پەرژین و جۆگەلەو.. بە دڕك و داڵەوە
لەگەڵ خۆم هێناوە.
من ڕەنگە لەوەختی ڕۆیشتندا ئەستێرەی شپرزەم
بزەیەك یان قاقای شەوێكی بیرچووبێ.
من ڕەنگە لەوەختی سەفەردا شڵەژاو

PDF 4 KURD

گیرفانی یادێکم کون بووبێ و لەوێوە
چەند وردە خۆشیەك کەوتبنە خوارەوە.
ئەشێ من هەناری مێ خۆشی نوکتەیەك
یان کۆنە چاویلکەی شیعرێکم بیر چووبێ
بەڵام من ئاخر چۆن خەمتانم بیر ئەچێ!
هەتاکوو "نالی" تان لەلام بێ.
بەڵام من ئاخر چۆن ئازار و ژانتانم بیر ئەچێ
هەتاکوو "سەیوان" تان لەلام بێ.
من دەستم خۆی جادەی ڤیرتاوی غەمێکی درێژە..
من سەرم خۆی ئێشە گلۆڵەی سۆزێکی ئاڵۆزە..
ئیتر چۆن خەمتانم بیر ئەچێ!

بێ کەسییم ڕووت نییە
تا ئەمرێ پۆشاکی ڕەشتانی بەش ئەکات.
تینوێتیم بێ کانی و ئاو نییە
تا ئەمرێ سیروانی چاوتانی بەش ئەکات.
تەنیاییم بێ دەنگ و کپ نییە
تا ئەمرێ هاواری ماڵتانی بەش ئەکات.
دۆزەخم بێ کزەی با نییە
تا ئەمرێ هەناسەی ساردتانی بەش ئەکات.
نیشتمان! من ناوت لێ ئەنێم گلێتکێ
ئەوەندەی لە مشتی شیعرێکما تۆ جێگەت بێتەوە

PDF 4 KURD

واخۆیشم ناو ئەنێم قومێ ئاو
ئەوەندەی لە پێڵوی بەردێکتا
من جێگەم بێتەوە.
لە پێشدا ئەتهێنم ئەتخەمە ناو دەستی سۆزێکم
هەتاکوو وەك خەونم ورد ئەبی
دواتریش لە چاڵی چاوانما –هەمووت نا-
تۆزێکت ڕۆئەکەم.
لەسەرت ئەوەستم
هەتاکوو لە ڕەنی[52] گوێ خوێنما
شین ئەبی.
ئەوەستم تۆزێکیش بە سەرتا ئەبارێم یان ئەگریم
هەتاکوو هەڵئەچێ باڵای سەوز
درێژە.. درێژە.. ئەم وەرزی غوربەتە و غەریبیم
ئەوەستم، ئەوەستم، ئەوەستم
هەتاکو ئەبیتە سنەوبەر.
گیانەکەم سنەوبەر!
تۆ ئیستە هی خۆمی
من بۆیە ئەمەم کرد
گەر لێرە من مردم
بۆم ببی بە تابووت!
-تەماشات هەر ئەڵێی چۆلەکەی

---

[52] ڕەن: زەوی گوێ ئاو کە کشتوکاڵی تێدا بکرێ.

PDF 4 KURD

**ترساو و سەرسامی ناو چنگی منداڵی لاسارە.**
**هەورێکیت کەڕولاڵ دێی.. ئەچی**
**دڵۆپە بارانی زۆر قسەی ناوناخت**
**دیلن و گیرخواردوو ناتوانن دارژێن.. دابکەن**
**تۆ ئیستا کە ئەدوێی**
**بە تەنها پەیکەری شەقام و باخچەکان تێت ئەگەن.**
**هەمیشە تۆ بۆ خۆت دووکەسی، دووبەشی**
**یەکێکیان ئەوەیە کە لێرە**
**دوو قاچە و ڕائەکاو**
**شوێن سەری ونبووی خۆی کەوتووە.**
**ئەویتر لەو دوورە ژەرەژی[53] ڕۆحێکەو**
**باڵی خۆی بە پرچی دایکتەوە بەستووە.**
**هەموو ڕۆژ... هەموو ڕۆژ.. هەموو ڕۆژ**
**تەمومژ خەیاڵتەو**
**ئاسمانت هەر وەکوو کراسی ئاودامان ئەیپۆشێت.**
**هەنگاوت پڕگاڵی جەستەتە و بست بە بست**
**خەم بە خەم، زام بە زام**
**خەریتەی وێڵ بوونت ئەپێوێت.**
**سستەکە[54] زەمینی ژێر قاچی هۆنراوەت**
**قیژەیان ڕۆئەچێ.**

---

(53) ژەرەژ: مەلێکی ڕەنگینەو لە کۆتر بچوکترە.
(54) سستەك: زەوی شل و ناپتەو.

PDF 4 KURD

دەستی تۆ کلیلی ون بووە

دەرگاکان سەرابن، هەر ئەڕۆیت

ماشێن و واگۆن و فڕۆکە

ژواری تەنیاییت سوار ئەکەن

بەستەکی ئەشکەنجەت بار ئەکەن، هەر ئەڕۆیت

ئەم خەون و هیوایە سێبەری درێژی پێش خۆتن.

سوار ئەبی

پەنجەرە ئەبێتە

ئاوێنەی هەڵماویی چارەنووس

بە پەنجە "کوردستان" لەسەر ئەو ئەنووسیت.

پسۆکە دەزووی چاو

لەوێوە تەماشای کۆلارەی

ژیانی پچڕاوی خۆت ئەکەیت

تۆ ئیستا چکچکەی[55] دەراڵی زەمانی و

لەشەوی غوربەتا دائەدەیت

بەرەو کوێ ئەڕۆیت و بەرەوکوێ ڕائەکەیت؟

هەموو شەو.. هەموو شەو.. هەموو شەو

ڕابوردوو: مۆمێکە پرتەپرت وەك نیگات

لەگەڵ خۆت ئەیگێڕی.

ڕابوردوو: بەرکاوی[56] خەونێکە زەردو سوور

---

[55] چکچکە: دڵۆپەی تنۆکە ئاو

[56] بەرکاو: بنارو دامێنی چیا.

PDF 4 KURD

بەپێڵوو ئەیکێڵێ و ئەیکێڵێت
ڕابوردوو: بای وەشتە و لە ڕۆحتا هەڵئەکات
بارانی منداڵی و ڕێژنەی دڵداری و
پژپژەی گۆرانی و
نم نمەی جریوەی چاوانی "گۆیژە"یە و
سەرتاپای خەمانت تەڕ ئەکات.
هەموو شەو شارەکەت سەرێکت لێ ئەدا
بەگوڵی ژاڵەوە شەلە شەل
خۆی ئەکا بە ژوورتا و ئەوەستێ
گوڵێکی سەر سنگیت ئەداتێ و
تۆیش تاڵێ وەنەوشەی ئەوینی نامۆیی ئەدەیتێ.
هەر شەوەی بەردێکی کۆڵانی دێتە لات.
هەر جارە و درەختی ماڵێکی باوەشت پیا ئەکات.
هەر شەوەی باخەڵت پڕ ئەبێ لە بۆنی گەڕەکێ.
ئەڕۆیت و بازنەی سێبەری خەیاڵت
نانێکی سەرساجی دایکتی لەسەرە
ئەڕۆیت و باوێژەی[57] هەناسەت
کەرویێشکەی دەغڵێکی بناری وڵاتی لەگەڵە.

خۆڵی دوای بۆردومان سیماتە و ڕەنگ و ڕووت
بۆ کوێ چووی تیزماڵکی دووکەڵی گوندێکت لەگەڵە

---

(57) باوێژە: ئەو میوەیەیە کە با ئەیوەرێنێ.

گلێنەت "ئەزمڕ"ەو ئەڕوانیت.
دەربەندی سەگرمە و بازیان گوێچکەتن، گوێ ئەگری
تۆ تەنها بە بەژنی ئازاری سیروانت
قوڵایی ڕووبار و دەریاچەو
تا زەریای جیهانیش ئەپێوێت!

زستانە، باڵندەی بەفرینت لەشامە
شام لەبەر باراندا ئەبینی:
ئاسکێکی چاو شینە
ئەترسێ و ئەلەرزێ و بارژنی هاواری
بۆ ئاوی زیندانی و کەلەپچەی مەچەکی درەخت و شەقامە.
زستانە. هەموو ڕۆژ تەنیایت ئەتباتە چایخانەی شەقامێ
دات ئەنێ. ئەوەندە دانیشتوویت
غەریبیت بۆن قاوەی کوتراوی گرتووەو ڕۆژانە
وەڕس بوون، لەبنی دەروونتا وەك خڵتەی فنجانە
لێرەیش هەر: ئازادیی پیاوێکە
لەسەر مێز بە چرپە ئەدوێت و شەقامی وەردییان
هەنگاوی ئەژمێرێ و کلیلی ماڵەکەی ئەموستی سوڵتانە.
لێرەیش هەر: ڕووناکیی قاچاغەو
شیعری نێر بەرخێکی خوێناویی ژیانە.
لێرەیش هەر سێدارەی گوێزان و ملی گوڵ.
لێرەیش هەر کوێستانی زمانم لە مەنفا ئەمرێت و

PDF 4 KURD

مێژوویشم عەگاڵ لەسەری پێچراوە.
زستانە. تۆ لەودیو شووشەوە بەتایبەت
تەماشای ئافرەت و بارانی شام ئەکەیت.
چەند جوانن، هەردووکیان بۆ شیعرت
وەك خەون و شمشاڵن.
لەویاندا تەماشای نامۆییت گوڵ ئەگرێ و
لەمیاندا یادگار ئەتژەنێ و کات و شوێنی جارانن:
"زستان بوو، شەوانی تەڕی ئەو، لە دەوری ئاگردان،
هاڵاوی حیکایەت لە بەژنی ژوورێکی ڕووتەڵە هەڵ ئەستا،
منداڵیم مێوژبوو. نیشتمان ماڵێکی بچووك بوو.
چرایەك دیوارکۆ. سێبەری وەك خەمی دایکم و
شەوقیشی ئاوێنەی ڕوومەتی ئێمە بوو.
لەوساوە من زستان، ناو حەوشەی هۆنراوەم،
پڕ ئەکات لە بەفر و دارچوالەی هەستیشم ئەخاتە
بەر باران. لەوساوە من زستان کێڵاومی و
کردوومی بە کێڵگەی گەنم و جۆی ئێش و ژان"

★

هەموو جارێ پاڵ ئەکەوی وا هەست ئەکەیت
بووی بە تەلەبەردێ لەوێ بۆ جێ ژوان.
دائەنیشی وا هەست ئەکەیت
سەرت تۆپەڵە قوڕێکە لەوێ
بۆ حەمامۆکێی مناڵان

که هەڵ ئەسیت وا هەست ئەکەیت
بووی بە پەیژەی بانیژەیەك ئیستە لەوێ.
وەختێ خەوتی وا هەست ئەکەیت
بووی بە خەونی داربەڕوویەك ئیستە لەوێ.
ئەی گیانی گیان!
خۆ ئەم "مانگ"ە سەرگەردانەی خۆشەویستیم
لە خۆیەوە نەیداوەتە ئەم ساکۆی[58] سکلّی غوربەتە
خۆ ئەم چەمە سەرکەشەی خەم
لەخۆیەوە جلّەوی ڕۆخی ئارامی نەپچڕاندوەو
لەخۆیەوە کوڕژن ناکا بە هاواری
دایگرساوی شەوو ڕۆژی ئەم غوربەتە.
ئەی گیانی گیان!
لەسەر ماچی پەلکە گیایەك
لێوی جۆگەیەکیان بڕیم.
لەسەر فڕینی شیعرێکم
هەوریان بە داو بۆ نامەوە
لەسەر نەڕەی شەپۆلێکم
تاڤگەیەکیان خنکاندم.
لەسەر حیلەی لوتکەیەکم
بنارەکانیان لەمێخ دام.
ئەی گیانی گیان!

---

[58] ساکۆ: چیای ڕووتەن.

گۆمێ شێتبوو وەختێ لە مانگیان دابڕی.
مانگیش شێتبوو وەختێ لە هەوریان دابڕی.
هەوریش شێتبوو وەختێ لە شاخیان دابڕی.
شاخیش شێتبوو وەختێ لە بەفریان دابڕی.
بەفریش شێت بوو وەختێ لە عەردیان دابڕی.
عەردیش شێتبوو وەختێ لە خەڵکیان دابڕی.
گیانی گیانم
لەئیستەیشدا، لە بێشەی ئاسن و شووشە و کۆنکرێتدا
سوورە کەروێشکێکی کێویی ئەو بناری
پیرەمەگروونەیە دڵم. لەم نەهاتیی ئەوینەدا
من هەر پەریی گڵەزەردەت
دار ئەستێرەم ئاو ئەدات و گەڵاڕێزانی جریوەم
ئەیپشکوێنێ بنە کۆتەرەکەی سەرم.
گیانی گیانم.

هەر کە بارانێ ئەبارێ
ڕائەکەم و بۆ چەند ساتێ ئەچمە بەری
ئەڵێم بەشکوو ئەمجارەیان ئەم بارانە
بۆنی بارانی ئەزمڕو گۆیژەی لێبێ!
ئەگەر ڕۆژێ خۆرەتاوبێ
ڕائەکەم و بۆ چەند ساتێ ئەچمە بەری
ئەو لێم ئەداو من چاو نووقاو

PDF 4 KURD

ئەڵێم بەشکوو ئەمجارەیان ئەم هەتاوە
لە هەتاوی بەربەرۆچکەی
بن گوێسوانەی، خۆمان بچێ!

ئەگەر جار جار "با" هەڵبکات
ڕائەکەم و بۆ چەند ساتێ ئەچمە بەری
ئەڵێم بەشکوو ئەمجارەیان
ئا ئەم "با"یە
وەك ڕەشەبای سلەیمانی
بە پڕتاوبێ و هەڵمبگرێ و
تۆزێ خۆڵ بکاتە چاوم!.

لە دوورەوە هەر کە پۆلێ کچم بینی
بەرەو ڕوویان پێ هەڵئەگرم
سەرنج ئەدەم ئەڵێم بەشکوو
نازێ، شەرمێ، تیلەی چاوێ
سوور هەڵگەڕانی گۆنایەك
بمباتەوە بۆلای شەقامی شارەکەم
وەکوو دوێنێ.

هەر کە بازاڕێکی میللیم هاتە سەر ڕێ
ڕائەکەم و ئەچمە ناوی

تیا خول ئەخۆم
ئەڵێم بەشکوو هاواری میوە فرۆشێ
هاواری ماسی فرۆشێ
هاواری سەوزە فرۆشێ
لە هاوار و ژاوەژاوی ئێوارانی مەیدانەکەو
بەر حەوزەکەو
ژێر پردەکەی خۆمان بچێ!.

(کارتێکی ڕەش و سپی تایبەت بۆ هاوڕێکانم)

هاوڕێیان!
ئەم ئێوارەیە منیش دێم.
لە چایخانە بچکۆلەکە
کورسیەك بۆ شیعرم دانێن
نەیدەن بە کەس
گەر جامانە: قۆشمەکەی
"خاڵە ڕەجەب"[59] هات پێی بڵێن:
ئەبێ ببووری گیراوە.
گەر شەپقەکەی "ئەحەی میرزا"[60]
بە پەلەپەل ئەویش هات بڵێن: گیراوە.

---

[59] [60] خاڵە ڕەجەب و ئەحەی میرزا: خوا لێیان خۆشبێ، دوو پیاوی قۆشمەو قسە خۆشی خەڵکی سلێمانی بوون.

PDF 4 KURD

مەگەر لە هەولێرەوە میوانێك ئازیز
زۆر ماندووبێ و بگاتە جێ
مەگەر کتێبە یاخیەکەی "عبدالخالق"[70]
وشەی شان و مل خوێناویی
کە ناتوانێ
لەبەر ئێشی زامەکانی
زۆر بەپێوە ڕابوەستێ!

★

ئەی ڕۆژگارە لیخنەکان!
کەی ئەبنەوە بە ئاوێنەی
ئەو درەختە دڵدارانەی
لەبەستێن و کەنارتانا
سەرتاپایان لە گوڵی تاریکیی و قوڕو
خۆڵەمێشی سوور گرتووە؟!
چ با هۆزێ سیمای گرژی مێژووتان ڕوون ئەکاتەوە؟
چۆن زەوی ئاشت ئەکەنەوە؟
ئەی ڕۆژگارە لیخنەکان!
ئێوە هاژەتان قریشکەی
مەزار و کێڵگەی خنکاومانە.
چەپۆکانی مەوج دانەوەی ڕەشی ئێوە

---

[70] عەبدولخالق مەعروف: شەهید عەبدولخالق مەعروف نووسەر و ڕووناکبیر، کە دوای هەڕەشەو هاندانی مەلاکان، ڕژێمی بەعس تیرۆریکرد.

پەلە ڤاژێی ئەستێرەکانی ئێمەیە!
ئەوەتا دارو پەردووی گۆرانیەکانمان، جەژنەکانمان
بە ئەنجن ئەنجن کراویی ڕائەماڵن.

بە چواردەوری ئەڵقە ئەڵقەی بۆشاییدا
بە چواردەوری خانە خانەی تەنیاییدا
چیایەکم سەر هەڵگرتوو
گوڵێکم شێت
هەر خول ئەخۆم و خول ئەخۆم.
وەڕس بوونم بۆ ساتێکیش
داڵدەی هیچ ئارامیێ نادا.
من دڵتەنگیم قفڵێکە خوا
چەند لێی نەوی نەیکردەوە
وەکوو "مەنسوور" زامانم جیێ بەخۆ ناگرن.
خانوو ویستی دابینم کات.. پەنجەرەییم لێ یاخیکرد.
شەقام ویستی دابینم کات.. شۆستەکانیم لێ یاخیکرد.
کورسی ویستی دابینم کات.. خۆمم هەڵکەن
شاران ویستیان دابینم کەن.. خەمانم باڵیان لێ ڕوا.
ئەی ڕۆحی وێڵ!
تەنگە بە بەری عەشقی تۆ ئەم نەخشانە.
نزمە بۆ سووتانی سەرت ئەم ئاسمانە.
تەمی ئێرەت دا بە خۆتا کورت و کوێر بوون.
گریان سارد و



PDF 4 KURD

ژانیان کپ و
پایزانیان بێ فرمێسکی درشتانە.
ئەی ڕۆحی وێڵ!.

ژوورێکم هەیە تەنیاییم بەشی ناکات
تەنیاییم جمەی دێ لە دەنگ
لە ڕەنگ و بۆن و تامی کۆست.
ئەو کردوێتی بە نەریتێ هەموو شەوێ
دووسێ هاودەمی دێرینەی
وەك: هەڵەبجە
گەلی بازێ
قەڵادزێ
پیرەمەگرون
لەگەڵ خۆیدا
دێنێتەوە بۆ ئەمماڵە بچکۆلەیە
ئیتر هەتاکوو بەیانیی
تا کەڵەشێری ئاوایی زامێکی تر ئەقوقێنێ
یەکە یەکە لەگەڵ بەرد و لەگەڵ دارو
لەگەڵ گەڵای هەموویاندا
سەما ئەکاو
پێ ئەکەنێ و
ئەگری و



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئەدوێ.
ماڵێکم هەیە تەنیاییم بەشی ناکات
تەنیاییم قەرەباڵغەو پڕ لە ژاوەی وردە ژانە
ئەو، شەوانە بووە بە خووی
هەر لەسەر ئەم چرپا تەسکە
ئەبێ لەگەڵ ڕوبارێکدا ڕابکشێ و
دەست بکاتە ملی گۆمێ
چرپایش کورتە بۆ قاچەکانی ڕووبار و
تەنگیشە بۆ لەشی گەورە و پان و پۆڕی گۆمە شینێ

ژوورێکم هەیە تەنیاییم بەشی ناکات
بۆ شپرزەییم بچووکە
تەنیاییم دۆستی بێ دالدەی ئێجگار زۆرە
گەلێ جاریش شەوانە وا ڕێك ئەکەوێ
تەنیاییم جێی خۆی چۆڵ ئەکاو
ژوورەکەیشی بەجێ دێڵێ
تاکسپەیەکی غەریبی تازە هاتوو
لەسەر چرپای ئەو بخەوێ!.

ـ ئەوا ئیستەیش ئەمە یەکەم پایزی دوای
کۆچی ئەسپە ڕەشی تۆیە.
ئەمە یەکەم پایزی دوای هەڵهاتنی نامۆییت و

PDF 4 KURD

ئاوابوونی شاخەکانی ڕۆحی تۆیە.
ئەمە یەکەم پایزی دوای
وێڵبوونی گەمیەکەی تۆیە.

لەگوێ زەریایت.. چاوەکانت وەك کەلەپۆ.
بڕیوەتە نەهێنیی ئاو
سەرت لەناو نامۆییدا بەلەمێکی سەر گەردانەو
دەستەکانت سەوڵی شکاو.
وەکوو پایز ئێوارەی تەنیاییت تەڕە و
یادگاری لێ ئەچۆڕێ و
خەیاڵیشت زەردەی هەتاو.

لەگوێ زەریایت
شپرزەیی شەپۆلەکان و وەرینیان لە بەستێندا
پایزە مێژووی زۆر دوورن و کەفی "کات"ن و
دێن و لەگەڵ لی عومری ئەمڕۆ و سبەی
باوەش ئەکەن بەیەکتردا
شڵپ و هووڕ حیلەی زەریایەو
داناسەکنێ چەپۆکانی.
یاڵی سپی بەدەم "با"وە
هەڵ ئەپژێ و دائەڕژێ و زەردوو سوورن تیسکەکانی

لەگوێ زەریایت

PDF 4 KURD

یەکەم جارە ئەم مێژووە شلە ببینی
یەکەم جارە ئەم سامە شینە ببینی
یەکەم جارە بۆنی تریفە بکەیت و
زرەی ڕەنگەکان ببیسی.

لە گوێ زەریایت
بەڵام لە هەڵسانەسەرپێی خێرای ئاودا
دیسان شاخ ئەبینیتەوە
تۆ بێ "هەڵگورد" شیعرێکی کاکی بە کاکیت
نە گزنگت تێدا ئەڕوێ و نە سۆزیشت باڵا ئەکا.

لەگوێ زەریایت
وردە وردە تەماشات هەنگاو هەڵدێنێ
خەیاڵت خۆی هەڵ ئەکات و
باز ئەدەیتە سەر ئاڤزینێ
لە ترساندا هەردوو چاوت ئەنوقێنی و
مایینی ئاو ئەتفرێنێ
ئەو وەختەی چاو ئەکەیتەوە خۆت ئەبینی
لەگوێ ورمێ بووی بە گوڵە نازەنینێ.

لە گوێ زەریایت
گوێت لە ناڵە و گرمەگرمی سەدەکانە بەیەکدا دێن
چاوت لە زۆران گرتنی هەتاهەتای عەرد و ئاوە

PDF 4 KURD

چاوت لە غەزەبی خوایە کە هەڵئەچێ
چاوت لە پاشگەزبوونەوەی گوناهیشە کە دائەچێ!
چاوت لە کەفەژیلکەی غەریبیی خۆیشتە
کە کۆچ ئەکات و ون ئەبێ!.

ئەمە یەکەم پایزی دوای
وێڵبوونی گەمیەکەی تۆیە
ئەم پایزە لە پایزی دایکت ناچێ
ئەو پایزێکی بێوەژن، کوختەنشین، چڕ ئەوەرێ
ئەم پایزی ئاڵتوون بەسەر، تەلارنشین
لە شووشەبەندا ئەوەرێ.
ئەم پایزە لە پایزی دایکت ناچێ
لێرە هەر دار بەسەر داردا بە خوڕ ئەگریی
لێرە هەر بەرد بەسەر بەردا بەخوڕ ئەگریی
بەڵام لە پایزی دایکتا ئیستە لەوێ
داروبەردوو ئاوو خەڵکیش
هەر هەموویان بەیەکەوە
بەسەر خاکدا بەخوڕ ئەگرین
ئیستە لەوێ!.

ـ لەکوێوە هاتووی؟ ئەپرسن.
دیسانەوە هەمان پرسیار ئەبێتەوە بەتوتڕکێ و
خوێن لە دەنگم دێنێتەوە.

PDF 4 KURD

وا بۆ جاری هەزار هەمین
ناوی گوڵەکەم ئەهێنم.
هەیانە وەك ڕۆژێ "با"یەك
ئەمەی دابێ بە گوێیاندا
لەدوای ساتێك سەرێکی بۆ ئەلەقێنن.
بەڵام زۆریان لە بێدەنگیدا ئەخنکێن.
مت ئەبن و ملیان ئەبێ بە نیشانەی سەر سوڕماندن.
منیش ئیتر لە حەژمەتا نەخشەیەکی
وەك سیاسەت چرچ و لۆچ و
پیس و دڕاو وەکوو ڕەوشتی دەوڵەتان
لە گیرفانم دەرئەهێنم.
پەنجە ئەخەمە سەر خۆری لەتوپەتم
ـ ئالێرەوە
لەناو کەشتیەکەی "نوح"ەوە من هاتووم و
لە بەفری "جودی"[71]دا زاوم
ـ "ئێوە خەونی ڕەنگاوڕەنگی
نێو داستان و ئەفسانەی کۆنە ئەیبینن
هیواتان تراویلکەیە[72]"
منیش باوکم نیشتمانی لەناو چاویا هەڵگرتبوو
ئەو، دار خورمای بەندەرێکی

---

[71] جودی: ئەو شاخەی کەشتییەکەی نوحی لەسەر گیرسایەوە وەك لە قورئاندا هاتووە..
[72] تراویلکە: سەراب.

PDF 4 KURD

چاو خەواڵووی باکووری ئەفریقابوو
ڕۆژێ گەرداوی ئۆقیانووس ڕای فڕاندوو
لە "ئۆسلۆ"دا گیرسایەوە
لە "بار"ێکی وەك ئێرەدا
شەوێکی سارد وەکوو ئیستا
دایکمی ناسی.
من ناوم "مارگریتا"یە
باوکم تا مرد
خەونی وەکوو خەونەکانی تۆی ئەبینیی!."
ئەمە قسەی کیژۆڵەیەکی دوورەگی "مەغریب"ی بوو.
شەوێکی سارد، لە "بار"ێکی سەر گەرم بووی،
ناو "ئۆسلۆ"دا وای پێ وتم. مێرگێ کوڕو کچی
شەنگ بوون. بەدەم کەرویشکەی گۆرانیی و مۆسیقاوە
ئەشنانەوە.
منیش هەرخۆم و شیعرێکی شەرمنۆکەم
خۆم و باڵندەی وڕێنەم
خۆم و دووکەڵی جگەرەم
لەسوچێکدا یەك یەکترمان ئەخواردەوە.
کچی دوورەگ "مارگریتا" تازە بووە:
بە "مانگ"ی ناو بەفری نەرویج
تازە بووە بە هەناسەی هەڵماوی ئەم شەقامانە
بە حەرفێکی ئەم زمانەو

PDF 4 KURD

به پەڕی مۆسیقای ئەم "باڕ"انە.
"مەغریب" نیشتمانی باوکی
لای ئەو تەنها سێ تارمایین
سێ تارمایین و هیچی تر..
بیابانێ، دارخورمایەك و حوشترێ.
لەو شەوەوە "مارگریتا" ترسێکی کرد بە سێبەرم
چرکە بە چرکەی سەعاتێ ئەم غوربەتەم ئەژمێرێت و
بۆ کوێ بڕۆم تەم و مژی دێ لەگەڵم.
لەو باڕەوە مارگریتا گومانێکی تیا ڕۆکردم
وەکوو خۆرکە لەو ساکەوە
پەلکەکای خەونم ئەخواو
لەناو بێشەی تاریکیدا
نائومێدیی دائەتاشێ بۆ تابووتی
مانگەشەوم.
لەوشەوەوە وا هەست ئەکەم سیمای کچە بچکۆلەکەم
لەبەرچاوم بۆتە سیمای مارگریتا
نیگاکانی چوونەتە ناو نیگایەوە
جۆگەی دەنگی ڕژاوەتە ناو دەنگیەوە
باخی قژیان هەر یەك باخەو
ڕەنگەکانی هەست و نەستیان بوون بە یەك ڕەنگ.
لەو شەوەوە وا هەست ئەکەم
منیش کچە بچکۆلەکەم

PDF 4 KURD

نامۆیی گەورەی کردووە
وەکوو دڵۆپە شەونمێ
تێکەڵ بە "با"ی ئێرە بووە
لەسەماگەی نیوەشەودا
سەری لە لەشی ونبووەو
جاربەجارێ لە بارێکدا بۆی ئەگەڕێ.
وا هەست ئەکەم هەموو ڕۆژێ
تارماییەك دێت بۆلام و وێنەیەکیم بۆ ئەکێشێ:
کاڵبوونەوەی یادگاری.
ڕووتانەوەی پەڕوباڵی زمانەکەی.
هەڵوەرینی خێزانەکەی.
بیرچوونەوەی خەونی باوکی.
بۆن نەکردنی هەناسەی نیشتمانی.
توانەوەی بەفری گۆرانی و
حیکایەتی گیانی دایکی.
لەو شەوەوە وا هەست ئەکەم
منیش باوکی مارگریتام
بووم بە شیعری خەمێکی زەرد
ڕۆژێ لە بەفری مەنفادا ئاوا دەبم!.
ئەوسا لەوەرزێکی تردا
شەوێکی سارد وەکوو ئێستا لەبارێکدا
ئەویش وەکوو مارگریتا

PDF 4 KURD

باسم ئەکا:

"باوکم مەلێکی کێویی بوو

لە شاخەوە باڵی گرت و

گەیشتە بەفری ئەم قوتبەو

ڕۆژێ لێرە، بەدەم ئاواز خوێندنەوە

خەونەکانی لەگەڵ خۆیدا ڕەق بوونەوە!"

*

مێژووم و سەفەر ئەکەم و

لەگەڵ خۆمدا شۆڕشەکانم ئەگێڕم

لەخۆم زیاتر کەس تەماشای خوێنم ناکات.

دووکەڵم ئەسووڕێمەوەو

لەگەڵ خۆمدا دێهاتەکانم ئەگێڕم

لەخۆم زیاتر چاوی کەس ناکزێتەوە

بەم دووکەڵە.

لاواندنەوەم ئەخولێمەوە و لەگەڵ خۆمدا

سێدارەکانم ئەگێڕم

لەخۆم زیاتر کەس گوێ ناگرێ لەم کۆتەڵە

چیرۆکم درێژ ئەبمەوەو

لەگەڵ خۆمدا قرچەقرچی شەقامەکانم ئەگێڕم

لەخۆم زیاتر کەس بۆنی بۆکرووز ناکات

لەخۆم زیاتر لە خۆم

لەخۆم زیاتر

لەخۆم..

کوا غوربەت سێبەری داربەڕووی دوورییە؟
گەر وایە! ئەم هەموو کڵاوی فرمێسکی بەڕوانە
چی ئەکەن لەلای من؟ بۆ لێرەن؟
بۆ ڕیزیان بۆ سەری قەڵەمم گرتووە؟

کوا غوربەت ئەستێرەی پەمەیی کۆچ کردووی
سیوەیلە و نەیبینم؟ کوا وایە؟
گەر وایە؟ ئەم هەموو وەنەوشەی خەونانەی
"زێ" و "نۆڕك"[73]
چین لە ناو دەفتەرما ڕواون؟
بۆ لێرەن؟
بۆ ژووری تەماشام پڕئەکەن
لەبۆنی دوو "بارێ"ی[74] پاش باران؟
کوا غوربەت شەوقە بۆ ئاژاوەی ئێوارەی
منداڵی گەڕەك و نەیبیستم؟ کوا وایە؟
گەر وایە؟ منداڵی ئەم هەموو گەڕەکە
لەکووچەی ناو دەنگما چی ئەکەن؟!
بۆ لێرەن؟

---

(73) (74) زێ و نۆڕك و هەردوو بارێ: چەند گوندێکی بناری سورکێوی ناوچەی (سیوەیل) بوون ڕژێمی عێراق وێرانی کردن.



PDF 4 KURD

بۆ ساحەی فتبۆڵیان سەرسنگمەو
گاڵتەیان: تریقەی کاغەزی سپیم و
شەڕیشیان: "مسوەدە"م؟
کوا غوربەت بای بۆنی شارێکە من نەیکەم؟
کوا وایە؟ گەر وایە؟
ئەم بۆنە تێکەڵەی: ڕاڕەوی قەیسەری و
مەیدانی ماستەکە و، گوزەری زین درووو..
چین کە دێن لە حێلی وشەم و
لە پوونگەی کاکۆڵم و
لە چەرمی جانتاکەم؟!
ئەی تەنیایی!
ئەی ئەسپی ڕەشی بێزاربوو
لەجڵەوی ئەم زەمانی بازرەبوونە![75]
ئەی زایەڵەی کەوە سوورەکەی ناو سنگم
تۆ کەی ئەوەندە چواردەوری
جێ ژوانی ڕازەکانت چۆڵ و هۆڵ بوون؟
لەناو لانکەی نیشتماندا
تۆ هاوڕێی ئەمەکداری لاواندنەوەت
گەلێ زۆر بوون.
تۆ کوا لەوێ هەرگیز هەستت
بە بزربوونی جریوەی بێداریت و

[75] بازرە بوون: ئاوارەبوون.

خاوبوونەوەی ژێی گینگڵی شەوان ئەکرد؟
تۆ کوا لەوێ هەرگیز هەستت
بە ونبوونی جێ پێی ئاخ و
ساردبوونەوەی ئاگردانی گریان ئەکرد؟
تۆ کوا لەوێ قەت هەناسەت
بێدەربەندی هاودەم بووە؟
تۆ لەوێ خەمە دراوسێت هێندە هەبوون
بە پەیژەی وەخت و ناوەختا
دڵسۆزیتان، سمۆرە بوون
بۆلای یەکتر دائەبەزین.. سەر ئەکەوتن.
بەسەر دیواری مابێندا فرمێسکەکان بازیان ئەداو
وەکوو لاولاوی سەر دەرگاو پەنجەرەتان
ماچ ئەڕۆیشت و ماچ ئەخشاو
لەسەربان و لە حەوشەدا، وەك تەنافی جلەکانتان
ڕازو نیازتان تێکەڵ ئەبوون
ئەی تەنیاییم!
تۆ لێرە ئیستە کەناریی
ناو ژانێکی شووشەبەندی ڕەنگاوڕەنگی
بەم دەنووك بەوباڵانە
چۆن ئەتوانی تۆ سنووری شووشە ببڕی؟
بۆ کوێ ئەفڕی
ئەی تەنیایی؟!

جیابوونەوەی ئەم باڵانە لەو ئاسمانە
لەنگەری گیانیان تێکداوم.
دوورکەوتنەوەی ئەم وشانە لەو گوڵانە
هەستی بۆنکردنی خاکیان تیا وەراندووم.
دوورکەوتنەوەی ئەم چاوانە لەو کێوانە
زنەی سەرنجیان کزکردووم.
جیابوونەوەی ئەم دەستانە لەو پرچانە
پەنجەی تەماسیان سڕکردووم.
دوورکەوتنەوەی ئەم زمانە لەو تامانە
ئۆخەی چێژیان لەناو دەمدا بزرکردووم.
جیابوونەوەی ئەم قاچانە لەو ڕێیانە
ناونیشانی زۆر هەواریان تیا ونکردووم.
جیابوونەوەی ئەم گوێیانە لەو بەستانە
چەند هاژەیان تیا کەڕکردووم.
ـ نامۆیی چییە؟ لێی پرسیم.
وەکوو فیشکەی شەمەندەفەری هەزارپێ
شەو درێژ و ئاخ درێژ و دووکەڵی یادم درێژبوو.
شەوقی گڵۆپی زەردباوی کابینەکە
ئەیدا لە تەمی دەروونم
لەو ساتەدا وام هەست ئەکرد:
من دەشتێکی چۆڵ و هۆڵی
وەکوو ئەو دیو پەنجەرەکەم!.

PDF 4 KURD

وەك جانتاكەم شەوگار هەر تەكەتەكی بوو
خەوی زڕاو بووبوو بە جامێكی مس و
لەگەڵ هەموو سەرسمێكی ئەو شەوەدا
لەسەرما ئەزرنگایەوە..
لەو ساتەدا وام هەست ئەكرد:
گڵۆپی زەردباو هەر خۆمم
تەم هەر خۆمم
هێڵی ئاسنیش هەر خۆمم
ڕێگا خۆم و كۆچ هەر خۆمم.

ـ نامۆیی چییە؟ لێی پرسیم.
مەی: ئەستێركێكی كڵپەبوو
سەرم تیا نوقم كردبوو.
خەیاڵی لەرزۆك لانكەم و
بێ هودەیی ڕای ئەژەنیم.
لەو ساتەدا وام هەست ئەكرد:
شووشەیەك مەیی ڕژاوم
شووشەیەك بادەی شكاوم و
هەر بە تەنها ملەكەمم پێوە ماوەو
ئەم جیهانەیش تووڕی داوم!

ـ نامۆیی چییە؟ لێی پرسیم. چی پێ بڵێم؟

PDF 4 KURD

بڵێم: دڵداریی نێوانی خەون و خاکە؟
یان هەناسەی گوڵێکە دوور لە باخی خۆی؟
یان وێڵبوونی تەماشایە بەدوای یادەکانی خۆیدا؟!
یان تەنیاییە ئەو کاتەی ڕەوئەکات و
نیشتمانی لەکۆڵدایە؟!
یان ئاوێنەیە و بۆ سیمای یادێ ئەگریی؟
چی پێ بڵێم؟! بڵێم: نانێکی سەرساجە و بیری ئەکەم؟
بڵێم: بۆنی مێخەك بەندەو بۆنی دایکم و
بۆنی کچانی گەڕەکەو ئیستە نایەن؟
بڵێم: شێتبوونی ڕێواسە
دوور لە کەلیخانی وڵات؟
بڵێم: مەراقی سووری هەناری ئاوارەیە
بۆ شارەبان؟!
یان سەودای زەردو سپییە بۆ نێرگز و
یان شەیدا بوونێکی سەوزە بۆ بەهاران؟!
بڵێم: دووریی نێوان من و کورسیەکە
لەچایخانە بچکۆلەکە؟!
نێوان من و مێزی یانە و ئێوارانی چیمەنەکە؟!
چی پێ بڵێم؟ بڵێم: نامۆیی، دیوارە؟
یان بڵێم عیشقە بۆ قوڕی کۆڵانان و
بینینەوەی شێتەکانی شارەکەم و
یان ماچێکی باڵکراوەو ناگاتەوە ئەو هەوارە؟!

PDF 4 KURD

من له دواییدا پێی ئەڵێم:
شپرزەیی هێنده باڵی نامۆییمی ڕاکێشاوه
تۆڕی گلێنەم ڕایەڵی تیشکەکانی
خاوبۆتەوەو
لەم دوورەوە وەختێ ئەڕوانمە نیشتمان:
هەموو یادێ، هەموو شوێنێ
هەموو خەونێ، لەبەرچاوی یادگارم
ئەبن بە دووان، ئەبن بە سیان
ئەبن بە دە.. ئەبن...
چی پێبڵێم؟!
چی پێبڵێم؟!
چی؟!
*

ئەمەیش ئەو باڵندەی سترانە سپییەیە
کە هەموو شەوێ لە گەرووی بە تەمومژی
شاعیرێکی سەوداسەرەوە بەرەو
کازیوەی چاوەکانی خاك باڵ ئەگرێ:
تا زریان نەبوو بە ئەسپم
چیا جڵەوی نەگرتم.
هەتا هەڵۆ باڵەکانی خۆی نەدامێ
شیعرم نەفڕی.

PDF 4 KURD

هەتا یار نەبوو بە هەنگم
شانەی هەنگوینم لا نەبوو.
هەتا شەهیدی وڵاتم
نەهاتنە ناو باخچەمەوە
هەڵاڵەم سوور هەڵنەگەڕا.
تا نامۆییش نەیدام بە دەم
خەزانەوە
بەهاری خۆشەویستیم نەدۆزیەوە!.

## IV

هەر ئەمشەو درەنگان لە کەنار
ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
ئەو کاتەی مانگ سەری وڕی خۆی
ئەخاتە سەر شانی گردۆڵکەو
"با"یش ئەڕوا بۆ سەمای هێواشی
هاوینەی لێرەوار.
هەر ئەمشەو ئەوکاتەی کە لی
لەش گەرمی بەستێنیش وەکوو بەرد
شەکەتە و خەواڵوو.
ئەو ساتەی گژوگیا

PDF 4 KURD

بەرامبەر تریفەی حەپەساو
بەوەنەوز پێڵویان قورس ئەبێ و
کەنەفت و ملیان لار!
هەر ئەمشەو ئەوکاتەی فریشتەی داستان و
پەریەکان، لە پەردەی زیوینی کەژاوەی ئاوەوە
ڕووت و قووت دێنەدەر، ئەڵقاوئەڵق دەس ئەگرن
بەچرپە ئەدوێن و چراوگی ئەوینیان
ئەخەنە سەر زینی شەپۆل و
(تانجیک)ی نوور ئەدەن
لەقژی درێژیان.

هەر ئەمشەو ڕێیەکی شین باوی نەهێنیی
ئەمباتە کەناری ئەو گۆمەی تەنیشتمان
لەشوێنێك نەپندی
نەپندی[76] وەك جێگەژوانی بەفری خواو
بڵێسەی عەشقێکی ئەبەدیی
چەپەك وەك، ژێر کەپرە ساردەکەی
دەروونی غەریبان
کڕ وەکوو سێبەری تەنیایی
شەوانی غەریبان.
وەکوو عەشق

---

[76] نە پندی: نەهێنیی، نا ئاشکرا، شاراوە.

PDF 4 KURD

سۆز ئەمبا
ڕەنگە لای برینی بێ نالەی دارمێوێ
لابداو دامبنێ..
ڕەنگە لای سووتانی بێدەنگی دار بییەك..
ڕەنگە لای هەناوی کۆلڕاوی گا بەردێ..

چەند ساڵە من لێرە بنچکی
سەر ژیلەی، چاوەڕێی ئەمشەوەم
چەند ساڵە من سەرم هەورێکی نەبارەو
چاوەڕێی هاتنی بارانی ئەم خەوەم.
من ئەمشەو:
مەچەکم و چاوەڕێی پەنجەمم.
قاچم و چاوەڕێی ڕێگەمم.
پڕوپۆم سەرکۆنەی "با"ی زۆرکرد
بۆ نەهات؟ تاڤگەی ئەو زەڵمە بۆ نەهات؟
نەگەیشت، ئەو هاژەی ئەوینە، نەگەیشت.
باڵندەی پرسیارم بە دەنووك
کراسە شینەکەی ساماڵیان کونکون کرد
بۆ نەهات؟ ئەو کۆتری هەتاوە.. بۆ نەهات؟
نەگەیشت؟ ئەو خەمە سەرکەشەم، نەگەیشت؟
بۆ نەهات؟ ئەو ڕەزی هۆنراوە سپیانە.. بۆ نەهات؟

ئەو کە هات دڵنیام

لەگەڵ خۆی نیشتمان ئەهێنێ
لە قوڵی مشتیدا کێوان و لەپێڵوی ماندوویدا
دەریاچە ئەهێنێ.
ئەو کە هات دڵنیام
ئەوینی شارەزوور تەڕتەڕی کردووە.
ئەو ئیستە سۆزێکە شەلاڵی غوربەتەو
بە باڵی چریکەی لەسەر تەم ئەنووسێ و
تەرزەیەو
شەختەیەو
ئاگری گرتووە!
ئەو کە هات دڵنیام
هەر یەکسەر هەواڵی
دارچوالەی ئاوارەی "زەردیاوا"[77] ئەپرسێ!
پەرۆشە
پەرۆشە
بۆ ئەوەی گەڵایەك فرمێسکی
دارەکەی شێخ هەباس ببینێ
سووتاوە بۆ ئەوەی، ڕێحانە بسکێکی
کچێکی سنەیی بۆن بکاو
شێت بووە بۆ ئەوەی
لە دەشتی بەرینی دەنگێکدا

[77] زەردیاوا: ناوی دێرینەی قەرەداغ.

PDF 4 KURD

هۆرەیەك ببیسێ.

نازانم! ئەو وەختەی ئەو نووره بە سامە وەك تیرێژ
خۆی ئەکات بە شەوی خەڵوەتما، ئەمخاتە تەندوورەی
پرسیاری خۆیەوە، ئەمخاتە گێژەنی ئەوینی خۆیەوە، گومانم
پەرت ئەکا. سەرتاپام لە سۆزیا غەرق ئەکا.. من چی بکەم؟
چۆن چۆنی چەخماخەو برووسکەی ئەو عەشقە بدوێنم؟
بڵێم چی؟ کلیلەی ئاسنیی ئەم دەمە بەستراوە چۆن بەربێ؟
من چی بکەم؟ بۆ ئەوەی حەسرەتم بە هەتاو بپژێ و وەرینم
گوڵ دەرکاو بە باڵای ئاسۆدا هەڵژنێ؟
دڵنیام کە بینیم
پەلوپۆی تاریکیی بەرچاوم.. چراخان هەڵئەکەن
تینوێتیم کارێزی ئەتەقێ و
مەلوولیم سایەقە ئەکات و
ئاسمانی ڕۆحی ئەو باوەشی پیائەکەن!

نازانم پێشوازیی عاشقێ لە خۆری عاشقان چۆن ئەکرێ؟
نازانم پێشوازیی غەریبێ لە مانگی غەریبان چۆن ئەکرێ؟
نازانم ئەو وەختەی گەڵایەك
ئەگاتە بەردەمی زریانێ چی ئەڵێ؟
یان تاقە دڵۆپێ لە ئەوین
ئەو وەختەی ئەگاتە
زەریایەك لە ئەوین.. چی ئەڵێ؟!

PDF 4 KURD

بەڵێنە درەنگان هەر ئەمشەو لە کەنار
ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
دوو قۆڵیی یەکتری ببینین
"من ئەبێ هەڵکشێم
بۆ ئەوەی بەرزایی بمناسێ
من ئەبێ ڕۆبچم
بۆ ئەوەی قوڵایی بمناسێ"
من زووتر ئەگەمە لای کەنار
پێش وەخت، بەچرپە، بە ئاوو بەرد ئەڵێم: کێ ئەگات!.
من زووتر، لەسەر گۆم، شیعری خۆم ئەنووسم.
پێش وەخت من، سەرم، وەکوو تاق لێئەدەم
ئارامی شپرزەم لە ڕۆخدا ئەڕوێنم.

لە ژووری زەردباوی خەماندا
جڤینی غەریبان ئەم شەوە
لەبەردەم شای کۆچ و پیرەکەی موغانی شاخاندا!
جڤینی گوڵاڵە و خۆڵەمێش
جڤینی ئاووگڕ.
جڤینی تیشك و تەم.
جڤینی فرمێسك و نیشتمان ئەم شەوە.
پێدەشتی زیوینی ڕۆح شوێنەو
کات لە ژێر ڕکێفی عەشقایەو

PDF 4 KURD

چاوی خوا مەشخەڵی ئاسمانی ئەم شەوە.

من کە چووم بە نیازم لەگەڵ خۆم لەسنگما
ڕۆژنامەی: ڕەشەبای خوێناویی دوو سەدەی
کێوانی بۆ بەرم.
یادداشتی: دووکەڵی زامانی دوو سەدەی
پێدەشت و بناری بۆ بەرم.
بەنیازم ئەلبوومی: ڕەنگینی ئازاروژان و سوێی
قرچان و سووتان و زریکەی
ئاو، گڵ، دار، بەرد، شار، گوند
ئاژەڵ و باڵدار و بێ باڵی
دوو سەدەی بۆ بەرم!
بەنیازم وەختێ چووم لەگەڵ خۆم لە چاوما
بەتایبەت
ئاسمانی خنکاوی "هەڵەبجە"ی بۆ بەرم.
بەڵێنە هەر ئەمشەو دوو قۆڵیی درەنگان
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
پێکبگەین.
یەکەم جار:
ئەستێرکی باوەشمان
پڕ ئەبێ لە خونچەی ماچی سوور
باڵایشمان ئەبێتە دوو ئاوان.

هەردووكمان وەك سەرمان

عەشق ئەنێین بە عەشقی یەكەوە
مێژوومان: داپیرەو
هۆنراوەیش ئەكەینە ئاگردان.

بەڵێنە هەر ئەمشەو درنگان دوو قۆڵیی
لە كەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان:
من و مەلا خدری ئەحمەدی شاوەیسیی مكایڵی پێكبگەین:
پێكبگەین وەكوو دوو پەپوولە
پایزەی گیرساوەی سەر دڕكێ!.
وەكوو دوو بریسكەی كشانی ئەستێرەی ناو خەونێ.
وەكوو دوو زەمانی ئاوێتەی یەك كۆچ و ڕەوەندێ.
وەكوو دوو قەسیدەی گریاوی یەك دیدە.
وەكوو دوو باڵندەی غەریبیی ئاسمانێ.
بەڵام من ئەزانم ئەو زێیەی
لەگیانی بێ ئۆقرەی شیعرمدا بۆی ئەبەم
هەناسەی سوورترە،
زریكەی بەخوڕتر،
فرمێسكی درێژترە،
لەشێوە سوورەكەی سنگی ئەو.
بەڵام من ئەزانم ئەو بێشەی ژوارەی



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

که ئەیدەم بە کۆڵی سەیوانما و بۆی ئەبەم
هەنسکی چڕتره
سێبەری وەیشوومەی کڕترو
قوڵپەکەی بەربینی درەختی پڕتره
لەسارای خاك و خۆڵ.
بەڵام بۆ شیعری جوان، زرنگەی پاوانە
قەسیدەی شۆخ و شەنگ
بۆ کانە پرشنگی هزری ورد، بارانی خەیاڵ و
بریقەی هەستی تەڕ
پێی ئەڵێم:
بێگومان.. سەروەرم!.. بێگومان
وشەی تۆ قوڵتره
حەرفی تۆ گەشتره
دەنگی تۆ پڕتره.. بێ دەعوام، پەتکیش نیم!.
پێی ئەڵێم:
گەورەی من!
پێم ناڵێی ئەو هەودای گزنگی چاوانەت
چۆن ئەکەیت بە دەرزیی حەرفەوە
بۆ ئەوەی خەم بدروویت
بەباڵای حەبیبە و عیشقەوە؟!
پێی ئەڵێم:
بەگەلا تەقەڵی پایزان

PDF 4 KURD

چۆن هەور دائەدرووی
بەشانی غوربەتدا و چۆن فرمێسك ئەڕوێنی و

هەواری بروسکەت چۆن خستە سەرتەوە؟!
پێم نالێی، سەروەرم!، ئەو سڕڕەم پێ نالێی
ئەسپی "با"ی زمانت چۆن ڕام کرد؟
لەکوێوە چوویتە ناو دڵۆپی باران و
چۆن توانیت بە تیشکا هەڵگەڕێی؟!
چۆن توانیت؟
سەرچنار، بەکرەجۆ، خاك و خۆڵ،
خانەقا، هەر هەمووی لە زامی هیجرانت
بارکەیت و ئەو زامەیش
بخەیتە خوێ ئاوی تانجەرۆی دڵتەوە؟
چۆن توانیت بە جومگە و بڕبڕەی شیعرێکی لانەواز
پردەکەی سەرشەقام دروست کەیت؟
چۆن توانیت دەروونت بەدەمی هیلالی لاوازت
هەڵکەنی و دارەکەی پیرمەسوور لە ناویابنێژیت؟!

پێی ئەڵێم: گەورەی من!
چۆن توانیت بە تاڵە زوڵفێکی حەبیبە
گردۆڵکەی ژانی خۆت لە قەدی شەوانی تەنیایی
شەتەك دەیت؟

PDF 4 KURD

چۆن توانیت بێ سەوڵی دوودەستی نیشتمان
بەگەمیەی نێو مەوجی گەرداوی غەریبیی
ئەمڕێگای نەهاتە وا تەی کەی؟!
پێی ئەڵێم: سەروەرم! من وەکوو بزانم
ئەو خاکەی کە ژانت تیا پشکووت
بەرکاوی تینویەتی عەشقێکی بە پیت بوو
من وەکوو بزانم
تۆ شەوت بۆ گریەی چاوانت قۆرغ کرد.
سوتایت و ئەوساکە کازیوەت
گوڵ شیعری خۆری گرت!

هەر ئەم شەو درەنگان دوو قۆڵیی
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
یەکتریی ئەبینین
جڤینی غەریبان ئەم شەوە
سووتانی غەریبان ئەم شەوە
ئەو وەختەی ئەگاتە بەردەمم
ئەو ئاوە و من داربی و کڕنووشی بۆ ئەبەم.
ئەیبینم: چڵێکی دارەکەی "پیرمەسوور"
گۆچانی دەسێتی.
ئەیبینم: ڕێئەکا و دوو سێ پۆل چۆلەکەی "کانی با"
بەدەوری دەغڵەکەی ئەو سەرورپیشەدا خول ئەخۆن.

PDF 4 KURD

ئەیبینم دووراو دوور ئەیبینم!
پەڵەیەك گوڵجاری گوندەكەی "ماڵیاوا"
سەرپێچی سەرێتی.
ئەیبینم: ئەڕوات و تانجەرۆ ئەم قاچی و
شیوەسوور قاچەكەی ترێتی.
شانومل دەوەنی لای "تەكیە"ن؟!
یان مۆم و ژێرپیاڵەی حوجرەكەی
مزگەوتی "سەی حەسەن"؟
ئەو پەنجەی دەستانە پەلكە گیای
لەرزیوی گوێ "زەڵم"ن؟!
یان هەنگی نێو شانەی قەسیدەن؟!
ئەوەندەم پێ ئەكرێ هەر كە هات
تریفەی بۆ بكەم بە فەرش و
لەبەر پێی سیروانیا ڕای بخەم.
ئەوەندەم پێ ئەكرێ
لە دوودی هەناسەی درەختی عەلەم دار
وەك لاكێش
پارچەیەك لە دووكەڵ ببڕم و ئەستێرەی
ئەم دڵەی پێوەكەم بۆ ئەوەی بۆی بكەم
بە ئاڵای پێشوازیی ورشەدار.
پێش ئەوەی ئەو بگات من دێنم
لە هیلال كەژاوەو لە گریان ئەسپێكی حیلەدار

PDF 4 KURD

زین ئەکەم، سووتانم سوار ئەکەم
تا بە غار خۆی بکات
بە گەلیی ئەو کۆچی بەفرەداو
دووراو دوور بڕوانم، پێش ئەوەی ئەو بگات
بزانم چۆن ئەبم بە هەڵم و
چۆن ئەبم بە قەترەی ئارەقی
سەرگۆنەی شیعرێکی دوور وڵات.
هەر کە هات پێی ئەڵێم: سەروەرم! بۆ پرسیت؟
"زارم وەکوو هیلال و نەحیفم وەکوو خەیاڵ
ئایا بەزاردا دێمەوە و بە دڵدا دەکەم عوبوور؟!"
پێی ئەڵێم:
قوربان خۆت دارشاتووی وشەیت و
خۆت باڵی دەنووکی گۆرانیی و
یەکەمین جۆلانەی "هیلال"ی هەڵبەستی
هەر خۆیشت شمشاڵی لالێوی کەژان و
هەر خۆیشت ئاوێنەی "با"ی سەوزی پێ دەشتی.
پێی ئەڵێم:
گەورەم تۆ!
لەدوای خۆت بۆ ئێمە
میراتی خەمێکت بەجێهێشت
بەردەوام بە هاژە و کەف چڕین وەك زەڵم و
کەڵەگەت وەك هێرۆی قژ سووری

**گوێ زامی تانجەرۆ!**

**بەڵێنە هەر ئەم شەو درەنگان لە کەنار**

**ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان دوو قۆڵیی**

**یەکتری ببینین!**

**هەر ئەم شەو، من، نالی، حەزرەتی غەریبان ئەبینم.**

**ئەو، شەوە لە گزنگ موتوربە کراوە ئەبینم.**

**ئەو، کێوە کۆچەرە ئەبینم.**

**ئەو، بەفرە فەرەنجی لەبەرە ئەبینم.**

**هاوینە و لەماڵی پایزدا جڤینی غەریبانە ئەم شەوە.**

**لە کوێوە داربەڕووی لانەواز**

**ڕەگ ئەدا بە کۆڵیا و ئەگاتە ئەم ناوە؟**

**لەکوێیە پرشنگی دەربەدەر؟**

**لەکوێیە ڕووباری ئاوارە؟**

**ئەستەمبووڵ، لانکەیە بۆ هەتاو؟**

**ئیستگەیە بۆ خەونی غەریبان؟**

**یان تۆڕە بۆ مانگ و چەقۆیە بۆ ملی ئەستێران؟**

**ئەستەمبووڵ دەروازەی بارانە؟**

**یان شاری کوللەیە و شمشێری دەس سوڵتان؟**

**ئەستەمبووڵ سروەیە؟! ئارامە؟! هەتوانە؟!**

**یان خوێیە بۆ زامی گەڕیدەی عاشقان؟!**

**لەوێوە نالیی دێ و شارەزوور لەگەڵ خۆی ئەهێنێ**

**لەوێوە قەقنەسی ئەو خەمە باڵ ئەگرێ و هەڵ ئەفڕێ و ئەسووتێ!**

PDF 4 KURD

ئای عەشقی داروبەرد، وای عەشقی خاك و خۆڵ!
ڕۆژنییە ئەو نەبێ بەمێرگی خەونێك و
وڵاتیش بە جوانووی غارکەری نواڵەی سەرسنگی!
ئای عەشقی ئاوو گڵ، وای عەشقی گژوگیا و لق و چڵ!
ڕۆژ نییە ئەو نەبێ بەکانیی یادێك و
وڵاتیش بە قاسپەی کازیوەی نێودەنگی.
ئای عەشقی مەڵکەندی، وای عەشقی کانێسکان
شەو نییە ئەو نەبێ بە چیغی سەربانێ و
شارەکەی بە "مانگ"ی وەریویی هاوینی خەیاڵی.

بەڵێنە هەر ئەم شەو درەنگان دوو قۆڵیی
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان یەکتری ببینین
تا ئەودێت، تا ئەگات
من ژاڵەی تەماشام لە سیلەی
هەر دێڕە شیعرێکی غەریبدا ئەنێژم.
هێڵ بە هێڵ
هەناوم بە قەڵەم ئەکێڵم
ئازارم چووز ئەکەم لە تیشك و
سەریشم پڕ ئەکەم لە باران.
تا ئەودێت، تا ئەگات
من چرای دیوارکۆی ملی خۆم
لە حوجرەی "تەکیە"دا هەڵ ئەکەم.

"زرێبار" ئەهێنمە ڕۆحمەوەو
بە ژێی ئاو کەناری تەنیاییم وەکوو تار لێئەدەم.
تا ئەو دێت، تا ئەگات
من ئەبم بە پەیکی شارەزا و بە —بادی خۆش مرور-
لەسووتووی هۆرەکەی هاواری شارەزوور
بە دیدەم مێژوویەك ئەشێلم، ئەیشێلم
تا ئەیکەم بە سەری بڕڕاوی "سالم"و
بۆی ئەبەم!.
بەڵێنە هەر ئەم شەو درەنگان
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
دوو قۆڵیی پێك بگەین:
ئەزانم هەر کە هات وەك ئەسپی بوولەرە[78]
ئاپوورەی پرسیاری چون پڕمەو سمكۆڵ و چەپۆكان ئەخرۆشێ.
چون ژانی خەزان و هەڵوەدای زریانی بێ داڵدە و بێ پەنا
هەناسەی ئەو سینە شەقارە لە مەنفام ئەوروژێ
ئەزانم هەر کە هات
ئەو ئەبێ بە حیلەی سۆراخ و
بڵێسەی ئەداتە چوار ناڵەو
تەپوتۆز لە دەشتی ئەم سیما خۆڵینەم هەڵئەسێ
ئەپرسێ و ئەپرسێ ئەپرسێ
ئەمجارە، ئەو، بەردی كۆڵانی یادێك و

[78] بوولەرە: بومەلەرزە.

ئەو داری نێو خەونی باخێکی وڵاتی گوڵ عومەر*
نامێنێ هەواڵی نەپرسێ
ئەمجارە ئەو باڵای قەسیدەی نیشانەی پرسیارەو
لەو پەڕی هەر بستە سۆزێکی هەواڵدا
چاو لە ڕێ دای ئەنێ!
ئەمجارە "سالم"ی ناو زوڵمەت
یەك گەمیەی چارۆگە سوتاوی شەونییە.
ئەمجارە "سالم"ی هاوڕێی جێنیشتەی دۆزەخ و
هۆنراوەی داپلۆخاو، زوخاڵە وشەی شار،
قەڵەمی باڵکراو، ڕێچکەن و کاروانی دووکەڵ و
سێبەری پەرت پەرتی وەیشوومەن.
ئەمجارە —نارەوەن- بە تەنیا
پەنجەرەی حوجرەکەی خانەقا بۆی ناگری
ئەمجارە هەر پردی سەرشەقام
بڕبڕەی پشتێکی شکاوی گۆرانیی شار نییە.
بە تەنیا "کانی با" ئاخێکی گرمۆڵەو
سەرچنار مراویی خنکاو و
بە تەنیا "حەبیبە"یش یار نییە.
کە گەیشت پێی ئەڵێم: سەروەرم!
سەرکردەی لەشکری خەم و داخ!
مەترسە لە دوای تۆیش سوپاکەی خەمانمان
بەهێزە و سەرکەوتوو،

PDF 4 KURD

لەدوای تۆیش نەشکاوین، بۆ بشکێین؟!
کەشادیی ئەوندە لاوازبێ و ترسنۆك
بۆ بشکێین؟!
کە خۆشیی هێندە زوو
لەبەردەم هێرشی کۆستماندا ببەزێ!.

★

من دەمێك بوو، وێنەکێشی خولیای سۆفیم، بەرامبەری ئەو ئاسۆیە
ڕاوەستابوو. من دەمێك بوو جووڵەی پەنجەم
بووبوون بە هێڵی بالآی ئەو. تروکەی چاو:
بە نوختەی سەر تەوێڵی ئەو، هەناسەکانم:
بۆشایی و ئازارەکانم ڕووناکیی و شەوقم سێبەر.
من ئیستاکە وشەم لەناو دەفری شیعرا ئەگرمەوە،
خەون و سروشت و ڕەنگ و دەنگ تێکەڵ ئەکەم.
وێنەی "نالیی" وا ئەکێشم:
سیمایەکی: بەزەرکەفتی ئەشکەنجەو داخ درەوشاوە
یان گردە تەمێکی تێکەڵ بە زەردەپەڕی ئێواران.
دوو چاوی ڕوون، لە بنیاندا چەوی خەیاڵ تروسکەی دێ.
دوو گۆی ورشەدارن لەناو دوو کالانەی قوڵ و ماتدا
بزاڤیان تیژ و بێ ئۆقرە..
بە سەریانەوە دوو برۆی تەنك، پەیوەست
بەردە نوێژی تەوێڵێکیان هەڵگرتووە
کە باران و گوڵ و شیعر

نوێژی لەسەر دائەبەستن.
دوو ڕوومەتی پڕ لە دێراو
بە "جووت"ی ساڵ ڕێ ڕێ بوون و
کەوتوونە بەرچڕیی سێبەر.
کەپوویەکی بەقۆرت تووڕە.
دەم و لێوێك وەك هەمیشە ئامادەبێ
ماچی خۆشەویستیی بکات.
ڕەنگی قژی تاریك و ڕوون.
دەست و پەنجەی بچووك بچووك منداڵانە.
دەنگی: هێور.. وەختێ ئەدوێ
دەستیش ئەبن بە جۆلانە و بەپاڵەکانی ئاخاوتن
دێن و ئەچن.
کە شیعر ئەخوێنێتەوە، لە گەڵیا ئەچەمێتەوە
وەکوو سوجدە بۆ زمانی کوردیی بەرێ وایە.
پاڵێك[79] و ڕیشی تێکەڵاو
سنووریان زەردیی دووکەڵە.
دەمارەکانی پشتی دەست
وەك جۆگەلەی باریك و شینی سەر نەخشەن.
لە زۆر کەس باڵای کورترە.
بەڵێنە هەر ئەم شەو دووقۆڵیی درەنگان
لە کەنار ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان

---

[79] پاڵێك: موی سمێڵ کە تێکەڵ بە ڕیش ئەبێ.

PDF 4 KURD

یەکتری ببینین:

هەر لە دوای گەیشتن..

ئەو ساتەی کە دەستم ئەخەمە ناو دەستی غوربەتی

دە شمشاڵ پەنجەمن و نامۆیی هەردووکمان ئەژەنن.

ئەو ساتەی هەواری ڕیشەکەی ماچ ئەکەم

دوو لێوم کەناری کانین و گوڵ ئەگرن.

ئەو ساتەی کە چاوم ئەبڕمە نێو چاوی هیجرەتی

فرمێسکم پەپوولەی سپین و لە زەردەی ڕوخساریا هەڵئەفڕن.

ئەو ساتەی کە پرژەو تنۆکی دووانی لێم ئەدا

قاقڕ و ڕووتەنیی بیستنم

بە ئاوی دەنگەکەی شین ئەبن.

ئەو ساتەی پێی ئەڵێم: سەروەرم!

لە ئاوی پرشنگتا غەرقم کە

بۆ ئەوەی لە قوڵیی سۆزتەوە

بگەمە ناخی خواو

ئەم تەمی گومانە لەسەرچاو لابەرم.

پێی ئەڵێم: سەروەرم!

تۆ نووری تەوێڵی وڵات بووی گەیشتی

ئەوەتا من لێرە چوار وەرزە تەنیایی

بەبێڵی تاریکیی ئەمکێڵێ

تەماشا! زەمانی وەڕس بوون خەریکە

بە دەنووک هەناوم کون بکاو ئارامم هەڵکۆڵێ.

PDF 4 KURD

سەروەرم! من ئیستا بۆ گیانم تیرێژێ
پەنجەرەی "ئەزمرڕ"م لێت ئەوێ.
مەهێڵە ئەم هەوای ناسۆرە
ڕەنگوبۆی هۆنراوەم بەرێت و
مەهێڵە لاوکم هەڵوەرێ!.
سەروەرم! من ئیستە لەم دوورە
کەوێکی کەسیرەم
بۆ چینەی گۆرانیم
بۆ باڵی دڵداریم.. سەروەرم!
من مشتێ لە خۆڵی سەیوان و
کاسەیەك بارانی سەر گۆیژەم لێت ئەوێ.

بەڵێنە هەر ئەم شەو درەنگان لە کەنار
ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
دوو قۆڵیی یەکتری ببینین
ئەزانم هەر کە هات.. پێم ئەڵێ:
-ئەستەمووڵ دەشتی خوێ و
برینم ڕێبواری پێپەتی سەر ئەوە
من گەلا ئاخێکی وەریوم
ڕەشەبای مەوسیمی فیراقیش هەر ئەمبا و
ئاشییان بە تەنها قەڵەمی بێ خەوە!
ڕەفیقان! بەڵام ئەز هەتاکوو

PDF 4 KURD

ئەم ئاشی غوربەت و حەسرەتە بمهاڕێ
خەیاڵی حوزوری لای ئێوەم وردترە.
ئەم بادەی بەهەشتی سوراحی گەردنەم
تا هیجرەت كۆنی كات
بۆ نەسلی قەسیدەی داهاتووم
نۆشینی خۆشترە.
عەزیزان! لەكوێبم
تانجەرۆ ئاوێنەی پێش بووكی بەیازمەو
چاوانی "حەبیبە"یش كەوسەرمە!
لێی ئەچمەوە پێشەوەو ئەپرسم:
-سەروەرم!
كەی شیعر بەسەرتا ئەبارێ و
ئازارت تەڕ ئەكات؟
ـ ئەو فەسڵەی كە عیشق ئەبێتە ئاسمانم
ئەو دەمەی كە سەرم
چەخماخە ئەدات و
ژان ئەبێ بە هەورم.
-سەروەرم! ئەی بادی خۆش مرور هاتەوە؟
تەتەری ئەو خۆزگە عەوداڵە چی ئەڵێ؟
ئەو پەیكە لەكوێیە؟
دیدەنی خاك و خۆڵ كەی ئەكەیت؟
-ئەویش وەك كۆترەكەم

وەك خەونی ژوورەکەم
وەك دەنگی "سالم"ی هاوڕێم
لەوێیە و عاسییە
تەتەری ڕۆحەکەم!
بەڵام من ئەمجارە لەسەر ئەو ناوەستم ئەچمەوە.
بەهارێ ئەچمەوە، کە سیروان وەکوو من
ئارامی هەڵئەستێ. مەوسیمێ کە خونچە
وەك پەنجەم، قەسیدەی پشکووتن
بۆ لێوی حەبیبە و شارەزوور ئەنووسێ.
ئەو دەمەی هەڵەبجەی کەژاوە
بەسواری ئەسپەکەی "مەولەوی"
سەوزتر دێتەوە ناومان و ئەو دەمەی
کە "گوڵان" لە ماچی هەتاودا غەرق ئەبێ.
سێ کوچکەی سەفەری بارانین سێ قۆڵێین
مەولانە و حاجی و من
بڕیارە ئەمجارە پێکەوە بگەینە ساراکەی وڵات و
پێکەوەیش لەسەر خەم دابکەین!.
ـ ئەی باشە سەروەرم! کەی هاتی؟ چۆن هاتی؟
"سالم"ت نەبینی
پێش ئەوەی کۆچ بکەیت؟!
ـ لەبیرمە ئەو سوبحی پایزەی کۆچم کرد
منیش وەك نارەوەن ئەوەریم.

PDF 4 KURD

بەیانییم غوروبی وەسڵم بوو

ئاگربووم لەسەرمای فیراقدا ئەلەرزیم

بەڕێوە کوڵوکۆم بردە لای

"سالم"ی نەسیمی شارەکەم

گریانم ماچی کرد، خەزانم باوەشی پێداکرد

لەبیرمە پێی وتم: ڕەفیقی ڕۆحەکەم!

وێڵاشی تەنیاییم

بەم وەرزی ناوەختەی چاوڕێزان بەرەو کوێ؟

بەرەو کوێ چاوەکەم؟،

ڕووی ژیلەی خۆم تێکرد:

"ئازیزی ئازیزان!

چارەنووس ڕێبواری ڕێی هات و نەهاتەو

نازانم هودهودی ئەم ڕۆحەم

بەرەو کوێ ئەفڕێت و کام کونجی غەریبی

ئەبێتە هێلانەم.

نازانم مەوجێکم سەری خۆم لە خۆڵدا هەڵ ئەگرم.

شیعرێکم تلاوتل ئەڕۆم و درەختم باڵ ئەگرم.

"سالم"ی هەناسەم! ئەرجوی من هێندەیە:

کە جارجار ئەستێرەی کشاوی یادی من

لە خەونی قەسیدەی جوانتانا ببینن"

ئەوەندە و ڕۆیشتم و لەولای "وەیس" بەولاوە

بۆ دواجار ئاوڕم لە چاوی جێماوم دایەوە

PDF 4 KURD

ئاورێ لەوساوە: شەوگاری هیجرەتم
گۆچانی تاریکیی دایە دەست غوربەتم.
"لێرەدا پێی ئەڵێم: گەورەی من!. ڕێم ئەدەی تامنیش
ئەو شیعرنامەیەی کە دابووم بە هەمان —باد-ی تۆ، بەهەمان
پەیکی تۆ!، تابیبات بۆ چەندان "سالم"ی شارەکەم
شارەکەت، نیشانی تۆیشی بەم؟ ڕێم ئەدەی.. گوێت لێبێ؟
بەڵام من سەروەرم! ئەزانم کە گوێی تۆ، چاوی تۆ،
نا ئاشنان بە زەنگ و بەوێنەی زایەڵە و تان و پۆی
ئەم جۆرە شیعرانە! وتت چی.. سەروەرم؟، دڵنیام ئەو ئەڵێ:
"ناسکبێ و خەیاڵی تیا بفڕێ.. حەزئەکەم گوێم لێبێ".

"سالم"ەکانی وڵاتی خەندەی گریاو!
ئەی کەشتیەکانی نێو تۆفان!
هاوڕێیان!
لە بەندەری تەمومژی ئەم کۆچەوە
کە شەوتانی بەئەستێرە و شیعر و زام و
چیرۆکەوە کردۆتە کۆڵ..
لەم بەندەری غوربەتەوە ئەتانبینم:
لە نێرینەی زەریایەکی ترسا
لەگەڵ نێرە نەهەنگێکی شێتا
کە مێژووی لیخن کردووە و
ئێسکی خۆرەتاو ئەکرۆژێ و
جوانیی ئەخوا..

ئەتانبینم: هێشتا لەسەر تەوقی سەری
وەکوو چاوتان، وشەتان پریشك ئەهاوێ و
دەنگتان گڤەی هەڵکردنی هەر پێماوە.
ئەتانبینم: چرای ستوونی قەڵەمتان وەك گەردنتان
گەش ئەسووتێ و
چارۆگەی هیوای سپیتان نەژاکاوە.
ئەی کەشتیەکانی نێو تۆفان!
لەم بەندەرە لمینەوە
کە ڕوناکیی ئازارتانی تنۆك تنۆك هەڵمژیوە
ئەتانبینین: حووتی تۆفان بەدەم باداوەی زەردەوە
ئەتانبات و ئەتانهێنێ و
وەك لاشیپانی کەشتیتان
دەرگای لەشتان شەقەشەقی پێ ئەکەوێ و
بەڵام لوتکەی بەجریوەی گیانی شینتان
وەك باڵاتان ڕێك وەستاوە.
ئەتانبینین: لەناو ئابلۆوقەی نێزەدا
سەرتان "دم دم"ی تازەیەو
خانی لەپ زێڕینی وشەیش
قوللەی خامەی ئەم زمانەی بەرنەداوە.
"سالم"ەکانی وڵاتی خەندەی گریاو!
ئەی کەشتیەکانی نێو تۆفان!
هاوڕێیان!



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

تا ئەم تۆفانی نەهەنگە
کرِنووشی نیشتنەوە ئەبا بۆ زەمین و
هەتا تاریکیی ئەوەڕێ.
هەتا کەشتیەکانتان ئەیکەن بە جەژنی ئاو
هەتا بەندەرمان ئەیکەن بە جەژنی کەشتیی
ئەبێ بانگی سەری ئێمە "نەء" و
سەوڵەکانی دەستی ئێوەیش "نەء" و "نەء"بێ
"سالم"ەکانی وڵاتی خەندەی گریاو!
هاوڕێیان!
ئالەم تاقە وشەیەدا
دوا ڕۆژ هەناسە ئەدات و
هەر لەم تاقە وشەیشدا
خەون هەڵدێ!.
بەڵێنە هەر ئەمشەو لەکەنار ئەو گۆمە
غەمگینەی تەنیشتمان دوو قۆڵیی
یەکتری ببینین:
وەك شادیی کات کەمە و وەك کسپەیش پرسیار زۆر.
من ئەبێ ئەو "پرس"ە گرنگەم بیرنەچێت!. هەر کەدیم
پێی بڵێم:
سەروەرم!
مەراقە.. لە دڵی زمانی کوردیدا.. مەراقە
لەبەرچی دارمێوی شیعری تۆ کۆچی کرد؟

PDF 4 KURD

بۆ ژانی بەیارت جێهێشتین؟!
بۆ بەسەر تینویەتی ڕووباری گیانمدا
هەتا سەر دات نەکرد؟

ـ کولله بوون تورکان و بەر خۆریان لێگرتم. هەتاوم نسێی کرد
مەلێ بووم بێ تیشکی ئەو عەشقە ئەمردم. مەهێ بوو وڵاتی
بابانم. لەشەوی دەیجوری تورکاندا کەگیرا
کوشتیان و، ئەیانویست بەخوێنی ئەو مانگە ئەز بیشۆم
چاوانم. چی بڵێم؟ نەشم ویست لەنێوان، پاشاکان،
برالەی دوژمندا، بۆ عەجەم یان تورکان. من شێربم
یان قەڵغان!.

ـ سەروەرم! دۆزەخی ئەستەمووڵ
هیچ لالە شیعرێکی تیا نەڕوا؟!
دەریاچەی ئەو خەونە هیچ گەرا ئەستێرەی جێنەهێشت؟
قەتارەی ئەو هەوری وشانە نەخرۆشان؟
گزنگیان دانەڕشت؟
بۆ جارێك، هەر جارێك، لەو ئاسکی شیعرانە
یەکێکیان ئەگەیشتنە لای ئێمە؟!

ـ ئاخر چۆن بسووتێم.. ڕۆشن نیم؟
ئاخر چۆن هەڵوەرێم.. پایزی شیعرنیم؟
ئاخر چۆن شارەزوور.. هەورم بێت

PDF 4 KURD

سێڵاوی وشەنیم؟
ئاخر چۆن "حەبیبە" ئاسکم بێت
من دەشتی پاراوی خەیاڵ و بەستەنیم؟
کەم بووە شەوانە خەم نەزێ و
ئەستێرەی شیعرێکی لێ نەبێ!.
کەم بووە ڕۆژانە من نەبم بە هەڵم و
دانەکەم بۆ شەوێ!
زیاتر لێی ئەچمە پێشەوە. بۆ مژینی خەمی سپی
خۆشەویستیم ئەبێ بە هەنگ، ڕیشی بە باخ.
زیاتر لێی ئەچمە پێشەوە، هێواش هێواش،
هەردوو کۆترە ساردەکانی دەستی ئەگرم،
هەر بەدەم گمەی شیعرەوە ئەیانخەمە
ناو سنگمەوە. بە گریان دایان ئەپۆشم.
هەوڵیش ئەدەم زەینی خۆم بکەم بە ماسیی،
بۆ ئەو بەحرەی لەبەردەمما دانیشتووە.
هەوڵیش ئەدەم تەماشام بکەم بە بەران
بۆ ئەو کێوەی بەرامبەرم ڕاوەستاوە.
دواتر ئەدوێم. ئەبم بە چیمەنی قسە،
بە چوار دەورا ئەتەنمەوە. ئەوسا ئیتر
بەدرێژیی باسی شارو هەناسەکانی بۆ ئەکەم.
باسی سووڕانەوەی مێژووی خوێنی بە دەوری
کوردا بۆ ئەکەم. حیکایەتی بێ کۆتایی

PDF 4 KURD

"ڕیس و خوری"ی تفەنگەکانی بۆ ئەکەم.
باسی "تاقمی مومتاز"ی قوربانیەکانی بۆ ئەکەم.
شەڕی نێوان سەری خۆم و دەستی خۆمی
بۆ باس ئەکەم. ڕووناکیی بۆ ئەگێڕمەوە.
تاریکیی بۆ ئەگێڕمەوە.
ئینجا تۆزێ ئەچمە دواوە. ئەو ماچانە و
دیوانە تازەکەی خۆی و ئەو کوڵەباڵەی
بە دیاری "مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس"[80]
بۆی ناردبوو، ئەیان پێچم لە ڕێحانەی
"بیار"ەوە و لەسەر ڕانی بۆی دائەنێم.
ماچەکان ئەخاتە سەرچاو. پڕ بە گیانی
ئاوارەیی بۆنی ڕێحانەکان ئەکات. هەر لەوێدا
کوڵە باڵیش لەبەرئەکات. دیوانەکە ئەکاتەوە
دەستێك بە ڕیشیا ئەهێنێ. ڕووم تێئەکات و
پێم ئەڵێ "ئەم پیرەیشمان چیایەکە وەك
"شنروێ".. واصلیکە عەبیری سەلامم
بەو و پێشی بڵێ لە دڵمایە وەك تانجەرۆ"
لەپاش تۆزێ هەڵئەسین و ئەیبەم، ئەچین،
بەگوڵزارەکەی "مەسعود"[81]دا سوڕێك ئەخۆین.
چاوم لێیە لە هەندێ شوێن دائەنەوێ و

---

[80] مەلا عەبدولکەریم: "مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیسی بیارەیی" زانای ئاینیی و نووسەری ناودار.
[81] مەسعود: "مەسعود محەمەد جەلی زادە" ڕووناکبیر و نووسەر و توێژەرەوەی ناسراو.

بۆنی گوڵەکانی ئەکات. ڕائەمێنێ، لە سەرتڵی[82]
قسەکانی، شاگوڵێکیان ئەکاتەوەو ئەیخاتە بەر
پشتێنەکەی، ئاوڕم لێئەداتەوە، پێئەکەنێت و
پێم ئەڵێ "ئەم باخەوانە تێم ئەگات!."
"شیعرێکی بڵاونەکراوەی نالیی کە پار زستانێ هەورێکی
شیعر دۆستی قایمکار لە ئەستەمووڵەوە بۆی هێنابووم":
"کرمی ئاوریشمە خەیاڵم، بۆ سەرووی ئەو قامەتەت
من کە قۆزاخەی خەمێکم، دەوری داوم چاوەکەت
ئیشتیاقم: بەحری تینوو، هیجرەتم: سەحرا بە کۆڵ
ڕۆحی نالیی هەنگی عیشقەو، شانەکەیشی ناوەکەت!."
بەڵێنە هەر ئەمشەو لەکەنار
ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
دوو قۆڵیی یەکتری ببینین:
من: نالیی، حەزرەتی غەریبان ئەبینم
ئەو شەوە لە گزنگ موتوربە کراوە ئەبینم
ئەو کێوە کۆچەرە ئەبینم.
ئەو کە هات وەك ئاوو، کە گەیشت وەك تیشك و
کە هەڵنیشت وەکوو باز
من وەکوو خەیاڵی شارەزوور لێی ئەچمە پێشەوە.
هەر خێرا، هەواڵی گرنگی چەند سەرووی دەربەدەر..
هەواڵی گۆرانیی وەکوو خۆی ترافیە.[84]

---

[82] سەرتڵ: هەڵبژێردراو لە هەرە باش.



PDF 4 KURD

**هەواڵی بەفری شێت لە دووریی هەڵەکۆك.**
**هەواڵی چەند زاری هیلالی وەکوو خۆی ئەدەمێ و**
**پێی ئەڵێم:**
**ـ سەروەرم! بەرلەوەی تۆ بگەیت، لەوێ بووم،**
**لە "جونێف". ڕۆژێکیان لە جادەی ژمارە 1898.**
**لە کۆشکی نسرم و شێداری مێژودا، پلیکەی پێشینی**
**تەختەبەند. پلیکەی ڕۆژگاری پێچاوپێچ. بە کونی**
**هەتاودا، بردمیە ژێر خانێ، لەوێدا چاوم کەوت،**
**بەیەکەم ڕەوڕەوەی زمان و بەیەکەم قوتیلکەی**
**ناو ژووری شەوەزەنگ. لەوێ بوو، هەر خۆی بوو.**
**"جەلادەت بەدرخان" —بەر لەمن ئەتناسێ و باوەشێ**
**ماچیشی بۆ ناردووی..**
**من کە دیم شاخێ بوو ئارەقی سەردێڕ و ستوونی**
**ئەڕشت و منارەی وشەبوو، ئەسووتاو بەپێوە**
**وەستابوو، من کە دیم هەورێکی ڕیشدار بوو**
**بە تەنها ئەیگرمان.**
**من وتم:**
**ـ سڵاو ئەی**
**ڕۆژنامەی باپیرە گەورەمان**
**لەگەڵ چی خەریکی؟!**
**ئەو وتی:**

---

(84) **ترافیە: ئاوارە، دەربەدەربوو.**

PDF 4 KURD

ـ خەریکم بە وشە
دیواری تاریکیی کون ئەکەم
ئەگەڕێم بۆ هەتاو.
ـ بەکونی هەتاودا من هاتم. وام پێوت.
ئەو وتی:
ـ باش هاتووی!
تۆ شیعری کام شاری؟!
من وتم:
ـ هی نالیی!
ئەو وتی:
ـ ئاخ! نالیی
دوو زام و دوو کسپەو
دوو ئاخی چەند لەیەك نزیکین
هەر ئەڵێی جمکی ئەم غوربەتەین
ئەی هیچت لەگەڵ خۆت هێناوە
بۆ شەوی غەریبیم؟!
من پێم وت:
ـ مۆمێکی ئەشکەوتی باڵەکیان..
یەکەمین ڕۆژنامەی بارانی ئەیلولم هێناوە
من "دەنگی پێشمەرگە"م
لەگەڵ خۆم هێناوە..
ئەو وتی:

PDF 4 KURD

ـ ڕۆژنامە! پەنجەرەی دەنگمانە
ئەو وەختەی کە بەسەر دنیادا ئەڕوانێ.
ئەوەتا من لێرە یەکەمین پەنجەرەم کردەوە.
تیلچافە[85] ڕێوبانی هەنگاومان.
سەیرکە! چواردەورم بەناسۆر گیراوە
هەر حەرفە و هاوارم لێئەکاو
نامۆییش دڕك و داڵ!.
خۆش هاتیی!
دیارییەکەت ئەوەمەو
خۆزگەم بوو بیبینم.
ئەزانم کە نالیی ئەو کاتە، کەژێکە لە بنار تا لووتکەی
هەر گوێیەو هەر چاوە. ئەزانم ئەیەوێ بزانێ، ئەستێرەی
فرزەندی لانەواز لە کوێن و جریوەی غوربەتیان لەکام لا
ڕژاوە. بۆیە من هەر ئەدوێم:
ـ سەروەرم! هەروەها لەولایش بووم. لە پاریس،
پاریسی بە شیعر پاراو و بە هزر چراخان. شەوێکی
تەمومژ. بەدەوری مێژوودا باپووسکەی[86] پرسیار بووم
هەر خۆڵم ئەخوارد و وێڵبوونم ئەیپرسی:
-شەریف پاشا سەعید خەندان
شەقامی میسین ژمارە 20؟

[85] تیلچاف: شەوەزەنگ ئەمووستەچاو.
[86] باپووسکە: کرێوەی بەفر بە باوە.

PDF 4 KURD

"ئەمیشیان بەر لە من ئەتناسی و بەمندا دوا دەقی

یادداشتی هاواری زامی خۆی بۆ ناردووی"

سەرەتا ئەچوومە بەردەمی هەرکەسێ، سەرێکی بائەدا:

"ببوورە ناوی وانایەتە خەیاڵم.."

یان ئەیوت: "پێم وابێ شەقامی "میسین"یش بەرجادە کەوتبێ

نەمابێ.. نازانم.."

ئەمپرسی و ئەمپرسی و ئەڕۆیشتم

باگژەی سۆراخ بووم.

خۆم لەگەڵ خۆم ئەدوام:

"من ئەبێ لووتکەکان وێڵ نەکەم

بۆ ئەوەی بچمەوە سەرچاوەی بەرزایی

من ئەبێ شوورەکان وێڵ نەکەم

بۆ ئەوەی بگەمە سەرەتاو کۆتایی"

تا دوایی شەقامێ بردمیە بەر کووشکی کتێب و ڕۆژنامە فرۆشێ.

کووشکەکە بێهودە ئەیڕوانیە دەوروبەر وەك "ڕامبۆ"!.

کووشکەکە لە ماڵی نەهێنیی گوێ چەمی "مانگ" ئەچوو.

خاوەنی کووشکەکە.. درێژ و ڕەقەڵە

هەر ئەتووت خاوەنی "شەبەنگە بەڕۆژە"[87]

ئەدرەسم دایە دەست. چاویلکەی هێنایە سەر لووتی.

دوای کەمێ بە پەنجە ئاماژەی بەرەولای گردێکی ڕوتەڵە بۆ کردم.

---

[87] خاوەنی شەبەنگە بەڕۆژ: مەبەست لە نووسەری ناسراو و خوالێخۆشبوو (شاکیر فەتاح)ە کە بە دەستی ڕژێمی عێراق شەهیدکرا.

PDF 4 KURD

پێی وتم:
ـ ژەنەراڵ؟! ئەیناسم
هەموو ڕۆژ ڕۆژنامەم لا ئەکرێ
هەر لە دوای کۆنگرەی ئاشتی بوو
لە خانووی شەقامی "میسین"یش دەریانکرد!
لەوساوە کۆترێکی برسییە
لەوساوە، "پاریس"یش هێلانەی ولاَتی لەبیرکرد!
داخەکەم! ژەنەراڵ خەونەکەی وەکوو خۆی
ئیستاکە لە ژووری خزاوە تەنگ و تار.
داخەکەم! ولاَتی ژەنەراڵ
ئەسپێکی بێ کەسە
لەدنیای ئەمڕۆدا
کێ حیلەی ئەبیسێ؟!
هەر ڕۆیشتم. هەتاکوو سۆراخی مەراقم گەیاندە ژوورەکەی.
ژووری بوو بەقەم[88] بوو ڕەنگ و ڕووی. بۆبرش[89] بوو هەناسەی.
غەمگین بوو، لە دیدەی تۆ ئەچوو، سەروەرم!. من کە دیم،
قەڵەمی کۆماوەی ڕیش سپی. پڵنگی پەککەوتە. خەریك بوو
بۆ جاری سەدەمین، یادداشتی بۆ دنیای کەڕو کوێر ئەنووسی
ژوورەکەی سیخناخ بوو لە چاوی ئەبڵەق بووی یادداشت و
لەڕیزە تابووتی دۆسییەی بەڵێنی دەوڵەتان. پڕبووپڕ،

---

[88] بەقەم: ڕەنگێ زوو کاڵ بێتەوە.
[89] بۆبرش: بۆنی شت کە لە جێی تەڕ دانراوە و شێی هەڵهێناوە.

PDF 4 KURD

له چڕە دووکەڵی دێهات و قریشکەی سێدارەی شەقامی نێو شاران
زەمانێ من لەلای دانیشتم. درەنگان شریتیی ڤیدیۆکەی
هەڵەبجەم دایە دەست. کەلێیدا. شاخی پیر،
زۆر گریا و ئەسرینی یادداشتی داباری.
کە هەڵسام پێی وتم:
ـ ئەم شەوی دۆزەخە
مەگەر هەر یەکێکی وەك نالیی
بیکاتە ڕەشماڵی شیعرێکی زۆر گەورە.
بەردەوام من زەمان ئەئاژوێم
ئەدوێم و
نالیش هەر گوێ ئەگرێ لە هۆرەم
هەتاکوو پێی ئەڵێم:
ـ وائیستەیش سەروەرم!
یەکەمین ڕۆژنامەی هەناسەی بەدرخان
یەکەمین یادداشتی فرمێسکی خەندان و
یەکەمین ڕۆژنامەی چریکەی ئەیلولم
پێچاوە لەسەری بڕاوی "مارت"ەوەو
لەگەڵ خۆم هێناومن
پێی ئەڵێم:
ـ دە فەرموو لێم بگرە سەروەرم!
بۆ ئەوەی لەیەکتر دانەبڕێین!.
بەڵێنە هەر ئەم شەو لەکەنار

ئەو گۆمە غەمگینەی تەنیشتمان
دوو قۆڵیی یەکتری ببینین
ئەم شەو خەوێکم دێتە دی و ئەبم بە شیعرێکی باڵدار.
لە خۆشیاندا باڵ وەرئەدەم لە ئاواز و
دەنووك ئەگرم لە تریفەو
شەپۆل ئەکەم بە هێلانەی تازە هەوار.
ئەمشەو خەوێکم دێتە دی و لە خۆشیاندا
نیگام ئەبن بە کارێز و قژم بە گیا و
پەنجەکانم بە گەڵای دار.
ئەمشەو خەوێکم دێتە دی و نیشتمانم
لەناو دیدە و لەناو دەنگ و لەناو ڕیشی
نالیی دا دێ و ئەگاتە لام.
سنگم ئەبێ بە "خاك و خۆڵ"
سەرم بەچوخمی "سەرشەقام"
ئەم شەو خەمێکم بەختیار.
مەراقێکم هێور، ئارام
ئەمشەو منداڵییم ئەبارێ
بەسەر یادی سەوزو سووردا و ئەبمە دەربەندی پەپوولەو
دایکم ئەبێ
بەمامزێ سپی سپی و حیکایەتی "گردی ڕەش"یش
بەگرمەگرمی گەواڵەی هەوری سەرشار.
ئەمشەو خەمێکم بەختیار.

PDF 4 KURD

**مەراقێکم پەل و پۆدار.**
**لەسووتاندا هەڵئەقوڵێم و**
**لەگریاندا سەوزم ئەکا "هەڵەبجە"ی یار.**
**ئەمشەو خەوێکم دێتە دی و ئەبم بە ئەسپێکی باڵدار**
**ئەمجارەیان من ناچمەوە لای نامۆیی و**
**شەو درەنگان هەر لە کەنار ئەو گۆمەوە**
**جلەو بۆ "با" شل ئەکەم و**
**لەگەڵ نالیی ئەڕۆمەوە بۆلای "گۆیژە"و**
**پێکیشەوە ئەچینەوە لای "سالم"و**
**"حەبیبە"ی شار!**

ستۆکهۆڵم.
مایسی/ 1990– کانوونی دووەمی/ 1991.

بەم بوولێڵە تەنیا ئەڕوا و ڕووی کردۆتە دامێنی شار

ئێستە ئاسمان مشکیی ڕەنگە و ئەویش خەمێکی مێیینەی

قەترانیی وەك کراسەکەی



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

ئاڵۆز وەكوو كەزیەكانی
سیسیش وەكوو هەردوو گۆنای
سارديش وەكوو دەستەكانی
تارماییەكی مێیینەی لەمەراقدا نوقم بووە
پەناو پاسێری گرتووە
شەپۆلێكی لەسەرخۆیە و هەنگاو ئەنێ
ئەستێرەیەكی نەخۆشە و
فرمێسكێكی شۆخ و شەنگە و
بەم بوولێڵە تەنیا ئەڕوا و ڕووی كردۆتە باشووری شار
ئەو زامێكی قژ درێژە،چاوەكانی بڕیوەتە ئەشكەنجەی خۆی
چاوەكانی بڕیوەتە، مانگی خوێنی ئاوانەبووی ناو خەیاڵی
(سەری،مێردە كوژراوەكەی، ئەوێنی خۆی )
لەچراخانی ئازادی..دابڕاوە
لە دارستانی تریقە و پێكەنینی
دەوروبەری دابڕاوە
بێ ئاگایە...لەهاواری ئاپوورەی خەڵك
بێ ئاگایە..لەزەماوەندی ڕووناكیی
لەشایی گوڵ
لە لەنجە و لاری گۆرانی
لەسەمای ئالأی سەوز و زەرد
تەنیا ئەڕواو لەگەڵ ڕابردوودا ئەدوێ، لەگەڵ خۆیدا
لەگەڵ بازێكی شەهیدا لەگەڵ (ئەو) دا..

بەم بوولێڵە تەنیا ئەڕوا و ڕووی کردۆتە دامێنی شار
" هەبوو..نەبوو، ڕۆژانێ بوو
بازەکەی من بەناو بڵێسەدا ئەفڕی
لەبەر گۆپاڵەباران و تەرزەی شووم و چەخماخەدا شەقژنی بوو
وەك فریشتە باڵدارەکان...
بەدارستانی نێزەدا تێ ئەپەڕی
ڕۆژگارێ بوو، بازەکەی من، لەو بەرزەوە
ئائەم شارەی لەژێر باڵەکانیا ئەدی
یەك بەیەکی ئەم هەردانە، ئەم لووتکانە
جێ ڕەوگەبوون، بۆ ئەسپە شێکەی هەڵمەتی
لەدۆزەخی کلاوسوور و کلاوڕەشدا
یەك بەیەکی ئەم کۆلان و شەقامانە:
( ئا ئەو سووچە،ئەو سیلەیە، ئەو بن دارە
ئەو ژێر چەترە، ئەو پەناپایەی بازاڕە )
جێ نزرگەی ترسناکی کوت و پڕ بوون
بۆ بازرەقەی خوێنی تووڕە و بۆ هێرشی
کێلان و کیفی ئامادە و کراوە بوون
بۆ دەرهێنانی دەمانچە و...ڕیزی گوللە و
تەقینەوەی نارنجۆکی خێرای دەسی
وەك کزەبایش، لەناکاودا، ئەهاتەوە بۆ ماڵەوە
بەبێ خشپە، تریفە بوو دەر ئەکەوت و
یان خەوێکی ئێجگار خۆش بوو، لە پرێکدا، پەیدا ئەبوو

PDF 4 KURD

منیش وەك ئاسكی خەواڵوو ڕائەپەڕیم
هەموو لەشم ئەنیشتە سەر ئاوی ترس و
هەموو جەستەم ئەبوو بە چاو
بەهێواشی لەکەمەرەوە ئەیگرتم
( چەکیش هێشتا بەشانەوە )
باوەشێکی پڕاوپڕی گەرم و تینووی پیا ئەکردم
گەرمییانی ئارەزوومان
وەك بەردی بەر سوورەهەتاو تاوی ئەسەند
ئەوسا ئیتر چۆن لاو لاوی
سەر پەنجەرەی ژوورەکەمان
تەواو پێمەوە ئەنووسا...تەواو...تەواو
مەمکەکانم لەناو چنگیا،سپی،سپی
وەك دوو تیترواسکی بچووك
شەوقی حەزیان،لەسەر گۆوە،دائەگیرسا
وەك چاوەڕوانی تووڵانیی ساڵەوەختیش
وەك خەمی قووڵی هەردووکمان، ماچێکی قووڵ
بینێکی قووڵ، لەدەمەوە، مژینەکە ئەکەوتەڕێ و
بەناو لەشا، تەزووی درێژەی ئەکێشا
لەکەپرۆکەی ناو ڕیشیشیا
بۆنی کەوێڵ، بۆنی ئەشکەوت، بۆنی باررووت
بۆنی کووزەڵەی گوێ چەم و مۆردم ئەکرد
بۆنی گوڵە ئازادەکان

بۆنی مەقەڕێکی شێدار
بۆنی نایلۆن، بۆنی بەتانییە سەوزەکان
لەناو توکی سەر سنگیشیا
بۆنی تیژی ئازایەتی و
بۆنی ناو سەنگەرم ئەکرد
لەچاویشیا هەموو ڕێگا دوورەکانم ئەدی
تەمی نزمی گەوەکان و ڕاکردنی گوڵ ئەستێرە و تروسکایی
ئاگری شوانی سەر ڕەوەز و بریسکەی جۆگەی
بەرکاوی ئێواران و هەڵبەزینەوەی قەڵبەزە و
ماچی ئاڵێنێوان ئاسۆ و خۆرنشین و...هەر لەچاویا
ڕەنگی پەڕیوی ژنانی ناو ئۆردوگام ئەبینیەوە،
ڕیزە پیاو و ڕیزە زیل و ڕیزە چادر
سەروو سیمای دوا شەهیدمان
دار تەلی سەر ئیزگەکەمان
لەچاوانیا چارەنووسێکی پایزە وەکوو گەلاَ لەرەی ئەهات
لە چاوانیا مەرگی شیعرێکی نازدارم ئەخوێندەوە
خەمی باڵگرتووم ئەبینی
خوێنی ئەستێرەم ئەبینی
لەچاوانیا خۆرنشینی خۆم ئەبینی...خەوم ئەدی:
لەناو گەمیەی هەورێکدام و هەر چواردەورم هەمووی گڕە
خۆم ئەبینی پەڕەسێلکەم تەنیا تەنیا ماومەتەوە...
هەموو جارێ لەچاوانیا



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

چارەنووسێکم ئەبینی و لێی ئەترسام
لەناوەڕاستی هۆدەدا بەچوارمشقی دائەنیشتین
هەر چوار ئەژنۆمان ئەنووسان بەیەکەوە
له دوو گوڵدانی پڕ لەگوڵ،پڕ لەخەم و پڕ لەخەون و
پڕ له ئازاری سوور ئەچووین
قسەی ئەکرد:
ـ تۆو کانی...تۆو درەخت...
تۆو بەردم،بەقەد یەك خۆش ئەوێ!
ئەمپرسی:
ـ کاممان، تۆزقاڵێ لەکاممان زیاتر...گیانە؟!
ڕائەما،ئەیڕوانییە دارەڕای ژوورەکە
لەو ساتەدا دەم و چاوی
لەکوختێکی ناو تەم ئەچوو...
ـ زیز مەبە! بەرد زیاتر...ئاو زیاتر...دار زیاتر!
ئۆە!گیانە...کە بەردمان لەدەست چوو...ئێمە چین؟!
کەئاومان فەوتی کرد...ئێمە چین؟!
ئەوێنی بێ بەرد و بێ ئاوو بێ درەخت کوا هەیە!
یەك چرکە ئازادیی و دوای ئەوە بابمرم!
لێڵ مەبە!...ئەوێنی من و تۆیش
لەڕوونیی ئاودایە!
له خوڕە و لەهاژەی سەربەستی ئاودایە
تەماشا!دیلێتی ناهێڵێ

**تێر سەیری یەك بكەین!**

**ژێر دەستی ناهێڵێ...لەماڵی خۆیشماندا**

**بۆ تاوێك بسرەوین!**

**ئازادیی ئاسمانە...بارانە و هەتاوە**

**بێ ئاسمان...كام خۆر و كام تیشك و كام باران؟**

**ئازادی خاكیشە**

**ئازادی خەڵكیشە... مێژوویشە**

**كە نەبوو چی هەیە؟! ئەمە نانە؟!**

**یان ژەهر؟**

**(بازەكەی من شاعیریش بوو...**

**هەموو جارێ دوا شیعری خۆی**

**لەگەڵ دوا دووكەڵی مەزرا و**

**لەگەڵ دوا زریكەی بەرد و**

**لەگەڵ دوا گریانی باخدا بۆ ئەهێنام)**

**بازەكەی من ئەو شیعرانەی كە ئەینووسێ**

**قووڵ بوون...وەكو دەریاچەكان**

**سادەیش بوون وەك گوڵە كێوی**

**بازەكەی من لە نوێخوازانی ژیان بوو**

**ئەو نەئەچوە بەر ئاوێنە كۆنەكانی زمان**

**لای ئەو وشە زیندەوەر بوو**

**لای ئەو ڕستە مەوجدانەوەی مەراق و**

**زەنگی مێشك و وەكوو گڕكان**

PDF 4 KURD

ساته وەختێکی خەتەر بوو

(نموونەیەکی بچووك لەشیعرەکانی بازەکەی من)

سەری من بەم ئاسمانە نەوییە بەم ئاسمانە زەلیلە

ڕازی نابێ

سەری من تۆپی ئاگر و گلۆڵەخەمێکی یاخییە

یان نارنجۆکێکی ناودەستەکانی ئازادیی

ئەبێ ئەم مێژووە تاریکانە...ئەم بەهەشتە ڕەشانە

لەخوێنەوە ڕووناکییان بۆ بەرین

بەڵام ئەشبێ بەمردنێکی درێژدا تێ پەڕین

ئینجا بگەیتە......

( بازەکەی من ئەم شیعرەی

بەناتەواوی بۆ بەجێ هێشتووم )

بازەکەی من،وەك کزەبا چۆن لەناکاو پەیدا ئەبوو

هەروایش لەپڕ:بەبێ خشپە،وەك کشانەوەی تریفە...

وەك گەڕانەوەی تارمایی و سێبەر و خەو، دیار نەئەما

لەپڕێکدا ئاوا ئەبوو. ئەچۆوە ناو ڕۆحی چیا

ئەبۆوە بە: گوڵی چوالە. بەدار هەنار. ئەبوو بە

زنەو بەڕەگ و بەسروودی دەم دار بەڕوو

ئەچۆوە ناو تەمتوومانی ئەودیو کەژە بێ دەنگەکان

ئەچۆوە ناو جریوەی دوور، ئەچۆوە ناو خەونی

گوند و لەخۆڵەمێشدا ون ئەبوو

ون ئەبۆوە...ئەهاتەوە. ون ئەبۆوە

بازەکەی من بوومەلەرزەی، لەبن دەستی
دێوی سپی و دێوی ڕەشی ئەم شارەدا
ئەچاند ئینجا ون ئەبۆوە
لەسەفەری گردی ڕەشدا هەموو جارێ
کەمەندی ئەو بێچووە درنجێکی ئەگرت
هەمو جارێ لەچەقی ئەم جادانەدا
بۆ دالێکی ئەم مەڵبەندە...
بۆ ئەرژەنێ
بۆ عەزیایەك
دۆزەخێکی نوێی دائەخست
بازەکەی من لە دوا ئێوارەی فڕیندا
لەدوا ساتە وەختی نێوان گەشانەوە و هەڵوەریندا
وەختێ لەگەڵ ڕەوتی خێرای
جوانووە ژانێکی سپیدا لە شاخەوە
بەرەو بنار دا ئەگەڕا و
شۆڕ ئەبۆوە بەرەو ناو شار
ئەو چرکانەی:
تراویلکەی لەرزیوی پێش هەردووچاوی
سیمای ئاونگاویی منی
دوور و نزیك نیشان ئەدا
مردن لە شێوەی داوێکدا
ئەگاتە بەر هەردوو قاچی و



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

دێتەوە یەك!

باز ئەگیرێ و

باڵەکانی شەتەك ئەدرێ و

ئەخرێتە ناو زیندانێکی گەڕۆکەوە و

دوور دوور ئەبرێ

(بازەکەی من. پەلەت چی بوو)

بەو ئێوارە درەنگ وەختە

بەو ئێوارە بەژن ڕەشە

بەو ئێوارە نەفرەتییە

بۆ کوێ ئەچوی؟

ئەتویست چریکە و شەقژنت بەریتە کوێ؟!

ئەتویست لەکام هەوار لادەی؟!

پەلەت چی بوو؟!

هەور لەسەرت ئەوەستا!

ڕووبار لەسەرت ئەوەستا!

زریان لە سەرت ئەوەستا

منیش لە سەرت ئەوەستام

پەلەت چی بوو؟!

وتیان: گێژەڵووکەیەکی سپی غەمگین

ئەو یەکەم جار

هەواڵی تۆی گەیاندبووە ماڵی چیا نشینەکان

هەواڵی تۆی بردبۆوە بۆ لای بەفر و

PDF 4 KURD

بۆ لای مێرگ و

بۆ لای گوڵەکێویلەکان

هەواڵی تۆی بردبۆوە

بۆ لای کۆترەکانی مەقەڕ

بۆ لای ژنە ماست فرۆش و

هۆبەی تازە هەڵدراوی ڕەوەندەکان

وتیان: تێکڕا بەیەکەوە

لەگەڵ چنار و شۆڕەبی و

پیاوانی بەردەرکی مزگەوت

ژنانی سەرکوڵ و کانی

هەموو پێکەوە گریابوون

هۆ بازەکەم پەلەت چی بوو؟

مەرگ هەر ئەهات

ئەم سەفەرەت هەر لەبەر بوو

بەلاّم هێشتا ئەی بازی من

بۆ تۆ بەرەبەیانێکی زوو بوو

شیعرەکانت: هێشوی وشەزیویینەکان

خەتی وەك زەنگیانە وردت

شێوەی ئیمزات " کە لەسەری بولبول ئەچێ "

دار جگەرەیەك..چەرخەکەت..

چاکەتێکی کۆنی سەر قۆڵ پینەکراو..

چاویلکەیەکی هەتاوو

PDF 4 KURD

تەزبیحێکی ئەبڵەق،کلاّوێ، پاندانێ
قەفەزێکی کەو. لفکەیەك
شوشەیەك عەتری بەتاڵ و
هەگبەیەك و
ئاوێنەیەك
ئەی بازەکەم!
ئەمانە ئەو یادگارو شوێنەوار و میراتیانەن
بۆت جێ هێشتووم.
ئەم شتانە..گیانیان تیایە
ئەم شتانە..قسە ئەکەن ڕازەکانیان ئەدرکێنن
ئەم شتانە..ئەجولێن و دێنە لام و
لەباخەڵما ئەیاننوێنم.
هەموو ڕۆژێ دەستیان بەسەردا ئەهێنم
بۆنیان ئەکەم، بۆنی شووشە بەتاڵەکە
بۆنی هەگبەو بۆنی لفکە.
چاکەتەکەت لەبەر ئەکەم
کلاّوەکەت لەسەر ئەکەم
عەینەکەکەت لەچاو ئەکەم
ئەچمە بەردەم ئاوێنەکە
بەپاندانەکەیش لاسایی
خەت و ئیمزات ئەکەمەوە
بەتەزبیحیش دەنکە یادوو

دەنكە مەراقم ئەژمێرم

ئینجا ئەچم لە تەنیشت قەفەزەکەوە

هەڵ ئەتروشکێم..

لەبەر چاوم وردە وردە قەفەزەکەت گەورە ئەبێ

واهەست ئەکەم منیش پەڕوباڵ دەر ئەکەم

ئیتر ئەبم بەماکەوێکی رەشپۆشی خاڵ لەمل و

دەرکی قەفەز ئەکەمەوە و

ئەچمە ناوی و

بەزایەڵە و فوغانەوە

بۆت ئەخوێنم!

لە شەوانی بەفران باردا. خۆشەویستم سپی سپی ئەچێتەوە

لەشەوانی بەفرانباردا. لە ناوماڵێکی سپیدا گوڵێکم ڕەش

لەدارستانێکی سپیدا ئاسکێکم ڕەش. لەشەوانی بەفرانبارا

وەکوو کولوو بەبێ خشپە دێیتەوە لام، دێیتە ژووری

هێشتا قژو ڕیش و سمێڵو چەکەکەت، هەردوو شانت

سەر بەبەفری نواو تازەن، دەستت تەزیو. پەڕەی

گوێچکەت سوور هەڵگەڕاو، هالاَو لەدەمت هەڵ ئەسێ و

جەستەت کەمێ هەڵئەلەرزێ و کلووەکان ئەبن بەئاوو

بەچزەوە ئەتکێنە سەر تاقە زۆپاو پێ ئەکەنێ و لەپاش

تۆزێ دەم و چاوت بەتەواوی دەر ئەکەوێ. دائەنیشین،

پاڵ ئەکەوین. هەگبەی تەڕت ئەکەیتەوە، هەورییەك و

جووتێ پانی بەرزی ڕەنگاوڕەنگی لێ دەردێنی، لەو بەرەوە

PDF 4 KURD

هەڵی ئەدەیتە کۆشمەوەو ئەڵێی:

ئەمجارەیان دیاریەکەمان سەقزییە

لەشەوانی هاویناندا وەختێ کەمانگ هەتا سەرشانی گردەکەی

بەرامبەرم دائەبەزێ. ناو بەناوێ کزەبایێ دێت و بۆنی

گوڵە عەتری زەرد و مێخەك لەگەڵ هەناسەی فێنکی خۆیدا

دێنێ. ژنی گەڕەگ ئەچنە دەرێ. لەبەر دەرگای حەوشەی

ماڵدا دائەنیشن. بنێشت ئەجوون و شەماڵە ئەگرنەوە

کیژەکانیش پرچی یەکتر ئەهۆننەوە. من ئەزانم تۆ بە شەوی

ئاوا ڕووناك و لەبەرچاو نایەیتەوە. من هەر لێرەم

لەقەفەزدا و ماکەوێکم تاق و تەنیا و ناچمە دەرێ

هەموو جارێ بەیەکەوە مانگمان ئەدی

من بەبێ تۆ مانگ نابینم. بۆ ببینم؟!

چی پێ بڵێم؟!بۆچیم بوێ؟!

من ئەمشەو لە مانگ ئەترسم

دەم و چاو شووم،

ئەڵێی ژنە جادووگەرێکی نەخۆشی سیحر بازە...

من ئەمشەو ڕقم لەمانگە

ناچمە دەرێ!

بازی گیانم!

هەر لە دوای تۆ لەدوای کۆچی سوورو خێرات بە چەند مانگێ

لەگەڵ وەعدەی ئەوەڵێنی ماچ و موچی هەندێ گوڵی

زوو ڕسکاوی، تازە مەمك کردووی

ئەم خاکەدا،لەگەڵ وەعدەی یەکەم هەتاوی دەس گەرم و
تەشق شکاوی سەرمادا
هەر لە دوای تۆ بەچەند مانگێ
گەورە ترین بومەلەرزەی ئاودامانی ئەم مێژووە
ئەم نەخشەیە...هات و ڕوویدا
مەزنترین لافاوی خەڵك،سێلاوی سەر،
سێلاوی دەست و هاوار و گەردنی خەڵك
هات و ڕوویدا
بەسامترین ڕاپەڕینی خوێنی ئێمە
ڕاپەڕینی ئەسپی سووری بەژنی ئێمە
هات و ڕوویدا
ڕاپەڕینی چڕترین خەمی دیرۆکمان
ڕاپەڕینی بەرد بە بەرد و
دار بە داری ئەم کێوانە
ڕاپەڕینی بازووەکانی جادە و گەڕەك
ژن و منداڵ
ڕاپەڕینی خۆشەویستی
لافاوی قاچ،لێشاوی دەست،سێلاوی لەش
باهۆزی دەنگ
بومەلەرزەی کۆت و زنجیر
هات و ڕوویدا
وەك تەلیسمێ...وەك ئەفسانە

وەك خواوەندی ئازادی هات

بۆ یەکەم جار دەمی بەستراوی مێژوومان

کرایەوە و هەناسەی دا

ئاخ بازەکەم!

تۆ لە کوێ بووی؟!

لەدوا پەراوێزی یادداشتەکاندا ماکەوە ڕەشپۆشەکە

بەخەتێکی درشت نووسیبووی:

(دوای ئازادیش ڕۆژ هات و ڕۆی. پاك هات و

پیس هات و بەڵام پیس هەر نەڕۆی. ڕوون هات و

لێڵ هات و بەڵام لێڵ هەر ڕوون نەبۆوە. چەقۆ هات و

قوربانی هات و کەچی چەقۆ تیژتر بۆوە. بای سپی هات و

بای بۆر هات و بەڵام بای بۆر هەر گڤە گڤی بوو. ئاوی

سەوز هات و ئاوی رەش هات و کەچی ئاوی ڕەش

هەر نەڕۆشت و هەر پەنگی خواردەوە. ئاسمان هات و قەفەز

هات و کەسێ نەهات بەلامەوە و من و برسێتی و

تەنیایی و ئەم قەفەزە هەرماینەوە)

ئێستە ڕوحم قاقڕێکەو خۆڵی سووری تیا ئەبارێ. خۆڵێکی ورد

کەتیرەیی، بینین کوژو بەهێواشی ئەنیشێتە سەر تەنیایی و

قەفەزەکەم، سەر برسێتی و سکی خاڵیم، ئەملکێنێ بە

غوربەتێکی تازەوە، غوربەتی من لەناو شایی ئازادیدا

غوربەتی خوێنی بازەکەم، نامۆیی خوێنی بازەکەم بەهاوڕێ و

مەقەڕی خۆی. غوربەتی مافێکی برسی و ماکەوێکی بێ

PDF 4 KURD

دان و ئاو. ماکەوێکی بێوەژنی تەنیاو ڕەشپۆش.
ماکەوی ژنە بازێکی لەبیر کراو!
" ئاگادارییەك لەماکەوە ڕەشپۆشەکانەوە"
(ئەگەر لە ترسی گەڕانەوەی ئەرژەنگی دێو نەبوایە
ئەگەر لە ترسی گەڕانەوەی دۆڵپای تاعوونی بەغدا نەبوایە
ئێمەی ماکەوە ڕەشپۆشە برسیەکانی ئەم قەڵەم ڕەوە
هاوسەرو خوشك و دایکی و بازە پەڕ و باڵ خوێناوییەکان
بەدەنووك و بەدەنووك و بەدەنووك
سەدان چاومان هەڵ ئەکۆڵی و ئەشمان خواردن!)
بازەکەی من!
ئیستە ڕۆحم قاقرێکەو خۆڵی سووری تیا ئەبارێ
تۆزێکی وورد. کەتیرەیی. ئەملکێنێ بە غوربەتێکی تازەوە
بەتوتڕکی هەزار پرسیاری تازەوە..
" ئەترسم..ئەترسم..ئەترسم
لەم خۆڵە سورە ئەترسم
لە پشت ئەم خۆڵە سورەوە چیتر هەیە؟!
کێ لەخوێن ئەکۆڵێتەوە؟!
کێ دادگایی من ئەکات؟!
کێ سەر لەم قەفەزانە ئەدات؟!
گوڵە ڕەشەکان چۆن ئەژین؟!
گوڵە ڕەشەکان چۆن ئەمرن؟!
ئەم دەرگای سەر برینانە

**کێ لەم دەرگایانە ئەدات؟!**

**ئەم هێلانەی بازو دالآنە چۆن تێکەڵ**

**بەیەکتر بوون؟!**

**ئەترسم. ئەترسم، ئەترسم**

**لەم خۆڵە سورە ئەترسم**

**ئەم چەقۆیانە چۆن هاتنە**

**ناو بەرۆکی سپیمەوە؟!**

**ئەو گوڵکوژانە چۆن ئێستا**

**لەگەڵ گوڵدا هەڵ ئەپەڕن؟!**

**ئەم دزانە بە کوێدا هاتنە ژوورەوە؟**

**چۆن گەیشتنە سەر چرپاکەم؟**

**ئەو ئەسپانەیان چۆن خەساند؟**

**ئەو کێوە زلە چۆن دزرا؟**

**چۆن؟ چۆن؟ چۆن؟"**

**من بازەکەم گوڵکۆیەکی دیاری نییە**

**لەسینەم و ئەو گوڵجارانە بەولاوە**

**کە مێرگی سوور**

**کە دەشتی سوور ئەنووسنەوە**

**من بازەکەم گوڵکۆیەکی دیاری نییە**

**هەتا منیش وەك ژنە هەوری ئەم شارە**

**هەوری ڕەشپۆش**

**هەمووی ڕۆژانێکی هەینی**

خەمەکانم کۆکەمەوە و
بچم بەسەریا ببارێم
من دار هەنارێکم هەیە تەنیا
تەنیا و تەریك
هەر خۆی و خۆی
واله باکوری ئەم شارە
هەموو ڕۆژانێکی شەممە
هەر خۆم و خۆم
ئەچم بۆلای، منیش وەك ئەو
هەر بەپێوە ڕائەوەستم، هەتا بوولێڵ
چاو ئەبڕمە قەدوبالاَی، ماچی ئەکەم
دەستی ساردم ئەخەمە سەر شانەکانی و
هەڵ ئەلەرزێم وەکوو گەلاَی
یەکەم جار بوو
ئەم دار هەنارە تەنیایە
ئەم هاوڕێ گۆشە گیرە
لە شەمەیەکی زیوینی بەر باراندا
لەسەر قەدی، لەسەر سنگی
لەسەر دەستی
شیعری یەکەمین ژوانی
من و بازەکەمی نووسی!..
هەموو ڕۆژانێکی شەممە ئەچم بۆلای



PDF 4 KURD

PDF 4 KURD

منیش وەك ئەو هەر بەپێوە ڕائەوەستم
هەتا بوولێڵ
ئەوسا ئیتر وەکوو خەمێکی قژ درێژ
وەك ماکەوێکی ڕەشپۆشی
تەنیا و بێزار
دائەگەڕێم و ئەچمەوە
بۆ ناو قەفەزی ژوورێکی
دامێنی شار!

PDF 4 KURD

# ناوەڕۆك

PDF 4 KURD